# دۆزەخی ژێردەسیی

« ڕەخنە و کۆلینەوە »

حوسێن محەمەد عەزیز

2706ک/ 2006ز

بۆ هەموو ئەو نووسەرە ڕاستەقینە خاوەن هەڵوێستانەی، خۆیان و پێنووسەکانیان، بە هەرزان نافرۆشن، لە هەموو ڕووداوێکی نەتەوەیی، رامیاریی و کۆمەڵایەتیی نەتەوەکەیاندا، دەنگ و ڕەنگی تایبەتیی خۆیان هەیە، لە ئاستی ڕاستیی و ڕەوادا، خۆیان کەڕ ناکەن و « شا » بە « گەدا » نازانن!
بۆ هەموو ئەو مرۆڤە ئابڕوومەند و سەربەرزانەی، چڵکاوی نۆکەریی ناخۆنەوە، دژی ئاغاکانیان دەوەستن، تاڵاوی دۆزەخی ژێردەسیی نانۆشن، لە پێناوی ئازادیی ڕاستەقینە و ژیانێکی پڕ لە شکۆمەندانەدا دەکۆشن!

# ـ نـــــاوەڕۆک ـ

# پێشـــــەکیی

دوای ئەوەی، بەشی هەرە زۆری گوتارەکانی خۆم، لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی دەرەوە و نێوەوەی وولات کۆکردەوە، لە نێوان سالەکانی « 2003 - 2005 » و لە چەن پەرتووکێکی وەک: « شەکرە شارەکەم سولەیمانیی، حەوت گوتاری قەدەغەکراو، ئێمە بۆ واین؟، برایەتی درۆزنانە، کورد و کێشەی کەرکووک »دا چاپ و بلاوکردەوە. ئەوا ئەورۆش، لەم بەرهەمە نوێیەدا، بەشێکی دیکەی گوتارە نوێکانی سالی « 2004 - 2005 » بلاودەکەمەوە. بەو هیوایەی، سالی ئاییندەش بتوانم، بەشەکانی دیکەی، لە دووتوێی بەرگێکی جوان و ڕازاوەتردا، پێشکەش بە خوێندەوارانی هێژای نەتەوەکەم بکەم.

لێرەدا دەمەوێ، ئەوەش بلێم: جگە لەوەی، هێندێ لەم گوتارانە، لە لاپەڕەکانی دیکەی « ئینتەرنێت » و هێندێ ڕۆژنامەی وەک: « هاوبیر، نێوەند، ڕزگاریی، ئالای ئازادیی ... »، لە « کوردستان » بلاوکراونەتەوە، لە هەمان کاتیشدا، هەموو ئەم گوتارانەم، لە گۆشـــــەی « کولبژێر » و لە لاپەڕەی ئەلیکترۆنیی « **Kurdistanpost** »دا، هەفتانە، بە شێوەیەکی بەردەوام و ڕێکوپێک بلاوکردۆتەوە. بەلام، لە لایەکەوە، مەرج نییە، ڕۆلەکانی نەتەوەکەم، هەموویان « ئینتەرنێت »یان هەبێ و خوێندبێتیانەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، بۆ ئەوەی، گوتارەکانم لەنێو نەچن و بیانپارێزم، زۆر بە پێویستم زانی، لە دووتوێی ئەم پەرتووکەدا چاپیانکەم و وەک هێلکەیەکی پاکراو، لە بەردەمی خوێندەوارانی کورددا دایاننێم.

لەم پەرتووکە نوێیەدا، گوتارەکانم، بەپێی بابەتەکان و نزیکییان لە یەکدییەوە، پاش و پێش خستوون و ڕیزیمکردوون، نەک بەپێی ئەو زنجیرە گوتارە بێ، کە کاتی خۆی، لە لاپەڕەی « **Kurdistanpost** »دا بڵاوکراونەتەوە.
ئەم بەرهەمە نوێیە، لە « **27** » گوتاری گەورە و گچکەی جیاجیای « نەتەوەیی، ڕامیاریی و کۆمەڵایەتیی » پێکهاتووە. بە شێوەیەکی گشتیی، لە ڕەوشی ئێستەی ڕامیاریی « باشووری کوردستان » دەدوێ، زۆر بە ڕاشکاویی، قامکم لە سەر گرفتەکانی کورد داناوە و چارەسەری گونجاویشم، بۆ هێندێکیان پێشنیازکردووە.
هەر وەک لە پێشەکیی بەرهەمی « کورد و کێشەی کەرکووک »دا نووسیبووم، لێرەشدا دووپارەیدەکەمەوە و دەڵێم: هەرچەندە، ئەمانە بیروباوەڕی تایبەتیی خۆمن و ئەز وەک ناسیۆنالیستێکی دیمۆکراسیخوازی کورد، زۆر بە ڕاشکاویی، بیروباوەڕی خۆم، سەبارەت بە ڕەوشی ڕامیاریی، دید و بۆچوونی سەرانی کورد دەربڕیوە. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو کوردێکی دڵسۆزی نیشتمانپەروەر بۆی هەیە، باری سەرنجی تایبەتیی خۆی دەربڕێ، ڕەخنە لە بیروباوەڕەکانم بگرێ، گەر لە هەر ڕوویەکەوە، هەڵەیەکم هەبێ، بۆم ڕاستکاتەوە و ڕێی ڕاستم پیشاندا، زۆرم پێ خۆشدەبێ و لە ناخی دڵەوە سوپاسیدەکەم!
خوێنەرانی هێژا!
هیوادارم، ئەم کۆمەڵە گوتارە، بە وردیی بخوێننەوە و زۆر بە ڕاشکاویی، باری سەرنجی خۆتان، بەرانبەریان دەربڕن، تا، بە هەموو لایەکمان بتوانین، لە لایەکەوە، بە شێوەیەکی باشتر و ڕاشکاوانەتر، بابەتەکان تاوتوێکەین و هەڵیانسەنگێنین. لە لایەکی دیکەشەوە، ڕاژەی ووشەی پیرۆزی کوردیی، زمانی شیرینی دایک و ئەم نەتەوە بندەستە هەژارە بکەین. هەڵبەتە، مەبەستی هەموو لایەکیشمان، جگە لە دڵسۆزیی و ئەمەک نەبێ، هیچی دیکە نییە و سەرکەوتنیش، بۆ هەموو لایەک دەخوازم.

**دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز**
**ستۆکهۆڵم**
**2005. 05. 05**

# ناکۆکیی، دووبەرەکیی و ناپاکیی

لەوانەیە، مێژووی هیچ نەتەوەیەک، هێندەی مێژووی کورد، ناکۆکیی، دووبەرەکیی و ناپاکیی تێدا نەبووبێ! هێندە سەرکردەی ناڕێک، ناتەبا و ناپاکی تێدا هەڵ نەکەوتبێ! لە مێژووی هیچ گەل و نەتەوەیەکی ئەم جیهانەدا، ڕووی نەدابێ، یا، من نەمبیستبێ و لە لاپەڕەکانی مێژوودا نەمخوێندبێتەوە، سەرکردەی هیچ نەتەوەیەک، هێندەی سەرکردەکانی کورد، لەشکری بیانیی و داگیرکەریان، بۆ سەر نەیارە هاوڕەمانەکانی خۆیان هێنابێ! یا، شانازییان بە سوپای داگیرکەری نیشتمانەکەیانەوە کردبێ! ئەم دەردە کوردە، ئەم ناسۆر و کارەساتە نەتەوەییە، چۆن بووە و کەی ڕوویداوە؟

گەر زۆر بە قووڵیی، بە ناخی مێژووی کورددا شۆڕ نەبمەوە، تەنیا هەر، دوو نموونەی زیندوو، لە کانیاوی لێڵی مێژووی نزیکماندا هەڵهێنجم، ئەوا دەڵێم: هەر دوو سەردەمی میرنشینی « بابان » و شۆڕشی ساڵەکانی سەدەی پێشووی « بارزانیی ـ تاڵەبانیی »، بایی هێندە دەکا، وەک ئاوێنەیەکی باڵانمای نموونەی « ناکۆکیی، دووبەرەکیی و ناپاکیی »، پاشان، جەنگی نێوخۆ، پێشکەش بە ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردی بکەم، تا، قەد و باڵای سەرکردەکانی خۆیانی، بە جوانیی تێدا ببینن!*

## میرنشینی « بابان »

پێش هەموو شتێ دەمەوێ، ئەوە بڵێم: میرەکانی « بابان »، بەر لەوەی شاری « سولەیمانیی » درووستکەن و ئاوەدانیکەنەوە، لە هەر کوێیەکی دیکەی « باشووری کوردستان » هەبووبن و فرمانڕەواییانکردبێ، ئەز لێرەدا نامەوێ، باسی ئەو مێژووە دوور و درێژە بکەم، بەڵکوو، تەنیا هەر، لە ماوەی فرمانڕەواییکردنی نێو شاری « سولەیمانیی »یان دەدوێم. چونکە، ئەوە خۆی لە خۆیدا، کاکڵی باسەکەمان دەستنیشاندەکا و میرنشینەکەش، هەر لەو شارە ڕوخاوە و کۆتاییپێهاتووە!

هەروەها نامەوێ، باسی هەموو ناکۆکیی، دووبەرەکیی، ناپاکیی و جەنگە نێوخۆییەکانی نێوان میرەکانی « بابان » و میرەکانی دیکەی میرنشینەکانی وەک: « ئەردەلان، سۆران ... » بکەم. بەڵکوو، تەنیا هەر، تیشکێکی کەم، ئاراستەی هەموو ئەو ناکۆکیی، دووبەرەکیی، ناپاکیی و جەنگە نێوخۆییانەی، نێوان میرەکانی « بابان » خۆیان دەکەم!

میرەکانی « بابان »، لە شاری « سولەیمانیی » فرمانڕەوایی میرنشینەکەیان کردووە. شێوەیە لە شێوەکانی سەربەخۆیی نێوخۆییان هەبووە. دەتوانم، بە زاراوەی ڕامیاریی ئەوڕۆ بڵێم: « ئۆتۆنۆمیی »یەکی تایبەتییان هەبووە. چونکە، هێندێ جار، لە سەربەخۆیی نزیکبوونەتەوە.

میرەکان، بەپێی مێژووی فرمانڕەواییان ئەمانە بوون:

**1/ برایم پاشای بابان « 1800-1783 » :**

کوڕی « ئەحمەد پاشای خالید پاشای بابان » بووە. لەگەڵ والی « بەغدا »، نێوانیان زۆر باش نەبووە. لەبەرئەوە، دوو جار، لە فرمانڕەوایی لای بردووە. یەکەمین جار: « عوسمان پاشای مەحموود پاشا »ی ئامۆزای لە شوێن داناوە. پاشان، والی « بەغدا »، ژاری دەرخواردداوە و کوشتوویەتی. ئینجا، « برایم پاشا »ی داناوەتەوە. دووەمین جار: لای بردۆتەوە و ساڵی « 1789 »، « ئەوڕەحمان بەگی مەحموود پاشا » و برای « عوسمان پاشا »ی داناوە، تا ساڵی « 1798 » فرمانڕەواییکردووە. دواتریش، « برایم پاشا »ی لە شوێن داناوەتەوە. ئەویش، کاتێ بەرەو « سولەیمانیی » گەڕاوەتەوە، لە ڕێ و لە نزیک شاری « مووسڵ » مردووە. هەر لەوێ، لە تەنیشت مەزارگەی « یونس » پەیامبەرەوە نێژراوە.

**2/ ئەوڕەحمان پاشای بابان « 1813-1789 » :**

کوڕی « مەحموود پاشای خالید پاشا » بووە و بە ڕەچەڵەک، دەچێتەوە سەر « فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە ». ئەم میرە، « بەهێزترین، ئازاترین، وریاترین و

دووربینترین « میری « بابان » بووە. تەنانەت، هێندە بەهێزبووە، لە سەردەمێکدا، پەلاماری شاری « بەغدا »ی داوە و داگیریکردووە. والییەکانی « بەغدا »، گێچەڵیان زۆر پێ کردووە. لەبەرئەوە، گەلێ جار لابراوە و دانراوەتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، لە سەر دەسەلات، لەگەڵ خزمەکانی خۆیدا ناکۆکبووە، خوێنێکی زۆر لە نێوانیاندا رژاوە. چەندین جار ڕاونراوە، دیسانەوە گەڕاوەتەوە و هەستاوەتەوە. تا، سالی « **1813** » مردووە و لە مزگەوتی گەورە نێژراوە. پانۆڕامای ناکۆکیی و جەنگەکانی، لەگەڵ میرەکانی دیکەی « بابان »، بەم شێوەیە بووە:

**1**. سالی « **1805** »، والی « بەغدا »، یارمەتیی « خالید بەگی برای برایم پاشا » و ئامۆزای خۆی داوە. لە « دەربەندی بازیان »، پەلاماری یەکیان داوە و شکاندوویەتی. دوایی، « ئەورەحمان پاشا » پەنای بۆ بەر « ئێران » بردووە.

**2**. سالی « **1806** »، شای « ئێران »، یارمەتیی « ئەورەحمان پاشا »ی داوە، « خالید پاشا »ی لابردووە و ئەوی داناوەتەوە.

**3**. سالی « **1808** » بۆ دووەمین جار، لەگەڵ « خالید پاشا »، لە « دەربەندی بازیان »، بە یارمەتیی والی « بەغدا »، پەلاماری یەکدیان داوەتەوە. « خالید پاشا » شکاوە و هەڵاتووە.

**4**. سالی « **1812** »، لە شارۆچکەی « کفریی »، پەلاماری یەکیان داوەتەوە. والی « بەغدا »، یارمەتیی « خالید پاشا »ی داوە. ئینجا « ئەورەحمان پاشا » شکاوە و ئەو دانراوەتەوە.

**5**. جارێکی دیکە، « خالید پاشا »، بە فرمانی دەوڵەتی « ئێران » لابراوە و « ئەورەحمان پاشا » دانراوەتەوە. پاشان « ئەورەحمان پاشا »، لە سەر قسەی والی « بەغدا » لابراوە و « خالید پاشا » دانراوەتەوە.

**3/** مەحموود پاشای بابان « **1834-1813** » :

کوڕە گەورەی « ئەورەحمان پاشا » بووە. دە جار، لەگەڵ خزم و کەسوکارەکانیدا، پەلاماری یەکدیان داوە. پاشان دوورخراوەتەوە و گەڕاوەتەوە. پەلاماردانەکانیشیان، بەم شێوەیە بووە:

**1**. لە سەردەمی « سەعید پاشا »ی والی « بەغدا »دا، « مەحموود پاشا » لە کار خراوە و « عەبدوڵڵا پاشا »ی مامی دانراوە. پاشان، « داود پاشا » هاتووە و « مەحموود پاشا »ی داناوەتەوە.

**2**. « داود پاشا »ی والی « بەغدا »، « مەحموود پاشا »ی لابردووە و « حەسەن بەگ »ی برای لە جێ داناوە. ئەویش بێ سڵەمینەوە، پەنای بۆ « ئێران » بردووە و لەشکریان بۆ ڕێکخستووە. لەبەرئەوە، « عەبدوڵڵا پاشا »ش لەشکری

« بەغدا »ی هێناوە و لە « کەرکووک »، شەڕ لە نێوانیاندا گەرمبووە. لە ئەنجامدا، « مەحموود پاشا » سەرکەوتووە و بەرەو « سولەیمانیی » گەڕاوەتەوە.

3. « ئێران »، هێزێکی بۆ « عەبدوڵڵا پاشا » کۆکردۆتەوە، والی « بەغدا »ش، لەشکرێکی بۆ یارمەتیی « مەحموود پاشا » ناردووە. هەر دوو لەشکر، لە گووندی « قەرەگۆل » لە یەکیان داوە. « مەحموود پاشا » شکاوە و هەڵاتووە. « عەبدوڵڵا پاشا » لە شوێنی دانراوەتەوە. پاشان، « مەحموود پاشا » بە یارمەتیی والی « دیاربەکر » و « داود پاشا »، لە چیای « سەگرمە »، لە ساڵی « 1822 »دا، بە سەر « عەبدوڵڵا پاشا »دا سەرکەوتووە و گەڕاوەتەوە بۆ نێو شاری « سولەیمانیی ».

4. کاتێ نەخۆشیی ڕشانەوە، لە نێو شاری « سولەیمانیی »دا بڵاوبۆتەوە، « عەبدوڵڵا پاشا » بە هەلی زانیوە و لەکیس خۆی نەداوە، سوپای « ئێران »ی هێناوە و شارەکەی داگیرکردۆتەوە. « مەحموود پاشا »، بە ناچاریی هەڵاتووە بۆ « کەرکووک ». ئەم جارە، داوای یارمەتیی لە « ئێران » کردووە. ئەوانیش، لەشکرێکی گەورەیان داوەتێ، لە ساڵی « 1823 »دا، « عەبدوڵڵا پاشا »ی شکاندووە و دەسی بە سەر کاری فرمانڕەوایی میرنشینەکەدا گرتۆتەوە.

5. « محەمەد پاشای خالید پاشا »، بە یارمەتیی « داود پاشا »ی والی « بەغدا »، « مەحموود پاشا »ی مامی، لە شاری « سولەیمانیی » دەرپەڕاندووە و ڕاوێناوە بۆ « پێنجوین ». لەوێ، « مەحموود پاشا » داوای یارمەتیی لە « ئێران » کردووە. ئەویش، بە هۆی لەشکری « ئێران »ەوە، جارێکی دیکە، « محەمەد پاشا »ی برازای دەرکردووە و لە « 1825 »دا، بەرەو « سولەیمانیی » گەڕاوەتەوە.

6. « سولەیمان بەگی برای مەحموود پاشا » لە ژێرەوە، لەگەڵ چەکدارەکانیدا ڕێککەوتووە، کۆدەتایەکی بە سەردا کردووە و لە سەر کورسییەکەی کاکی دانیشتووە. « مەحموود پاشا »ش، بە پشتیوانیی « ئێران »، پەلاماری شاری « سولەیمانیی » داوە و تۆڵەی خۆی لێ سەندۆتەوە. « سولەیمان »ی براشی، پەنای بۆ « کڵەزەردە » بردووە.

7. « سولەیمان بەگ »، وازی نەهێناوە. جارێکی دیکەش، بە هۆی سوپاکەی کاکییەوە، « مەحموود پاشا »ی ڕاوناوەتەوە بۆ « ئێران ». پاشان ئەویش، بە یارمەتیی « ئێران »، شاری « سولەیمانیی » داگیرکردۆتەوە.

8. « سولەیمان بەگ »، داوای یارمەتیی لە والی « بەغدا » کردووە. هەر دوو لەشکر دیسانەوە، لە گوندی « قەرەگۆل »، لووتیان بە لووتی یەکدیدا

تەقیوەتەوە. « مەحموود پاشا » شکاوە و پەنای بۆ بەر « ئێران » بردووە. پاشان، سوپای « ئێران »ی هێناوە و لە « 1830 »دا، شاری « سولەیمانیی » گرتۆتەوە. ئیدی، « سولەیمان بەگ »یش، تا لای والی « بەغدا » نەوەستاوە!

9. « سولەیمان بەگ »، بە یارمەتیی لەشکری « بەغدا »، « مەحموود پاشا »ی لە « سولەیمانیی » دەرپەڕاندووە. ئەویش ناچاربووە، ڕوو لە « ئێران » بکا. ئەوانیش، لەشکرێکیان بۆ ڕێکخستووە و لە « ناوپارێز » بەیەکگەیشتوون. لە ئەنجامدا، « مەحموود پاشا » بە سەریدا سەرکەوتووە و لە « 1831 »یشدا، قەڵای شاری « سولەیمانیی » گرداوەتەوە.

10. « سولەیمان بەگ »، لە شارۆچکەی « کفریی »یەوە، لەشکرێکی گەورەی هێناوە و « مەحموود پاشا »ی لە « سولەیمانیی » دەرکردووە. « مەحموود پاشا »ش هیچی پێ نەکراوە، ناچاربووە، ساڵی « 1831 »، سەری خۆی هەڵگرێ و ڕوو لە شاری « ئەستانە » بکا. ساڵی « 1835 » گەیشتۆتە ئەوێ و لێی دانیشتووە.

4/ سولەیمان پاشا « 1838-1829 » :

کوڕی « ئەوڕەحمان پاشا » و برای « مەحموود پاشا » بووە. لە سەردەمی ئەمدا، ململانێی دەسەڵات کزتربووە. چونکە، کەسێ نەبووە، نژایەتییبکا. ساڵی « 1838 » مردووە و لە گردی « سەیوان » نێژراوە.

5/ ئەحمەد پاشای بابان « 1850-1838 » :

کوڕە گەورەی « سولەیمان پاشا » بووە. پیاوێکی زۆر ئازا، زیرەک و دادپەروەر بووە. دوا میری « بابان » بووە. لەگەڵ « ئێران »دا بە شەڕهاتووە. لەبەرئەوە، هەر دوو ئیمپراتۆریای « ئێران » و « عوسمانیی » ڕێککەوتوون، بۆ ئەوەی لەنێوبەرن. پاشان گرتوویانە و دووریانخستۆتەوە بۆ « ئەستانە ».

ساڵی « 1851 »، لەشکری « عوسمانیی »، پەلاماری شاری « سولەیمانیی » داوە. « عەزیز بەگ »ی دوا میری « بابان »، بە خۆی و لەشکرێکی کەمەوە، داکۆکییان لە شارەکە کردووە. بەڵام، هیچیان پێ نەکراوە، بێ کەڵکبووە و کارلەکار ترازاوە. « عەزیز بەگ »، شەهیدکراوە و لەشکری « عوسمانیی »ش، شارەکەیان داگیرکردووە.

پاشان « عەبدوڵڵا پاشای برای ئەحمەد پاشا »، بە قایمقامی « سولەیمانیی » دانراوە. پاش ماوەیە، ئەویشیان لابردووە و « سمایل پاشای توورک »یان، لە جێی داناوە و هەموو پیاوە ناودارەکانی « بابان »یشیان، بۆ « توورکیا » دوورخستۆتەوە. ئیدی، بەو شێوەیە و بۆ تاهەتایە، کۆتایی بە دەسەڵاتی میرنشینی « بابان » هاتووە. دوای ئەوەی، « 67 » ساڵی ڕێک، لە نێو شاری

« سولەیمانیی » و دەورویەرەکەیدا، فرمانڕەواییانکردووە. مەگەر، هەر هۆنەرێکی وەک « سالم » توانیبێتی، لەو چامە درێژەی بۆ « نالیی » ناردووە، لە لایەکەوە، باسی ئازایەتیی، قارەمانێتیی، پالەوانێتیی و مەردایەتیی میرێکی وەک « عەزیز بەگ » و هاوەڵەکانی کردبێ. لە لایەکی دیکەشەوە، زۆر بە ڕاشکاویی، پەردەی لە رووی خۆفرۆش، چلکاوخۆر و نۆکەرەکانی ئیمپراتۆریای توورکە « عوسمانیی »یەکان هەڵمالیبێ.

**ئەنجام :**

لە ڕاستییدا، گەر ئەمە، تراژیدیایەکی گەورەی نەتەوەیی نەبووبێ، گەر ئەمە، مێژووی پڕ لە شەرمەزاریی و خۆخۆریی میرەکانی « بابان » نەبووبێ، گەر ئەمە، وەک یاریی « مشک » و « پشیلە » وا نەبووبێ، ئیدی دەبێ، چی دیکە بووبێ و ناوی چی دیکەی لێ بنێین؟!!

سەیر ئەوەیە، هەر مێرێ لەو میرانە، میرە دژەکەی بەرانبەر خۆی تاوانبار کردووە، گوایە: بەکرێگیراوی « ئێران »، یا نۆکەری « بەغدا »یە! کەچیی، زۆری نەبردووە، هەر دوو لایان، چەن جارێ، وەک یاری دوو گۆڵیی، سەریان گۆڕیوەتەوە و هەمان گەمەی شەرمەزاریی یەکدیان دووبارەکردۆتەوە!

هەروەها، هەر کاتێ، ئەو میرانە لێیانقەومابێ و داوای یارمەتییان، لە یەکێ لەو دەوڵەتە داگیرکەرانە کردبێ، یەکسەر، بە دەم داواکارییەکانیانەوە چوون و بێ جیاوازیی، یارمەتیی هەموویانیان داوە، تەنیا هەر بۆ ئەوەی، کورد بە کورد بەکووشتبدەن و میرنشینەکەش لەنێوبەرن، بە تایبەتیی « ئێران »، زۆر مەبەستی بووە، هێمنیی، باڵ بە سەر میرنشینەکەدا نەکێشێ!

ئاخر، گەر پەندێ لە مێژووی فرمانڕەوایی میرنشینی « بابان » وەرگرین، گەر تەماشایەکی ئەزموونی دەسەڵاتی میرکانی بکەین، زۆر بە ڕوونیی، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، یەکەمین فاکتەری ڕوخاندنی میرنشینەکە، بۆ « ناکۆکیی، دووبەرەکیی، ناپاکیی و جەنگی نێوخۆ » دەگەڕێتەوە![1]

جا گەر میرەکانی « بابان »، کەمێ ژیربوونایە، بەرژەوەندیی تاکەکەسیی و چاوچنۆکیی دەسەڵات، بەری چاوی نەگرتنایە، تەنیاوتەنیا، هەر بیریان لە بەرژەوەندیی باڵای کورد و میرنشینەکەیان بکردایەتەوە، هەڵبەتە، نە میرنشینەکە دەڕوخا و لەنێودەچوو، نە میرەکانی « بابان » خۆشیان، تووشی ئەو هەموو دەردیسەریی، دەربەدەریی، ناخۆشیی و تێکشکانانە دەبوون![2]

ئاخر، گەر میرەکانی « بابان »، لە نێوخۆدا یەککگرتووبوونایە، لەگەڵ میری میرنشینەکانی دیکەی وەک « ئەردەڵان، سۆران، بادینان ... »، یا، لەگەڵ

سەرۆک تیرە و هۆزە گەورە و ئازاکانی « برادۆست، موکریی، مەنگوور، هەمەوەند، جاف ... » یەکیانبگرتایە، نەک هەر هێزەکانی سوپای توورک و لەشکری فارسەکان نەدەیانتوانی، لەنێویانبەرن و ئەو ڕەشەکوژییەیان لێ بکەن، بەڵکوو، بەهێزترین میرنشین، یا، دەوڵەتی کوردییشیان، لە نێوچەکەدا دادەمەزراند. بەڵام، نە هیچ لە ئەگەر و مەگەر شین دەبێ، نە تا ئەوڕۆش بە تەواویی، دەرمانێ بۆ ئەم دەردی « ناکۆکیی، دووبەرەکیی، ناپاکیی و جەنگی نێوخۆ »یەی کورد دۆزراوەتەوە!

ئەوەی لێرەدا زۆر گرنگە و دەبێ، هەمیشە لە یادمانبێ و پەندێکی مێژوویی گەلێ پڕ بایەخی لێ وەرگرین، ئەوەیە: بە هیچ جۆرێ نابێ، ئەو تراژیدیایەی میرەکانی « بابان » دووبارەکەینەوە. دەبێ، بە هەموو شێوەیە هەوڵبدەین، ڕیزەکانی نەتەوەی کورد یەکخەین و چی دیکە لەوە پتر، لەتوپەت و پچرپچر نەبێ! جا با بزانین، دوای ئەو ئەزموونە گرنگە، ئەو کارەمان ئەنجامداوە؟!!

## شۆڕشی « 11/سێپتێمبەر1961 »

هێشتا، هەمووی دوو سێ ساڵ، بە سەر پەرپاکردنی شۆڕشدا تێپەڕبووبوو، لەناکاو، دەنگی ناکۆکیی و دووبەرەکیی، لە نێوان سەرکردایەتیی « پارتی دیمۆکراتی کوردستان ـ عێراق » و سەرۆکەکەی « مستەفا بارزانیی »دا، گوێی هەموو کوردپەروەرێکی پڕکرد، هەموو گوند و شارێکی « باشووری کوردستان »ی گرتەوە. ئەوەبوو، ناکۆکیی و دووبەرەکییەکە، بە تەواویی قووڵبۆوە و تەقییەوە، تا وای لێهات، ماڵیان جیاکردەوە، سەنگەریان لە یەکدی گرت، دوژمنی سەرەکیی و بیانییان بیرچۆوە، هەر لایەکیان، ئەوی دیکەیانی، بە دوژمنی سەرەکیی خۆی دەزانی. پاشان، « پارتیی » بە سەرۆکایەتیی « بارزانیی »، لە ساڵی « 1966 »وە، ناچاربوو، پاڵ بە پاڵی « ئێران »ەوە بدا، چەک و تەقەمەنیی لێ وەرگرێ، هێندێ جاریش، شارەزای ئەرتەش و چریکیشی لێ بخوازێ! لاکەی دیکەشیان، کە ناوی بە باڵەکەی « م. س » ڕۆیشتبوو، بە سەرکردایەتیی « برایم ئەحمەد ـ جەلال تالەبانیی »، هەر لەو ساڵەوە، تا ساڵی « 1970 »، لەگەڵ میرییە یەک لە دوا یەکەکانی « عێراق » ڕێککەوتن، شانبەشانی سوپای « عێراق » هەوڵیاندەدا، هێزی پێشمەرگەی « کوردستان » لەنێوبەرن! هەرچەندە، هەر دوولایان، ناو و ناتۆرەی ناشرینیان لە یەکدی دەنا، بەڵام، لە لایەن کۆمەڵانی خەڵکەوە، باڵی یەکەم: بە « مەلایی » و باڵی دووەمیش: بە « جەلالیی » ناونران و هەر بەو ناوەشەوە، لە لاپەڕەکانی مێژووی هاوچەرخی کورددا تۆمارکران!

## شۆڕشی نوێی ساڵی « 1976 » :

هەر دوای ئەوەی، شــۆڕشی « 11/سێپتێمبەر » تێکشکا و هەرسپهێنا، هێندەی پێ نەچوو، گڕی ئاگری شۆڕشێکی نوێی بەرەنگاربوونەوە، لە چیا بەرزە سەرکەشەکانی « کوردستان »ەوە، کڵپەیسەند، شەوی تاریکونووتەکی ژێردەسیی، خاکی نیشتمانی ڕووناککردەوە!

بەڵام، هێندەی نەبرد، وەک دەردە کۆنەکەی کورد، ڕەگی گوولیی ناکۆکیی و دووبەرەکیی، لە گیانی سەرکردایەتیی هەموو پارتەکانی « باشووری کوردستان »دا لێیدایەوە. ئەم جارەیان، جگە لەوەی، دە ساڵی ڕێک، جەنگی نێوخۆ، لە نێوان هەمو لایەنەکاندا بەردەوامبوو، هەر لایەنێکیشیان بە جیا، وابەستەی دەوڵەتێکی داگیرکەری « کوردستان » بوون. جا با بزانین، تا چەن، کەڵکیان لە ئەزموونە خراپەکانی میرنشینی « بابان » وەرگرتووە و دووبارەیان نەکردۆتەوە؟!!

ـ لە ساڵی « 1979 » بە دواوە، سەرکردایەتیی « پارتیی »، بە ئاشکرا، پێش سوپای « پاسداران »ی « کۆماری ئیسلامیی ئێران » کەوتن و پەلاماری پێشمەرگەکانی « حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران »یان دا.

ـ لە ساڵی « 1992 »دا، هەر دوو سەرکردایەتیی « پارتیی » و « یەکێتیی »، بە ناوی « پەرلەمان »ەوە بڕیاریاندا، لە گریلاکانی « P.K.K. » بدەن، بڕیاری ژمارە یەکی « پەرلەمان » دەرچوو، خوێنی کوردی « باکوور »ی حەڵاڵکرد. ئەوەبوو، هێزی پێشمەرگەی هەر دوو پارت، شانبەشانی سوپای « تووركیا »، پەلاماری هێزی گریلاکانی « P.K.K. »یان دا، زیانێکی زۆریان بە کورد و قازانجێکی فرەشیان، بە دوژمنی داگیرکەر گەیاند!

ـ دوای ئەو مێژووە ڕەشەی، ئەو دوو پارتە و پەرلەمان، بۆ خۆیان تۆمارکرد، سەرکردایەتیی « پارتیی »، جارێکی دیکە، بە هاوکاریی هێزەکانی سوپای تـــوورک، ڕۆژی « 14 .05 .1997 »، پەلاماری هێزەکانی « P.K.K. »یـــان دایەوە!

ـــ لـە « 01 .05 .1994 »یشەوە، جەنگی نێوخۆ، لە نێوان هەر دوو پارتی هاوپەیمان و فرمانڕەوا « پارتیی » و « یەکێتیی »، لە سەر پارە و دەسەڵاتی ڕامیاریی، بە خراپترین شێوە گەرمبوو. کار بەوە شکایەوە، ســەرکردایەتیی « پارتیی »، پەنای بۆ بەر « ســەددام » و سوپای « عێراق » برد. بۆیە، ڕۆژی « 31 .08 .1996 » لە ماوەیەکی کەمدا، هێزەکانی « گاردی کۆماریی »، بە پشتیوانی تانک و تۆپێکی زۆرەوە، پەلاماری هێزەکانی « یەکێتیی »یان دا و لە شاری « هەولێر » دەریانپەڕاندن!

ـ مانگی « یولی 1996 »، به چاوساغیی هێزەکانی « یەکێتیی »، هێزێکی زۆری پاسداری « ئێران »، لە نزیک شارۆچکەی « کۆیە »، پەلاماری هێزەکانی « حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران »یان دا! و لە دوورەوە تۆپبارانیانکردن!
جا سەیر ئەوەیە، هیچ یەکێ لەو دوو پارت و سەرکردەیە، نەک هەر دژی سوپای « عێراق » نەبوون، بەڵکوو، بە چاوی رێزیشەوە، تەماشایانکردووە و بە سوپایەکی نیشتمانییان داناوە. تەنانەت « تاڵەبانیی »، لە رۆژی دامەزراندنی سوپادا « 1921. 01. 06 »، خۆی یادیکردۆتەوە و بە دەسی پیرۆزی خۆشی، گوتاری لە سەر ئازایەتیی و مەزنیی، سوپاکە نووسیوە، وەک ئەو سوپایە، بە میوانیی، سەردانی « کوردستان »ی کردبێ! یا، بۆ ناوبژیی نێوان هێزەکانی « پارتیی » و « یەکێتیی » هاتبێ! یا، بە هانای گەلی کوردەوە هاتبێ! ئەدی، دوای پتر لە بیست ساڵ شۆڕش و کوشتار، لە نێوان هێزەکانی گەلی کورد و سوپای داگیرکەری دەوڵەتی « عێراق »دا، لە گوتاری جێژنی « نەورۆز »ی « 1984 »، لە نێوچەی « سورداش » نەیگوت: ئێمە لە پشتەوە، خەنجەر لە سوپای « عێراق » نادەین! کەواتە، چی تێدا مایەوە؟!!
جا، هەر خوا بکا، « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، ئەم جارە، ئەو چارەنووسە ڕەشەی میرنشینی « بابان »یان لەبەرچاوبێ، نەبا، چارەنووسی هەر دوو میرنشینەکەی « بارزان » و « تاڵەبان »یش، لەوە خراپتربێ و گەلی کوردیش، لە « باشووری کوردستان »، تووشی کارەساتێکی دیکە بکەن، لە کارەساتی هەرەسی بەهاری ساڵی « 1975 »یش خراپتربێ!
ئاخر، لەوە دەچێ، سەرکردەی ئەم دوو پارتە، « بارزانیی » و « تاڵەبانیی » بە تایبەتیی، سەرکردایەتیی هەر دوو لا « پارتیی » و « یەکێتیی » بە گشتیی، نەک هەر، کەڵکیان لە ئەزموونی تاڵی « ناکۆکیی، دووبەرەکیی، ناپاکیی و جەنگی نێوخۆ »ی، نێوان میرەکانی « بابان » وەر نەگرتبێ، بەڵکوو، کەڵکیان لە ئەزموونی ناکۆکیی و دووبەرەکیی، ساڵانێکی دوورودرێژی نێوان خۆشیان وەر نەگرتووە!
سەیر ئەوەیە، دوای ئەو هەموو ئەزموونە گەورە مێژووییانە، دوای ئەو هەموو قوربانیی و تێکۆشانە مەزنانە، ئینجا، لە نێوان خۆیاندا، نارێک و ناتەبان، تا ئێستەش، بە تەواویی ئاشت نەبوونەتەوە و هەر خەریکی ئەوەن، ملی یەکدی بشکێنن! کەچیی، لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری، هێزە رامیاریی و رێکخراوە دێمۆکراسییە عەرەبەکانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا ئاشتبوونەتەوە، دیالۆگ دەکەن، زۆر رێک و تەباشن!

ئاخر ئەوان، « كوردستانیی »یانە بیرناكەنەوە، بەڵكوو، دوای تراویلكەی بیری گەندەڵی « عێراقچێتیی » كەوتوون؟!!

ئەوان، داوای پارێزگارییكردنی یەكێتی خاكی « عێراق » دەكەن، كەچیی، یەكێتی خاكی « باشووری كوردستان » ناپارێزن و نیشتمانەكەیان دوولەت كردووە!

ئەوان، داوای دەسەڵات و سەروەریی، بۆ دەوڵەتی داگیركەری « عێراق » دەكەن، كەچیی، بۆ « كوردستان »ەكەی خۆیانی ناكەن!

ئەوان، داوای دیموكراسیی بۆ گەلانی « عێراق » دەكەن، كەچیی، لە نێو گەلی كورد و لە « كوردستان »دا، خۆیان پیادەی ناكەن!

ئەوان، داوای هەڵبژاردنی پەرلەمان بۆ « عێراق » دەكەن، كەچیی، ئەوا دوازدە ساڵ، بە سەر یەكەمین هەڵبژاردنی پەرلەمانی « باشووری كوردستان »دا تێپەڕی، نیازیان نییە، هەڵبژاردنێكی نوێ بكەن! #

* * *

---

* لە مێژە، دەربارەی ئەم بابەتە، كۆڵینەوەیەكی درێژم بە دەستەوەیە، هەر لە « ماد »ەكانەوە دەسپێدەكا و بە سەردەمی ئەورۆمان تەواودەبێ. بەڵام، چاوەڕێی ئەم ئەزموونەی « باشووری كوردستان » دەكەم، تا بزانم، چی بەسەردێ و بەرەو كوێ دەڕوا؟!! بۆیە، تا ئێستە بڵاوم نەكردۆتەوە!

# ئەم گوتارە، زۆر پێش هەڵبژاردن نووسراوە! جگە لەوەی، لە هەڵبژاردنی ئەم جارەی پەرلەمان « 2005. 01. 30 » نەیانوێرا، بە جیا دابەزن و خۆیان بۆ دەزگەی پەرلەمانی « كوردستان » هەڵبژێرن، هەموو بەهایەكی دیموكراسیی و هەڵبژاردنیشیان پێشێلكرد، بە شێوەیە، كۆمەڵانی خەڵك، خۆزگەیان بە هەڵبژاردنی ساڵی « 1992 » دەخواست! ئەمە، گەر شتێ بسەلمێنێ، تەنیا هەر ئەوەیە، ساڵ بە ساڵ، لەبری ئەوەی بەرەو پێشەوە بڕۆین، بەرەو دواوە دێین! سەركردەكانی كورد، لەو هەموو تێكشكان و پەندە مێژووییانەوە، هیچ فێر نەبوون و نابن! كەڵك لە هەڵەكانی پێشووی خۆیان وەر ناگرن، بایەخێكی زۆر، بە گۆڕانكارییە گەورەكانی جیهان نادەن!

# « نەغەڵ[7] »

مانگی « مارسی **1974** »، لە زانکۆی « سولەیمانیی »، لە پۆلی سێی کۆلێژی « کشتوکاڵ » بووم. کۆرسی یەکەمم، زۆر بە سەرکەوتوویی بڕیبوو، سەرەتای دەسپێکی کۆرسی دووەممان بوو. بەڵام نەمتوانی، بەردەوامبم، چونکە، سەرکردایەتیی شۆڕشی « **11**/سێپتێمبەر »، لەگەڵ لێپرسراوانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » و سەرانی پارتی « بەعس »دا ڕێک نەکەوتن. لەبەرئەوە، جەنگ لە « کوردستان » دەسپێکردەوە.

لە ڕاستییدا، لە لایەکەوە، بە هیچ شێوەیە نەدەمتوانی، لە نێو شاردا بمێنمەوە و لە سەر خوێندنەکەی خۆم بەردەوامبم. چونکە، خوێندکارە « بەعسیی »یەعەرەبەکان، زۆر باش دەیانزانی، خەریکی چی بووم، لە چ ڕێکخراوێکی زۆر « بقە »دا کارمدەکرد و دژایەتییمدەکردن. لە لایەکی دیکەشەوە، هەر چەندە، « پارتیی » نەبووم، بەڵام، باوەڕێکی زۆر و پتەوم، بە سەرۆک « بارزانیی » هەبوو. لەبەرئەوە، منیش وەک کوردێکی نیشتمانپەروەر، خوێندن، ماڵ، دایک، باوک، خوشک، برا، گەڕەک و شارەکەم بەجێهێشت، وەک ئەو هەزاران کوردە مەردانەی، دژی داگیرکەری « بەعس » بوون، ملی ڕێی نێوچە ئازادکراوەکانی « باشووری کوردستان »م گرتەبەر و بەرەو چیا سەرکەشەکانی هەڵکشام.

ئەوەبوو، لە ئەنجامدا، لە بەتالیۆنی چواری هێزی « خەبات »، لای شەهید « نووریی حەمە عەلی » گیرسامەوە و وەک پێشمەرگەیەک وەرگیرام!

هەرچی چۆنێ بوو، ماوەی ساڵێ، پێشمەرگە بووم، بە هەر شێوەیە بووبێ، رامکێشا و دڵیشم زۆر خۆشبوو. چونکە، نە بیرم لە خوێندن و پاشەرۆژ دەکردەوە. نە هیچ ئامانجێکیشم هەبوو، لەو ئامانجە پیرۆزتربێ! لەبەرئەوە، هەرگیز لێی پەشیمان نیم و پەشیمانیش نابمەوە، لەوەی ساڵێ، چەکم بۆ گەلەکەم هەڵگرتووە، وەک هێندێ کورد، لێی پەشیمانن و داخی بۆ دەخۆن! لەگەڵ ئەوەشدا، هەرچەندە شۆڕشەکە، بە تراژیدیایەکی نەتەوەیی و رامیاریی کۆتاییهات، بەڵام، یەکێ لەو شتە گرنگ و خۆشانەی ژیانم، ئەو ساڵە بوو، کە پێشمەرگە بووم و تا ماویشم، زۆر شانازیی پێوە دەکەم.
وەک هەمووومان دەزانین، بە لەقەلەق، شۆڕشەکە ساڵی پڕکردبۆوە، بە داخێکی گەورە و گرانەوە، لە لایەن هێزەکانی نێوچەکە و ئیمپریالیزمی « ئەمێریکا »وە ئابلووقەدرا. لەبەرئەوە لەپڕ، شۆڕش تێکچوو، پێشمەرگە چەکی دانا، کەس بەرەنگاریی نەکرد و شۆڕشەکەش، وەک چیایەکی بەفرین هەرسیهێنا! ئەم جارەیان، بە ناچاریی، لە شاخەوە، بە تێکشکاویی و سەرشۆڕیی، بەرەو شار گەڕامەوە! ئیدی، فیلمە ناخۆشەکەی هەرەس، لێرەوە دەسپێدەکا. «1»
هەمووی چەن مانگێ بوو، شۆڕشی « 11/سێپتێمبەر »، شکستیهێنابوو، بەڵام، شۆڕش لە رووی سەربازییەوە، تێک نەشکابوو. چونکە، هێزی پێشمەرگە، هەر وەک خۆی، وورەی بەرز و ئازابوو. بەڵکوو، سەرکردایەتیی شۆڕش و « پارتیی »، لە رووی رامیاریی و مەڕاڵەوە تێکشکابوون. لەبەرئەوە، ئێمەیان بەجێهێشت، بە پێی پەتیی و سەری قووتیی، بەرەڵلای بەر دەسی دوژمنێکی دڕندەی فاشییان کردین، لە بەردەمی گورگی هاری چاوبرسیی « بەعس » و هێزەکانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا، بێ پشتوپەنا مابووینەوە و چاوەڕێی چارەنووسێکی ڕەشمان دەکرد!
بەڵێ، وەک ئەو هەزاران کوردەی ناچارکران، چەک دانێن و لە چیاکانەوە، بە رەنجەڕۆیی و دڵتەنگیی، بەرەو شارەکان بگەڕێنەوە، منیش ناچاربووم، چەک دانێم و لەگەڵ کۆمەڵێ برادەردا، رۆژی « 1975. 03. 26 »، لە شارۆچکەی « پێنجوین »ەوە، تا « سەییدسادق » بە تراکتۆر، پاشان لەوێشەوە، بە ترۆمبێل گەڕاینەوە.
دەبووایە، پێش ئەوەی، روو لە ماڵی خۆمان بکەین و بە کەسەکانمان شادبینەوە، یەکسەر بەرەو بەڕێوەبەرێتیی « ئەمن »ی « سولەیمانیی » بڕۆین، تا، ناومان بنووسن. منیش، چووم بۆ ئەوێ، تەماشادەکەم، خەڵکەکە هێندە زۆرە، هەمووی بە نۆرە وەستاون، تا، قسەیان لەگەڵ بکەن. تەنانەت، کارمەندەکان فریا نەدەکەوتن، کارەکان بە خێرایی راپەڕێنن، لەبەرئەوە،

خوێندکاره عەرەبەکانی « زانکۆ »شیان هێنابوو، تا یارمەتییانبدەن. بە ڕێککەوت، من بەر خوێندکارێکی عەرەبی « بەغدایی » هاوڕێی پۆلی خۆم کەوتم، یادی بە خێر، ناوی « کەمال عەنبەر » بوو. هەر کە منی بینی، باوەشی پێدا کردم، ماچیکردم، ڕێزێکی زۆری لێ گرتم و هەر زوو، کارەکانی بۆ راپەڕاندم. پاشان، نامەیەکی دامێ و گوتی: تەواو، بەیانی بڕۆرەوە، خەریکی خوێندنی خۆت بە! «2»
ئەوەبوو، وەک خوێندکارێکی « زانکۆ » گەڕامەوە و لە پۆلی سێ، دەسم بە خوێندن کردەوە. چونکە، لە کوێدا قرتابوو، هەر لەوێشدا گرتمدایەوە. بەڵام، یەک جیاوازیی هەبوو، ئەو خوێندکارانەی رایان نەکردبوو، پۆلێ پێش من کەوتبوون و بەجێیانهێشتبووم! لەبەرئەوە، لەگەڵ کۆمەڵێ خوێندکاری نوێدا تێهەڵچوومەوە!
ماوەی چەن هەفتەیەک، کەس لێی نەپرسیمەوە و هیچ جۆرە، ناخۆشیی و سووکایەتییپێکردنێکم نەدی. بەڵام، هەر هێندەم زانی، خوێندکاره عەرەبە « بەعسیی »یەکان، بە پۆل دابەزین و لە نێو خوێندکاره کوردە گەڕاوەکاندا بڵاوبوونەوە. پێوەندییان پێوە کردین و نیازیان وابوو، لە ڕیزەکانی خوێندکاران و پارتی « بەعس »دا ڕێکمانخەن.
بەڵێ، ئەو خوێندکاره کوردانەی، بێ باوەڕ، ترسنۆک، کوڕی ڕۆژبوون و دوای قەرەباڵغیی کەوتبوون، هەر زوو چۆکیاندادا، وازیان لە ئابڕووی نەتەوەیی خۆیان هێنا و پێیان بە وێژدانی خۆیاندا نا! ئەوانەشی، کەمێ خۆڕاگربوون، تا ئەو کاتەش، کێشەی گەل و نیشتمانەکەیان، لە بیر و هۆشیاندا بوو، خۆیان بۆ گوژمێکی دیکەی خەبات ئامادەکردبوو، خۆیان بە دەسەوە نەدا، پێیان بە بیروباوەڕی خۆیاندا نەنا، شەقێکیان لە ترس و بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان هەڵدا و بە سەربەرزیی مانەوە!
بە کورتیی و کوردیی: دوای ئەوەی، خوێندکاره عەرەبە « بەعسیی »یەکان، ماوەیە، لەگەڵ هێندێ لە خوێندکاره کوردەکان خەریکدەبوون و بۆیان نەدەکڕران، ئیدی، بە تەواویی بۆیان دەردەکەوت، لەوە پتر کەڵکی نییە، کاتی سەنگینی خۆیان، لەگەڵ ئەو پۆلە نیشتمانپەروەرانەدا، بە خۆڕایی بکوژن، دەیانزانی، هەموو مەلێ گۆشتی ناخورێ و ئەوانەی ماون، بۆیان ناکڕرێن، وازیان لێ دەهێنان!
ڕۆژێ، خوێندکارێکی عەرەبی لا یەخەیگرتم، ناوی « عەلی حوسێن » بوو. هات و پێی ڕاگەیاندم: گوایە، لە کۆمیتەی بەرزی « بەعس »ەوە ناردوویانە، قسەم لەگەڵ بکا، لە ڕیزەکانی پارت و خوێندکاراندا ڕێکمخا. ئیدی، لێم

نەبۆوە، تەنانەت لە « زانکۆ »ش، تێـرى لە چەنەبازیى نەخـوارد، بەڵکوو، دوامکەوت و لە « زانکۆ »وە بەرەوخـوار، بە جادەی گـەڕەکی « شـێخـان »دا، بنکەوە شـۆڕبـووینەوە، تا بـەر دەرکی سـەرا، هەر لە سـەر هەڵەوەڕیی خـۆی بەردەوامبوو. زۆر شتی بۆ باسکردم، گەلێ ڕاو و ڕێویی بۆ هێنامەوە، گەلێ گوێزی پووچی بۆ بژاردم، بەڵام، نە من هیچم لێ وەرگرت، نە ئەویش هیچی دەسکەوت! چونکە، ئەو هەرچییـەکی دەگـوت، ڕەتمدەکردەوە و دەمگوت: من هەرگیز، لە هیچ پارتێکدا کارم نەکردووە، حەزم لە کاری پارتایەتیی نەبووە و نییـە. کـاتێ لە دەرەوەش بووم، وەک ئەو هـەمـوو خـەڵکە، لە ترسی مـەرگ ڕامکردبوو. پاشان، کاتێ زانیم، میریی دەس لە کەس نادا، گەڕامەوە. باوەڕم بە هیچ جۆرە پارتایەتییەک نییە و خەباتی ڕامیاریی ناکەم. بەڵکوو، هـەموو ئامانجم ئەوەیە، خوێندنەکەم تەواوکەم و بە پلەیەکی باش دەرچم.
کاتێ، ئەم قـسانەم بۆ دەکرد، لە دڵی خۆمدا، گاڵتەم پێ دەهات. سووریش دەمزانی، ئەویش باوەڕم پێ ناکا. جا باشە، گەر خۆم، باوەڕ بە قسەکانی خۆم نەکەم، ئیدی، ئەو چۆن باوەڕم پێ دەکا؟!! ئاخر، ئەو نەگبەتە، لە نێو ئەو هەموو خوێندکارە کوردانەدا، کێی بەرکەوتبوو؟!! دیارە، چانسی نەبوو! ئاخر منێ، لەگەڵ چەن هاوبیرێکی دیکەی نەتەوەییدا، تازە، خەریکی کۆکردنەوەی هاوبیران و دامەزراندنی ڕێکخستنێکی نوێ بووین، تازە، هەڤاڵ « چخەیەر!» دەیویست، بە ناوی نیشتمانپەروەریی و دڵسۆزیی بۆ خـاکی « عێراق »، ناپاکیی لە خۆم و ڕۆڵەکانی گەلەکەم بکەم!!! «3»
بەڵام، ئەو کاتێ بەجێیهێشتم، گوتی: بیری لێ بکەرەوە، کاتێکی دیکە، قسەی لێ دەکەینەوە!
ڕۆژێکی دیکە هاتەوە و دیسانەوە، باسـەکـەی کردەوە. منیش، هـەر هەمـان قەوانی کۆنم بۆ لێدایەوە. ئینجا، ڕووی تێ کردم، لێی پرسیم و گوتی: تۆ کێ دەپەرستی؟
گوتم: خوا.
گوتی: باوەڕ بە ئایینی ئیسلام هەیە.
گوتم: بەڵێ. بەڵام، من نوێژ ناکەم و خۆشت باش دەزانی، هەموو شەوێ، لە یانەی « مامۆستایان » یا « فرمانبەران »، لەگەڵ هاورێکانمدا دادەنیشم و مەی دەخۆمەوە!
گوتی: هەموو شتێ، دەربارەی تۆ دەزانین. بەڵام، مەبەستم ئەوەیە، گەر لەو سەردەمەدا، « محەمەد » پەیامبەری ئیسلام بووبێ، ئەوا ئەوڕۆ، « میشیل ئەفلەق »، جێی گرتۆتەوە، پەیامبەری « بەعس » و هەموو عەرەبە.

گوتم: جگە لەوەی، من عـەرەب نیم و کـوردم، هێندەی منیش بزانم، هـەر لە سەرەتاوە، تا ئەم گەردوونەش ژێرەوژووردەبێ، کۆمەڵی موسوڵمانان، هەر یەک پەیامبـەریان هەبووە و هـەر ئەویش دەبێ! بەڵام، گـەر تۆ یەکـێکی دیکە، بە پەیامبەری خۆت دادەنێی، ئەوا، تۆ بۆ خۆت ئازادیی و هیچ پێوەندییەکی بە منەوە نییە.
گوتی: ئێمە دروشمێکمان هەیە و دەڵێین: باوەڕم بە بەعسە، سێکوچکەیەکە دەیپەرستم. دەزانی، مەبەستمان چییە؟ «4»
گوتم: نەخێـر. وەک پێم گـوتی، من لەو شـتـانە ناکـۆڵمـەوە، هەر خـەریکی خوێندنی خۆمم.
گوتی: سێکوچکەکە، لە « وەحدە، حوریە و ئیشتراکیە »دا خۆی دەبینێ! تۆ باوەڕت پێی هەیە؟
منیش، خۆمم لێ گێلکرد و گوتم: بەڵێ، باوەڕم بە هەر سێکیان هەیە. چونکە، سێ دروشمی جوانن. کێ بێ، حەز نەکا، هەموو « عێراقیی »یەکان یەکگرن، ئازادبن و لە ژێر ئاڵای سیستێمێکی سۆسیالیستانەدا بژین!
گـوتی: ئێـمـە، تەنیـا هەر باسی « عـێـراق » ناکـەین. بەڵکوو، باسـی هەمـوو نیشتمانی عەرەب و نەتەوەی عەرەب دەکەین!
گـوتم: ئاخـر، زووتر پێم گـوتی، من عـەرەب نیم. بەڵام، خـەڵکی « عـێـراق »م. کەواتە، هێندەی ئەو سێ دروشمـە، پێـوەندیی بە « عـێـراق » و گـەلەکـەیەوە هەبێ، هەوڵی بۆ دەدەم. بەڵام، لە ڕێی زانست و کـارکـردنەوە، نەک لە ڕێی کاری ڕامیاریی و پارتایەتییەوە بێ!
گـوتی: ئاخـر، ئێـمـە لێـرە، دۆسـتی زۆر باش و دڵسـۆزمـان نیـیـە، تا لە پاشەڕۆژدا، چارەنووسی نێوچەی « ئۆتۆنۆمیی »یان پێ بسـپێرین. چونکە، هەڤاڵ « سەددام حـوسێن » گوتوویەتی: نێـوچەی « ئۆتۆنۆمـیی » دەبێ، لە لایەن ڕۆڵەکانی خۆیەوە بەڕێوەببرێ! ئێـمـە دەزانین، تۆ گەنجێکی بە توانا و زیرەکی، دڵسۆزی گەلەکەی خۆتی. بۆیە، بە تۆ دەڵێم، کارمان لەگەڵ بکە، تا، کـاتێ دەرچووی، لێـرە داتمەزرێنین و بتـوانی، ڕاژەی گـەلی « عـێـراق » بە گشتیی و نێوچەی « ئۆتۆنۆمیی » بە تایبەتیی بکەی!
گوتم: گەر هەر کەسێ بیەوێ، ڕاژەی گەل و نیشتمانەکەی خۆی بکا، ئەوا بێ ئەوەی، لە ڕیزی هیچ پارتێکدا کاربکا، یا، کاری ڕامیاریی بکا، زۆر بە باشیی دەتوانێ، ئەو کارە بەئەنجامبگەیەنێ، وەک ئەو هەزاران « عێراقیی »یانەی، لە بەڕێوەبەرایەتییە جیاجیاکانی دەوڵەتدا کاردەکەن و سەر بە هیچ لایەکیش نین!

ئینجا، کەمێ خۆی کەرکرد، زەمانەکەی گۆڕی، وەک هەڕەشەبکا، وابوو.
گوتی: ئاخر، گەر لە سەر ئاستی کۆلێژەکەش، لە دە کەسی یەکەمیش بی، ئێمە نایەڵین، لێرە دامەزرێی، دوورتدەخەینەوە و ڕەوانەی گوندێکی خوارووی « عێراق »ت دەکەین!
منیش، هەلم بۆ هەڵکەوت، هەر زوو گرتم و گوتم: بۆچی، گوندەکانی نێوچەی « خواروو »، لە وولاتێکی دیکەن؟ ئایا، هەر لە « عێراق » نین؟!! گەر یەکێ بیەوێ، بژی و ڕاژەی نیشتمانەکەی خۆی بکا، لە « سولەیمانیی » بێ، یا، لە گوندێکی دوورەدەسی « خوارووی عێراق » بێ، چ جیاوازییەکی هەیە؟!!
ئیدی، سەرێکی بادا و کەمێ پێکەنی. پاشان، وازی لێ هێنام و گوتی: کاری من لەگەڵ تۆ تەواوبوو. لەوانەیە، برادەرێکی دیکە بێ و قسەت لەگەڵ بکا!
دوای ئەو، « غـــانم » ناوێ هات. کـــەللەزلێکی ڕەشی دڵ پڕ لە قین بوو. دەمزانی، هەر لە کۆلێژی « کشتوکاڵ » و لە بەشی « پیشەسازیی خۆراک » دەخوێنێ. بەڵام، یەکدیمان نەدەناسی. هات و بانگیکردم، زۆر بە گەرمیی، سڵاوی لێ کردم و یەکسەر، بێ پێشەکیی دایمەزراند. کۆمەڵێ قسەی ڕامیاریی ورد و ڕێکوپێکی نێو پەرتووکەکانی « بەعس »ی بۆ هەڵڕشتم، لەوانەیە، خۆشی باوەڕی پێیان نەبوویێ و لە دڵی خۆیدا، پێکەنینی بە قسەکانی خۆی هاتبێ!
منیش، زۆر بە کورتیی گوتم: چەن جارێ، برادەرێکی دیکە، ئەو شتانەی بۆ باسکردووم. وا بزانم، وەڵامی کۆتایی خۆمم داوەتەوە. ئیدی پێویست ناکا، هەموو ڕۆژێ، یەکێکی دیکە بێ و داوام لێ بکا، کاربکەم!
ئەم هەڤاڵەیان، زۆر هیچوپووچ بوو، خۆی تووڕەکرد و کەمێ بۆڵەبۆڵیکرد. پاشان، شەقێکی لە قوونی خۆی هەڵدا، بە دەم دەنگەدەنگەوە ڕۆی و ملی شکاند. ئیدی، تا ئەو ساڵ و نیوەش، خوێندنمان تەواوکرد، هەرچەند دەمبینی، مۆڕەی لێ دەکردم و لە بەر خۆیەوە دەیگوت: با، کۆنەپەرستان و ناپاکان بمرن! بەڵام، خوا هەڵ ناگرێ، لەگەڵ « عەلی »دا، وەک برادەرمان لێهات، بە تایبەتیی، لە پۆلێکیشدا دەمانخوێند، بۆیە هەرگیز، باسی کاری ڕامیاریی نەکردەوە!
ڕەنگە، گەر بڵێم، لەو خوێندکارە کوردانەی گەڕابوونەوە، پتر بایەخیان بە من دابێ و قسەیان لەگەڵ کردبێ، لە ڕاستیی لام نەدابێ. لەبەرئەوە، یەکێکی دیکەش هات، ناوی « عەبدولستار » بوو، خەڵکی « مووسڵ » بوو، پتر لە ئایینەوە نزیکبوو، وەک لەوەی، باوەڕی بە کاری پارتایەتیی هەبێ. لەگەڵ خۆمدا، لە پۆلێکدا دەیخوێند، هەر بۆ کاڵتە، لە نێو خۆمانـــدا، ناومانابوو

« عەبدولستار باوەشێن ». بەڵام، ئەم جارەیان، هەر دووکمان، هەر کردمان بە گاڵتە و زۆر زوو، بێ عارەق ڕزگارمبوو. بە قسەکانیدا دیاربوو، خۆشی زۆر باوەڕی بە « بەعس » نەبوو. بەڵام، لەوەدەچوو، بە زۆر، یا، لە پێناوی بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیدا، بووبووبێ بە « بەعسیی ». چونکە ڕۆژێ نەمدی، لە سەر « بەعس »، دڵی یەکێ لە هاوڕێ خوێندکارەکانی خۆی بیەشێنێ! «5»
سەیر ئەوەبوو، ئەو هەموو هەوڵەیان لەگەڵدا دام، کەچیی، شەوێ لە « یانەی فرمانبەران »ی « سولەیمانیی »، لەگەڵ چەن برادەرێکی نزیک و خۆشەویستدا دەمانخواردەوە، دوو خوێندکاری « بەعسیی » عەرەب « هانی و فیراس » هاتن و لامان دانیشتن. هەر دووکیان، خەڵکی « بەغدا » بوون. دوای ئەوەی، کەمێکیان خواردەوە و هێندێ قسەمانکرد، « هانی » ڕووی لە من و هاوڕێکانم کرد: گوتی: ئایا، ئێوە دەزانن، ئەو کوردەی دەبێ بە « بەعسیی »، ئێمە لە نێو خۆماندا، چی پێ دەڵێین؟!!
گوتمان: نەء.
گوتی: « نەغڵ » واتە: « زۆڵ ».
ئیدی، ئاوێکی فێنکی، بە قووڵیی دڵمدا کرد، ئاوڕشێنێکی باشی، دەروونە کەیلەکەی کردم. چونکە، ڕاستیی درکاند و وەک ئەوانی دیکە، هەوڵی نەدا، نێوچەی « ئۆتۆنۆمیی »، بە لاوانی دڵسۆزی کورد بسپێرێ، هەر وەک هەڤاڵی قارەمان « سەددام حوسێن » گوتبووی: دەبێ، ئەم نێوچەیە کوردەکان بەڕێوەیبەرن!
ئێستە، کاتێ دادەنیشم و هێندێ جار، بیر لەو ڕۆژەڕەشانە دەکەمەوە، لە دڵی خۆمدا، لێکیدەدەمەوە و و دەڵێم: ئاخۆ، لە نێو ڕیزەکانی گەلی کوردی هەرێمی « باشووری کوردستان »دا، چەن هەزار سەر « زۆڵ »ی گاڵتەقینە و ڕاستەقینەمان هەبووبێ؟!! ئاخۆ، چەن هەزار ناپاک و خۆفرۆشمان هەبووبێ، خۆیان لە ڕیزەکانی پارت و شۆڕشەکەدا حەشاردابێ و کەسیش پێی نەزانی بێ؟!! سەیر ئەوەیە، نەک هەر ئەو کاتە ناسک و پڕ لە ناسۆرەیە، « زۆڵ »ە کوردمان هەبووە، بەڵکوو ئێستەش، تا چیلکە، لە پیسایی کاری ڕامیاریی کوردیی و پارتایەتیی وەردەین، پتر بۆنی ناپاکیی « زۆڵ »ە کوردی دیکەی لێدێ!
هەڵبەتە، ئەو « زۆڵ » و خۆفرۆشە کوردانە، ئێستە، زۆر هەست بە کەموکووڕیی و خەوش ناکەن. چونکە، هیچ کەس و لایەنێکی دەسەڵاتدار نەبوو، لێیان بپرسێتەوە و بە سزای ڕەوای گەلیان بگەیەنێ. بەڵکوو، لە سایەی سەری، هەر دوو سەرکردایەتیی « پارتیی » و « یەکێتیی »یەوە، پاک و

ناپاک، چاک و خراپ، نیشتمانپەروەر و نیشتمانفرۆش، باش و جاش، کوردی ڕەسەن و زۆڵەک، حەرامزادە و حەڵاڵزادە، لەگەڵ یەکدیدا تێکەڵاو بوون و وەک یەکیان لێهاتەوە! بەڵام لێرەدا، گرنگ ئەوەیە، ئەو « زۆڵ » و نیشتمانفرۆشانە، جگە لەوەی، ئابڕووی نەتەوەیی خۆیان دۆڕاندووە، ئایا، لای ئەو دوو پارتە گەورەیەی « کوردستان »، بە چ چاوێ تەماشادەکرێن؟!!

ئەی هاوار خەڵکینە! بە چ دادێ ڕەوایە، عەرەبە « بەعسیی »یەکان، بە کوردە « بەعسیی »یەکانیان دەگوت: « زۆڵ ». کەچیی ئەورۆ، لای سەرانی پارتە ڕامیارییەکانی « کوردستان »، بە نیشتمانپەروەر دادەنرێن، ڕێزیان لە نیشتمانپەروەرە ڕاستەقینەکانی کورد پتر هەیە! ئاخر، بۆیە ئەوەتەی کورد هەیە، هیچی بە هیچ نەکردووە، چونکە، « زۆڵ »ی زۆر بووە!!!

* * *

---

تێبینی :

1. هەڵبەتە، کاتی خۆی دێ، بە درێژیی، لە هەموو لایەنێکی ئەو ساڵەی شۆڕش بدوێم. بەڵام، لەم گوتارە کورتەدا، تەنیا هەر مەبەستم ئەوەیە، باسێکی « نەغل » بکەم!

2. ئەو نامەیەم، تا ئێستەش هەر ماوە. چونکە نامەوێ، ئەو ڕۆژەڕەشەم بیربچێتەوە. نامەکەش بەم شێوەیە نووسرابوو:

الی/ من یهمه الامر

جری استنطاق حسین محمد عزیز العائد الی الصف الوطنی ولا مانع من اعادته الی عمله.

النقیب غانم یعقوب یوسف

رئیس الهیئه التحقیقیه قیاده الفرقه السابعه الاستخبارات.

3. « چخەیەر »، ناوێکی عەرەبیی نێوچەی خوارووی « عێراق »ە، کاتی خۆی، بۆ گاڵتەپێکردن، لە نێوان خۆماندا بەکارماندەهێنا!

4. امنت بالبعث، ثالوثا اقدسه.

5. ئەم ناوانەی، لە تێکستەکەدا هاتوون، گەر هاوڕێ خوێندکارەکانی خۆم، ئەم گوتارە بخوێننەوە، هەموویان دەناسنەوە!

# باوک
# و
# کوڕ

هەرچەندە، سەردەمی دەسەلاتی هەر دوو سەرکردەی پارت « بارزانیی » باوک و کوڕ، جیاوازییەکی زۆریان هەیە، بە تایبەتیی، باری ڕامیاریی و ئابووریی « کوردستان، عێراق، نێوچەکە و جیهان » گۆڕاوە، توانا و بەهرەکان، چوونیەک نین، ئەزموونی « نەتەوەیی، ڕامیاریی، دیپلۆماسیی، کۆمەلایەتیی، ئایینیی و کەلتووریی »یان، لە یەکدی ناچێ. بەلام، لەگەل ئەوەشدا، زۆر لە جێی خۆی دایە، گەر بەراوردێ، لە نێوان هەر دوو « بارزانیی » باوک و کوڕدا بکەم.

لەوە دەچێ، « مەسعوود بارزانیی »، هیچ لە « بارزانیی » باوکەوە فێر نەبوو بێ. چونکە، جگە لەوەی، هەلسوکەوت و ڕەوشتیان چوونیەک نییە، جیاوازییەکی تەواویش، لە نێوانیاندا هەیە. بۆ؟ لەبەرئەوەی:

« بارزانیی » باوک، خۆی خۆی پێگەیاندبوو، لە سایەی هیچ کەس و پارتێکدا، پێ نەگەیشتبوو، کەس فێری گیانفیدایی و خەباتی بەرزی کوردایەتیی نەکرد بوو. بەلکوو، ئەو خەلکی فێری کوردایەتیی دەکرد، هەموو لایەنەکان، هەر پێویستیان بەو بوو. تەنیا هەر « گرفت، چەرمەسەریی، برسێتیی، تینوێتیی، دەربەدەریی، ئەزموون، خەباتی ڕێی دووروودرێژی کوردایەتیی »ش، فێری دلسۆزیی و بە ئەمەکیی کردبوو. بەلام، « بارزانیی » کوڕ، لە سەر دەسی « بارزانیی » باوکدا، فێری کوردایەتیی و خەبات بووە، کەچیی، لە زۆر شتیشدا، لەو ناچێ!

« بارزانیی » باوک، هەرگیز جێنشینی کەس نەبووە، بەڵکوو، هەر لە سەرەتاوە، خۆی ژمارەیەکی تایبەتیی و شتبووە. بەڵام، « بارزانیی » کوڕ، لە جێی باوکی دانیشتووە، گەر ئەو نەبووایە، لەوانەیە، هیچ نەبووایە!

« بارزانیی » باوک، دڵێکی گەورە و دەروونێکی خاوێنی هەبوو. بۆیە، هەمیشە لە دوژمنەکانی خۆی خۆشدەبوو، پەیمانی ئاشتیی، لەگەڵ دەبەستن و ئاشت دەبوونەوە. بەڵام، « بارزانیی » کوڕ، حاوەنی ئەو دڵە گەورە و دەروونە بوختە نییە. لە چانسی رەشی کورددا، هێندە بیری تیژە، هیچ جۆرە [illegible] بیر ناچێتەوە، هیچ جۆرە حسێبێکیش، بۆ یەکێتیی ریزەکانی گەل و ئاییندەی « کوردستان » ناکا!

ئاخر، بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە، زۆر بە ئاشکرا دەبینین: کاتێ، سالی « **1970** »، « بارزانیی » باوک، سەرکەوتنێکی گەورەی نەتەوەیی و رامیاریی بەدەستهێنا، دوژمنەکانی نێوخۆی کورد و دەوڵەتی « عێراق »ی بەزاند، تووشی لووتبەرزیی و لەخۆباییبوون نەبوو، تا دوا فیشەک، لەگەڵ نەیارەکانی خۆیدا بجەنگێ و لەنێویانبەرێ. بەڵکوو، لێیانخۆشبوو، ئاشتبوونەوە و تێکەڵیشبوونەوە. بەڵام، « بارزانیی » کوڕ، کاتێ بە یارمەتیی سوپای داگیرکەری دەوڵەتی « عێراق »، هێزەکانی « یەکێتیی »یان شکاند، تا سنوورەکانی نێوان « عێراق » و « ئێران » راویاننان، هەوای سەرکەوتن لە کەللەی دا و چاوی لەو رەوشتە بەرزەی باوکی نەکرد، لەگەڵیان رێککەوێ و مەرجەکانی خۆیانیان، بە سەردا بسەپێنێ. بۆیە، ئەوانیش ناچاربوون، داکۆکیی لە خۆیان بکەن و بە یارمەتیی سوپای « ئێران »، جارێکی دیکە بگەرێنەوە، هێزەکانی « پارتیی » راونێن. ئاخر، گەر گوشاری « ئەمێریکا » و هێندێ لە دەوڵەتەکانی دەوروبەریش نەبووایە بۆ ئەوەی، شەڕەکە راگرن، ئەوا، لە « کوردستان »یش دەریاندەپەراندن و پاکیاندەکردنەوە!

« بارزانیی » باوک، پیاوێکی زۆر ئاسایی، ساکار، خاکیی و بێ فیزبوو، هەرگیز حەزی نەدەکرد، هێندێ نازناوی وەک: « مامۆستا »، یا « سەرۆک »ی « پارت » و گەلی « کورد »ی گوێ لێ بێ. بەڵکوو، بەو جۆرە شتانە، تووڕەش دەبوو! هەروەها، هاورێ و دۆستەکانی، نزیک و خۆشەویستەکانی، هەر بە « مەلا مستەفا » بانگیاندەکرد. بەڵام، زۆر لەوە دەچێ، « بارزانیی » کوڕ، لە مێژبێ، حەو بەو جۆرە نازناو و پلەوپایانەوە ببینێ! ئەدی کێ دەوێرێ، « بارزانیی » کوڕ، بە « مەسعوود » بانگکا؟!! یا، کێ دەوێرێ، لەو دەقەرەی بندەستی خۆیدا، باسی « مەسعوود بارزانیی » بکا و ناوی بێنێ، نازناوی « سەرۆک »ی لەگەڵ نەبێ؟!!

« بارزانیی » باوک، بە هیچ شێوەیە، باوەڕی بە سەــــــرانی داگیرکەرانی « کوردستان » نەبوو، لە نێو ئەو چیا سەرکەشانەی نیشتمانەکەی خۆیدا، وەک « هەڵۆ »، لانەیەکی بۆ خۆی سازکردبوو، بە « سەربەرزیی، سەروەریی، سەربەستیی و سەربەخۆیی » دەژیا. کاری بە شار و پێتەختی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان » نەبوو، مەگەر ناچاربووایە، ڕووی لە « تاران » بکردایە! بۆیە، هەمیشە داگیرکەران، لە نێو ماڵەکەی خۆیدا، پیلانیان دژ دەگێڕا، پەلاماریاندەدا و هەوڵی تیرۆرکردنیان دەدا!

بەڵام، « بارزانیی » کوڕ، چونکە، پەروەردەی چیا نییە، هەر لە شاردا گەورە بووە، لە کۆشی بنەماڵەی فۆزی « ڕێبار »دا، پەروەردەکراوە و فێری کاری ڕامیاریی بووە، نەیتوانیوە، وەک « بارزانیی » باوک دەرچێ، چیا چۆڵ نەکا، وەک ئەو، سڵ لە دوژمن بکاتەوە. تەنانەت، دوژمنانیش وەک باوکی، پەلاماری نادەن و بۆی ناچن! جگە لەوەی، بە ئێش یا بێ ئێشیش بوویێ، زۆربەی کات، لە پێتەختی دەوڵەتە داگیرکەرەکان ژیاوە و سەردانیکردووە. هەڵبەتە، بە خۆڕاییش نەیگوتووە: دڵم بۆ « بەغدا » لێدەدا!

« بارزانیی » باوک، هەرگیز پیاوی هیچ کەس و دەوڵەتێ نەبووە، بە وورەی بەرزی خۆی، بە ئەزموونی دەوڵەمەندی جەنگی پارتیزانیی خۆی، بە چەکی خۆی و پێشمەرگەکانی توانیویێتی، چەن ڕاپەڕین و شۆڕشێ بەرپاکا. بە داگیرکەران بڵێ: گەلی کورد، مافی ڕەوای خۆی دەوێ و دەیەوێ، لە ماڵە کاولەکەی خۆیدا، بە ئازادیی بژی. تا توانیویێتی و بۆی کراوە، دژی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان » وەستاوە، لەگەڵ سێ سوپای پڕ چەکی گەورەی، سێ دەوڵەتی داگیرکەری وەک: « عێراق، ئێران و توورکیا »دا جەنگاوە و شکاندوونی! بەڵام، « بارزانیی » کوڕ، نەک هەر ئەوەی نەکردووە، نەک هەر باوەڕێکی زۆری بە خۆی نەبووە و نییە، بەڵکوو، لەشکری سێ دەوڵەتی داگیرکەری « کوردستان »یشی، بۆ سەر سێ پارتی « کوردستانیی » هێناوە!

کەم بەرپرسی میریی و پارت هەبوون، سەردانی « بارزانیی » باوکیان نەکرد بێ. تەنانەت « سەددام حوسێن »، بەو هەموو دیکتاتۆریی، درندەیی، لووتبەرزیی و فیزە زۆرەوە، ساڵی « 1970 »، سەری لە « بارزانیی »دا و چی ویست، پێی کرد! بەڵام « بارزانیی » کوڕ، گەر شەرمی نەکردایە، هەر ڕۆژەی، لە دەرگەی ماڵی سەرکردەی دەوڵەتێکی داگیرکەری « کوردستان »ی دەدا!

زۆر دڵنیام، گەر « بارزانیی » بمایە، لەشکری « ئەمێریکا » و هێزەکانی هاوپەیمان، خاکی « عێراق »یان داگیرکردایە، هەموو نێوچەکانی « باشووری

کوردستان »ی ڕزگاردەکرد، بە هیچ شێوەیە، دانوستانی، لەگەڵ سەرانی دەوڵەتی « عێراق »دا نەدەکرد! هەر وەک چۆن، ساڵی « **1970** »ش، گفتوگۆی لەگەڵ سەرکردایەتیی « بەعس » و لێپرسراوانی دەوڵەتی « عێراق »دا کرد، خۆی نەچوو، بەڵکوو، چەن ئەندامێکی سەرکردایەتیی « پارتیی » نارد، گەر ئەو کاتەش بمایە، هەرگیز، خۆی ملی ڕێی « بەغدا »ی نەدەگرت و نەدەچوو، چەن نوێنەرێکی دەنارد، قسە لەگەڵ نوێنەرانی گەلی عەرەبدا بکەن. یا دەبووایە، ئەوان سەریان لێ بدایە!
کەچیی، « بارزانیی » کوڕ، هەر هێندەی « بەعس » ڕوخا، خۆی کۆکردەوە و خۆی گەیاندە « بەغدا ». تەنانەت، سەردانی شاری « نەجەف »یشی کرد، کە هەرگیز نەدەبوو، ئەو کارەی بکردایە!
ئاخر بۆیە، گەر « بارزانیی » باوک، سەرۆکی هەموو نەتەوەی کورد نەبووبێ، ئەوا، هیچ گومانی تێدا نییە، لە « باشووری کوردستان »دا، سەرۆکی هەموو گەلی کورد بووە، هیچ ڕکەبەرێ نەبووە و نەیتوانیوە، لەو بوارەدا، شان لە شانی بدا! بەڵام، « بارزانیی » کوڕ، تەنیا هەر، سەرۆکی « پارت »ەکەی خۆی نەبێ، سەرۆکی کوردی هیچ پارچەیەک نییە!
لە سەردەمی « بارزانیی » باوکدا، ناکۆکیی لە سەر دەسەڵات، لە نێو ئەندامانی بنەماڵەکەدا نەبوو، گەر هەشبووبێ، زۆر کەمبووە. کەچیی، لە سەردەمی « بارزانیی » کوڕدا و ئێستە، ناکۆکیی و ململانێ، لە سەر پارە و دەسەڵات، لە هەموو کاتێکی دیکەی تێپەڕاندووە. بەڵام، لە بەر بەرژەوەندیی خۆیان و بنەماڵەکەیان، جارێ دایانپۆشیوە!
« بارزانیی » باوک، خۆی لە هەموو کارێکی نەتەوەیی و ڕامیاریی « پارتیی » و شۆڕش هەڵ نەدەقورتاند. جۆرە دەسەڵاتێکی دیارییکراوی، بە ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتەکەی خۆی دابوو. جۆرە دیمۆکراسیی و ئازادیی ڕادەربڕینێ هەبوو. بەڵام، « بارزانیی » کوڕ، هەموو جۆرە دەسەڵاتێکی « پارتیی، میریی و دەزگەی پاراستن »ی، لە سەر « خۆی، کوڕ، برا، برازا، ئامۆزا و خزم »کانی قۆرخکردووە. بێ ئەو، هیچ ئەندامێکی سەرکردایەتیی « پارتیی » بۆی نییە، هیچ جۆرە بڕیارێبدا. هیچ جۆرە دیمۆکراسیی و ئازادیی ڕادەربڕینێ، لە نێو ڕیزەکانی پارت و دەزگەکانی میریی دەڤەرەکەی خۆیدا نییە. جا گەر وا نییە، هەڵبەتە، کاتێ ئەو هەموو گرفت، کێشە، کەموکووڕیی، هەڵە، تاوان، ناپاکیی و جەنگە نێوخۆییانەی، لە سەردەمی دەسەڵاتی « بارزانیی » کوڕدا هەن و ڕوویانداوە، هەڵبەتە، ئەندامانی سەرکردایەتیی « پارتیی » دەیانتوانی، نارەزایی خۆیان دەربڕن! یا،

سکرتێری پارتەکەی « جەوهەر نامیق سالم »، لە سەر ڕەخنەگرتن، لە کۆبوونەوەی سەرکردایەتییدا، بێ دەنگ نەدەکرا و داوایان لێ نەدەکرد، وازبێنێ، ئەویش، وازی لە پۆستی سکرتێری « پارتیی » نەدەهێنا!
« بارزانیی » باوک، هێندە کوژراوی پارەوپوڵ نەبوو، بەڵام، ئەوەی لە نزیکەوە، « بارزانیی » کوڕ دەناسێ، دەڵێن: بە تەواویی، بە پێچەوانەی « بارزانیی » باوکەوە هەڵکەوتووە و ڕەفتاردەکا! ئەدی گەر وا نەبووایە، ئەو هەموو ناکۆکیی و پێکدادانە، لە سەر پردە زێڕینەکەی « برایم خەلیل » ڕوویدەدا؟!!
لەبەرئەوە، گەر بمەوێ، کار و کردەوەکانی « باوک » و « کوڕ »، بە تەواویی بەراوردکەم، ئەوا زۆری دەوێ و ئەم هەویرە، ئاو زۆر دەکێشێ. بۆیە، لە کۆتاییدا، هەر وەک پێشینان فەرموویانە، منیش هەر هێندە دەڵێم: بە هەزار سووژن، کاسێکی تێدا نابێ!*

* * *

---

* ئەوە، یاسای سروشت و ژیانە، ئەو کەسەی کاربکا، هەڵەشدەکا. لەبەرئەوە، هیچ مرۆڤێ نییە، لە هەڵە بەدەربێ و هەڵە نەکا، هەرچەندە، ناوبانگی نەتەوەیی، بەرپرسیاریی ڕامیاریی، پلەی پارتایەتیی، پایەی کۆمەڵایەتیی، جێگەی ئایینیی و ئاستی کەلتووریشی بەرزبێ!
گەر بمەوێ، کەسێتیی « بارزانیی » باوک، بە جیا هەڵسەنگێنم، ئەوا، گومانی تێدا نییە، دەبێ، لە هەموو دید و بۆچوونەکانی بدوێم، کار و کردەوەکانی هەڵسەنگێنم، لایەنە چاکە و خراپەکانی باسکەم، هەڵە و کەموکوڕییەکانی دەسنیشانکەم. واتە: وەک خۆی چۆن هەبووە، هەر بەو شێوەیەش، پێشکەش بە خوێنەرانی کوردی بکەم، تا بتوانم، تابلۆیەکی هەمەچەشنەی ڕاستەقینەی کەسێتیی « بارزانیی » بکێشم. ئەگینا، گەر وا نەبێ، وێنەی فریشتەیەک دەکێشم، هەرگیز، لە سەر زەوی نەژیابێ!
بەڵام، لەم گوتارە کورتەدا، پەنجەم بۆ ئەو لایەنانە ڕا نەکێشاوە. چونکە، مەبەستی سەرەکیی ئەم نووسینە، ئەوە نییە، بەڵکوو، کرۆکی باسەکە، تەنیا هەر، خۆی لە بەراوردکردنی کەسێتیی و خەسڵەتی، هەر دوو « بارزانیی » باوک و کوڕدا دەبینێ. ئەگینا، « بارزانیی » باوکیش، وەک هەموو مرۆڤێکی دیکە، هەر لە گۆشت و ئێسک دروستبووبوو، هەر هەمان خوێنی سووریش، بە دەمارەکانی جەستەیدا دەسوڕایەوە. لەبەرئەوە، هەڵە و کەموکوڕیی خۆی هەبووە. بەو هیوایەی، لە دەرفەتێکی دیکەدا بتوانم، لە هەموو لایەنەکانی کەسێتیی « بارزانیی » باوک بدوێم!

# پیاوی گەورە
# و
# لێبووردن!

« شێخ مەحموودی حەفید » فەرموویەتی: (گەورەیی بە لێبووردن، دارایی بە کۆشش دەستدەکەوێ. بەڵام، جەنگ بە هەر دووکیان و سوپا دەکرێ.)«1» لێرەدا دەمەوێ، لە بەر ڕۆشنایی ئەم گوتە پڕ بایەخەی « شێخ »ی نەمردا، دەربارەی لێبووردن، هەڵوێستی سێ پیاوی گەورە، بە نموونە بێنمەوە.

**1. نێوەدوورگەی عەرەب:**

کاتێ موسوڵمانەکان، ژمارەیان زیادیکرد، دەس و مەچەکیان، ئەستوور و بەهێزتربوو، ڕەوشەکە لەباریبوو، ئیدی، کاتی ئەوە هاتبوو، نێوچەکانی دیکە، لە دەس گاوورەکان ڕزگارکەن. بۆیە، لەشکرێکی گەورەیان کۆکردەوە، بە سەرکردایەتیی پەیامبەر « موحەممەد »، پەلاماری شاری « مەککە »یان دا و ئازادیانکرد، خەڵکی شاریان، لە ئاسەواری بتپەرستیی و زۆرداریی ڕزگار کرد. هەرچەندە، هێندێ لە سەرکردە و خەڵکە موسوڵمانەکان بە تەمابوون، گەر گاوورەکانیان بەردەسکەوێ، هەموویان بکوژن! یا، وایاندەزانی، پەیامبەر هەموو گاوورە نەیارەکانی خۆی سەردەبڕێ. بەڵام ئەو، ئەو کارەی ڕەتکردەوە و فەرمووی: نابێ، کەس دەس بۆ کەس بەرێ، « هەر کەســــێ، بچێتە ماڵی « ئەبوسوفیان »، ئەوە باوەڕدارە. * بە مەرجێ، « ئەبو سوفیان »، یەکێ لە دوژمنە هەرە سەرسەختەکانی ئایینی ئیسلام و « موحەممەد »، بوو. بەڵام ئەو، هەم ئاوێکی پڕ بە سۆزی، بە ئاگری جەنگی نێوخۆی نێوان عەرەبە موسوڵمانەکان و بتپەرستەکاندا کرد، نەیهێشت، لەوە پتر، خوێنی عەرەب بە

دەسی عەرەب بڕێژرێ و ئەوانیش، هەموو موسوڵمان بوون. هەم دەیزانی، هێشتا ئەو هێزە گەورەیەی نییە، تا ئەو کارە بکا. جا، گەر هەموویانیان بکوشتایە، چ کەڵکێکی دەبوو؟!! گەر بلیمەتیی پەیامبەر نەبووایە، دوور نەبوو، لە جەنگێکی خوێناویی گەورەدا، یەکدیان قڕکردایە، ئەو کاتە، کێ دەیزانی، موسوڵمانەکان ئەو هێزەیان دەبوو، تا، ئایینەکەیان بەو شێوەیە، لە سەرتاسەری جیهاندا بڵاوکەنەوە؟!

**2. میسـر :**

ساڵی « **1880** »، هێزەکانی « بریتانیای گەورە »، خاکی « میسر »یان داگیر کرد. ڕۆژی « **1922. 02. 28** » ئیمپریالیزمی « بریتانیا »، وازی لە مەنداتی « میسر » هێنا. ڕۆژی « **03. 11** »ی هەمان ساڵیش، « ئەحمەد فوواد »، شایەتی خۆی ڕاگەیاند. بەڵام، نیشتماتپەروەرانی « میسر » دەیانزانی، هێشتا، لە ڕووی « نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئابووریی، کەلتووریی ... »یەوە، بە تەواویی ڕزگاریان نەبووە. بۆیە، هەر زوو کەوتنە خۆیان و بە سەرکردایەتیی پیاوێکی گەورەی دڵسۆزی وەک: « سەعد زەغلوول »، پارتی « وەفد »یان دامەزراند. خەباتێکی بێ وچانی ڕامیارییان کرد، تا، سەربەخۆیی تەواو، بۆ « میسر » دابینکەن. لەگەڵ ئەوەشدا، جار و بار، نیشتمانپەروەرە شۆڕشگێڕەکان، دەسێکی کوشندە و مەردانەیان لە کاربەدەس و لێپرسراوانی « ئینگلیز »، عەرەبە سیخوڕ و ناپاکەکانیش دەوەشاند و بە سزای مەرگیان دەگەیاندن!

بەڵام، « بریتانیا » نەیتوانی، ئەو شارە زەردەواڵە شۆڕشگێڕییە گەورەیەی نیشتمانپەروەرانی « میسر » لەنێوبەرێ. چونکە، وا لێی وروژابوون، بە هیچ شێوەیە لێی نەدەبوونەوە! لەبەرئەوە، « ئینگلیز » ناچاربوو، شا « فوواد » ڕاسپێرێ، لەگەڵ « زەغلوول »دا ڕێککەون، تا، ئەو ئاژاوە گەورەیە بکوژێننەوە و کادیرەکانیان، لە کوشتن قووتارکەن. ئەوەبوو، داوایان لێ کرد، پۆستی سەرۆک شالیارانی « میسر » وەرگرێ و کابینەی شالیارگەکەی پێکبێنێ.

لەو کاتەدا، ئەندامانی « وەفد » زۆربووبوون، ڕێکخراوەکەیان بەهێزتربووبوو، دەسیان زۆر دەڕۆی، هێندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتیی، لەو باوەڕەدابوون، ئەوە هەلە و هەڵکەوتووە، نابێ، لەکیسدرێ و دەبێ، دەسێکی کوشندە و باش، لە نەیار و ناپاکەکانی « میسر » بوەشێنن. لەبەرئەوە، داوایان لە « زەغلوول » کرد، هەموو عەرەبە ناپاکەکان پاکتاوکرێن و لەنێوبرێن! کەچیی، ئەو دژی ئەو دەنگانە وەستا و بە پێچەوانەشەوە، لێیانخۆشبوو، تا، واز لە ڕێی ناپاکیی

بێن و وەک نیشتمانپەروەرێکی ڕاستەقینە، ڕاژەی گەلی عەرەب و خاکی « میسر » بکەن. بۆیە گوتی: هێشتا دوژمنی بیانیی، خاکەکەی داگیر کردووین، دەیەوێ، لە لایەکەوە، ڕۆڵەکانی گەلی « میسر »، دەسیان بە خوێنی یەکدی سووربێ. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەم وولاتە، تەنیا هەر بە ئێمە ڕزگار ناکرێ، بەڵکوو، ئەو کارە گەورە نەتەوەیی و ڕامیارییە، بە هەموو ڕۆڵەکانی گەلی « میسر » ئەنجامدەدرێ. ئەوەبوو، « زەغلوول » خۆی، هێندەی دیکە، لە بەر چاوی ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆشەویست و گەورەتربوو، ڕیزەکانی پارتی « وەفد » فراوانتربوو، گەلەکەشی، لە مەترسیی کوشتنوبڕین دوورخستەوە و زۆربەی ئەو ناپاکانەش، وازیان لە کاری خراپە و دوژمنکارانە هێنا! بەڵام، گەر هەموویان تیرۆرکرابنایە، کێ قازانجی دەکرد؟!! ئایا، ئامانجەکانی دوژمنی داگیرکەر، بە زیادەوە بەدی نەدەهات؟!!

### 3. باشووری کوردستان :

ڕۆژی « 1961. 09. 11 »، شۆڕشی گەلی کورد، لە چیاکانی « باشووری کوردستان » ڕاگەیەنرا و جەنگ دەسپێکرد. ساڵی « 1963 – 1964 »، ناکۆکیی و دووبەرەکیی، لە نێوان ئەندامانی سەرکردایەتیی « پارتیی » و « بارزانیی »دا سەریهەڵدا. ئەو دووبەرەکییە، ماوەی شەش ساڵی ڕێکی خایاند، کوشتارێکی زۆر، لە هەر دوولا کرا و خوێنێکی زۆریش ڕژا. گەلی کورد، ئەو دوولا نەیار و شەڕکەرەی، لە لاپەڕەکانی مێژوودا، بە « مەلایی » و « جەلالیی » تۆمارکرد. لەو لاشەوە، دوژمنی داگیرکەری دەوڵەتی « عێراق »، تا دەهات، ئاگری جەنگەکەی، پتر گەرمدەکرد، دژی هێزەکانی بەرەی شۆڕش و « بارزانیی »، یارمەتییەکی زۆری « جەلالیی »یەکانی دەدا. تا، هێزی پێشمەرگەی « کوردستان » توانی، سەرکردایەتیی پارتی « بەعس » ناچارکا، لە چوارچێوەی کۆماری « عێراق »دا، دان بە هێندێ، لە مافە ڕەواکانی گەلی کورددا بنێ، ڕێککەوتننامەی « 1970. 03. 11 » مۆرکەن و بڵاویکەنەوە، کە لە کاتی خۆیدا، بە سەرکەوتنێکی مەزن دانرا. هەرچەندە، ئەو دانپێدانان و ڕێککەوتنە، لە باوەڕێکی پتەو، لە دیدێکی مرۆیانەی، فەلسەفە و ئایدۆلۆژیای « بەعس »ەوە هەڵ نەقولابوو، بەڵکوو، لە بەر لاوازیی باری نێوخۆی پارت و دەوڵەتەکەیان بوو. واتە: هەنگاوێکی تاکتیکانە بوو! 1*

لە هەمان کاتیشدا، سەرانی « بەعس » دەیانویست، « مەلایی » و « جەلالیی » بەیەکدابدەن و ئەو ڕووبارە خوێنەی کورد، هەر بەردەوامبێ و لەبەری بڕوا. چونکە، بە ئەندێشەی پڕوپووچی خۆیان، وایاندەزانی، « بارزانیی »، هەموو

نەیارەکانی خۆی پاکتاودەکا و لەنێویاندەبا، وەک هێندێ کوردی هەلپەرست و گێرەشێوێنیش، لە دەوری « بارزانیی » کۆببووبوونەوە و خەویان پێوە دەبینی! بە تایبەتیی، ڕەوشەکە بۆ ئەو کارە، زۆر لەباربوو، چونکە، ســـەرۆک کۆمار « ئەحـــمــەد حــەســەن بەکـر »، دەربارەی هێـزەکـانی « جـەلالیی »، زۆر بە ڕاشکاویی گوتبووتی: هێزێکی فەرمیی نین! 2*

ڕاستــە، « بارزانیی » سـەرکـەوتنێکی گـەورەی بەدەسـهـێنابوو، کـە هـەمـوو نەیارەکانی، بە خەوی شەویش نەیاندیبوو! ڕاستە، « بارزانیی » دەیتوانی، فرمانبدا، جەنگ لە نێوان هێزی پێشمەرگە و « جەلالیی »یەکاندا بەردەوامبێ و خوێنێکی زۆری دیکەش بڕێژرێ. چونکە، پشتوپەنایان نەمابوو، خۆشیان، زۆربەی هەرە زۆریان، ورەیان ڕوخابوو!

بەڵام، وردبینیی و زیرەکـیی « بارزانیی »، پتـر بەوەدا دەرکـەوت، هەم لە نەیارەکانی خۆشبوو، لەگەڵیان ڕێککەوتەوە و وەک دەڵێن: دوژمنی خۆی، بە شـەکـر خنکاند! هـەم ئەو پیـلانـەی سـەرانی « بەعس »یشی پووچەڵکردەوە و نەیهێشت، چی دیکە، خوێنی کوڕی کورد، بە دەستی کورد خۆی بڕێژرێ! بەم کـــارەش، « بارزانیی » توانـی، بۆ دۆست و دوژمنی بســـەلمێنێ، نەک هـەر سەرۆکی « پارتیی »یە، بەڵکوو، بە ڕاستیی، سەرکردەیەکی گەورە و لێهاتووی هەموو کوردە! هێندەی دیکەش، لە دڵ و دەروونی ڕۆڵەکانی گەلدا، گەورەتر و خۆشەویستتربوو!

لەبەرئەوە، ئەز لەو باوەڕەدام، یەکێ لە کارە هەرە باش و پیرۆزەکانی ژەنەڕاڵ « بارزانیی » ئەوەبوو، ساڵی « 1970 »، لە نەیارەکانی خۆی خۆشبوو، تەنیا بە بلاقـۆکێ، هەمـوو ڕیزەکـانی گـەلی کـوردی یەکـخسـتـەوە و لەگـەڵیـاندا ڕێککەوتەوە! کەچیی، « حەمەسەعید حەسەن »، دوای « 25 » ســاڵ، تازە هاتووە، ئەو کارە نەتەوەیی و هەنگاوە گەورە ڕامیارییە بەرزەی « بارزانیی »، بە هەڵە داناوە، بەپێچەوانەی لۆژیک و بەرژەوەندیی باڵای نەتەوەی کوردیشەوە بیـریکردۆتەوە و نووسـیـوێتـی:(گـەورەترین هەڵەی بارزانی ئەوە بوو، ســاڵی 1970 لە ناپاکـان خـۆشـبـوو. بیـسـت سـاڵە، نەک هـەر تەنیـا پارتی، هەمـوو کـۆمـەلانی خـەڵکی کـوردسـتـان، بە ڕووبـاری خـوێن باجی ئەو هەڵەیە دەدەن.)»14،3« 3*

ئاخـر، ئەوە نەک هەر بە هـەڵە ناژمێـررێ، بەڵکوو، بە کـارێکی گـەلێ پیـرۆزی مەزنی نەتەوەییش دادەنرێ. لە هەمان کاتیشدا، یەکێ لەو ســـەروەرییانەی « بارزانیی »یە، کە ڕۆڵەکانی کورد دەبێ، پەندی مێژوویی لێ وەرگرن و فێری لە یەکدی بووردبن بن، تا، یەکێتیی و تەبایی، ڕیزەکانی نەتەوەی کورد پتەوتر

و بەهێزتربێ! چونکە، گەر یەکێتیی و تەبایی نەبێ، جگە لەوەی، کورد هیچی بۆ ناکرێ و بە هیچ نابێ، تەنیا دوژمنانی نێوخۆ و داگیرکەری بیانییش، کەڵک لە ناکۆکیی و دووبەرەکیی، نێوان ڕیزەکانی گەل دەبینن. هەر وەک « قانع »ی بلیمەت و خەمخواری کوردیش، دەربارەی یەکێتیی ڕیزەکانی گەل، بە تاکە دێڕێ گوتوویەتی:
شوان و سەپان و ئاغا، سەردار و میر و گاوان
گەر یەک نەگرن هەمووتان، وێرانە حاڵی کوردان «**119،4**»
هەروەها، بە دوو نیوەدێڕ هۆنراوەی دیکە دەربارەی یەکێتی کورد گوتوویەتی:
یەکیەتیی و دۆستایەتیی خەڵکیی، کەوا پیرۆزە لام
من بە ناخی، فەلسەفەی ئەفکاری قەومیی تێئەگەم «**202،4**»
بە ڕاستیی، نەتەوەی کورد بە گشتیی و گەلی کورد لە « باشوور » بە تایبەتیی، جگە لەوەی، لە نێو خۆدا یەکگرتوو نییە، هێندە گرفتی « نەتەوەیی، ڕ میاریی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، کەلتووریی ... » هەیە و لە لایەن هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەشەوە، بە شێوەیەکی وا دڕندانە، ڕۆڵەکانی دەچەوسێندرێنەوە. بۆیە، بیریارێکی گەورەی وەک ماموستا « مەسعوود محەمەد »، هەر وا بە خۆڕایی نەیفەرمووە: کوردم بە جاشێتیش قەبووڵە!
بەڵام، وا دیارە، « حەمەسەعید » ویستوویەتی، لە لایەکەوە، سووکایەتیی بەو کارە پیرۆزەی « بارزانیی » بکا! لە لایەکی دیکەشەوە، لەوە دەچێ، حەزی کردبێ، ئەو جەنگە چەپەڵە، لە نێوان ڕۆڵەکانی گەلی کورددا، هەر بەردەوام بێ. بۆیە، کای کۆنی بەباکردووە و بەنزینی بە ئاگری جەنگی نێوخۆی، نێوان ئەو دوو باڵەی جوڵانەوەی کوردایەتییشدا کردووە! ئەگینا، گەر ئەو کارە هەرە باشە گرنگە نەتەوەیی و ڕامیارییەی « بارزانیی »، بە هەڵە دانرێ، ئیدی دەبێ، کارە ڕاستەکانی دیکەی، لای یەکێکی وەک « حەمەسەعید » چی بێ؟!!
لەوە دەچێ، « حەمەسەعید » ویستبێتی، ڕێ پیشانی « بارزانیی » بدا! جا، گەر بە قسەی ئەوی بکردایە، دەبووایە، هەموو نەیارەکانی خۆی بگرتایە و لە قەزێنی گرتووخانەکانی « ڕایات » توندیکردنایە، یا هەموویاتی بکوشتایە؟!!
بەڵام، گەر « بارزانیی » ئەو کارەی بکردایە، کەی سەرکردەی کوردبوو؟!! جیاوازیی لەگەڵ چەن دیکتاتۆرێکی کەللەڕەقی خوێنڕێژی وەک « ستالین، پۆڵپۆت، چاوشیسکۆ، هۆنیکەر، کیم ئیل سۆن، سەددام حوسێن ... »دا چی بوو؟!!
یەکێ کەمێ ژیربێ، کەمێ بە تەنگ بەرژەوەندیی نەتەوەیی و ڕامیاریی کوردەوە بێ، هەرگیز، بەو جۆرە بیر ناکاتەوە و ئەوە بە چارەسەر نازانێ!

ئاخر، کەی ئەوە چارەسەری پێ دەڵێن؟ کێ دەڵێ، ئەو جەنگەی نێوانیان دەبڕایەوە، با میریی « عێراق »یش، وازی لێ هێنابووین! بۆ دەوڵەتێکی دیکەی داگیرکەر نەبوو، پەنای بۆ بەرن؟!! لەبەرئەوە، هەر « بارزانیی » بوو، بە زیرەکیی خۆی توانی، چارەسەرێکی بنەڕەتیی، بۆ ئەو جەنگە چەپەڵە خوێناوییەی نێوان کورد و کورد دانێ! هەر ئەو بوو، توانی، ئەو کاتە، ماڵە وێرانەکەی کورد ڕێکخاتەوە و هەمووی وەک مەڕ، دوای شوانە بە ئەمەکەکەی خۆیان بخا! ئاخر، هەموو پیاوێ، ئەو دڵە گەورەیەی نییە و کاری وا گەورەش، لە دەس هەموو بۆرەپیاوێ نایە!!!

جا گەر یەکێ، لە گەرمەی جەنگی چەپەڵی نێوخۆی نێوان « پــــــارتیی » و « یەکێتیی »دا، ئەو مشتە ژارە هەڵڕێژێ، ئەو قسە دوژمنکارانەیە بکا و شتی لەو جۆرانە بنووسێ، ئیدی دەبێ، تێڕوانینی بۆ سەرجەم، کێشەکانی دیکەی کورد چۆن بێ؟!! بە چ شێوەیە، گرفتەکانی کورد چارەسەرکا؟!! بە ڕاستیی، گەر ئەمە گێرەشێوێنیی نەبێ، هەوڵدان نەبێ، هێندەی دیکە، ڕۆڵەکانی کورد، لە یەکدی تێژکرێ، هێندەی دیکە، ڕیزەکانی گەلی کورد، لە یەک بترازێ و هەڵوەشێ، هیچ شتێکی دیکە نییە. ئایا، نیشتمانپەروەری ڕاستەقینە، ئەوە هەڵوێست و گوتاری دەبێ؟!! ئایا، نیشتمانپەروەریی ڕاستەقینە ئەوەیە، تۆوی « ناکۆکیی، دووبەرەکیی، ڕکوکینە، تۆڵەسەندنەوە و جەنگی نێوخۆ » بچێنی؟!! ئایا، ئەرکەکانی سەر شانی نووسەر ئەوەیە، سەرانی پارتەکان هاندا، تا، خوێنی پتر بڕێژن و کورد بە کورد بەکوشتبدەن؟!!

سەیر ئەوەیە، لە شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا، دەوڵەتی داگیرکەری « بەعس »، کارێکی کردبوو، نزیکەی چارەکە میلیۆنێ کوردی، بە زۆر و بە خواییشت کڕیبوو، لە ڕیزەکانی پارتی « بەعس »، دەزگە سیخوڕیی و هێزەکانی جاشدا ڕێکیخستبوون. بەپێی ئەم بۆچوونە چەوتەی « حەمەسەعید » بێ، دەبووایە، سەرکردایەتیی ڕامیاریی « پارتیی » و « یەکێتیی »، دوای ڕاپەڕین، هەر هەموو ناپاکەکانیان لەنێوبردایە! تۆ بڵێی، گەر « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، ئەو ڕەشەکوژییەیان، لە ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆیان بکردایە، با ناپاکیشیان کردبێ، مێژوو بە کارێکی نەتەوەیی و ڕامیاریی باش، بۆی تۆمارکردنایە؟!!

هەڵبەتە « حەمەسەعید »، نە بیری لەوە کردۆتەوە و نە دەشیەوێ، بیری لێ بکاتەوە، گەر لەو کاتە ناسکەدا، ئەو هەموو ناپاکانەیان بکوشتایە، چەن تیرە و هۆزی گەورە و گچکە، پەلاماری یەکدیان دەدا؟! چەن خێڵ و لایەنی دیکە، دژی « شــۆڕش، پارتیی و بارزانیی » دەوەستــان و پەنایان بۆ « بەعس » دەبرد؟!! چ جۆرە دوژمنایەتییەک، لە نێوان ڕیزەکانی گەلدا دروستدەبوو؟!!

کەی ئەو جۆکە خوێنە دەوەستایەوە؟!! چەن ماڵ وێراندەبوو؟!! چەن دایک و باوک، جەرگیان دەسووتا؟!! چەن ژن بۆ مێرد و خوشک بۆ برا ڕەشپۆش دەبوون؟!! چەن ژنی کورد، بە بێوەژنیی دەمانەوە؟!! چەن منداڵ، هەتیوو دەبوون؟!! دیارە، ئەو شتانەی بە لاوە گرنگ نییە، بەڵکوو، لای ئەو، تەنیا هەر ئەوە گرنگە، دوژمنە سەرسەختەکەی « جەلالیی » پاکتاوکرێ، ئیدی، کورد چی بەسەردێ، مێش میوانی نابێ!!!

ئاخر، گەر « حەمەسەعید »، مەبەستێکی تایبەتیی نەبووبێ، وا بەو شێوەیە، باسی ناپاکانی ساڵی « **1970** »ی کردووە، ئەدی، بۆچی لە ئاستی ئەو هەموو ناپاکانەی شۆڕشی نوێماندا، نقەی لە خۆی بڕیوە؟!! بۆچی، ڕەخنەی لە « بارزانیی » باوک گرتووە و ڕەخنەی لە « بارزانیی » کوڕ نەگرتووە، بە تایبەتیی، خۆی زۆر باش دەزانێ، ژمارەیەکی زۆر، لە هێزی چەکدار و ئەندامانی « پارتیی »، لە ناپاکەکانی کورد پێکهاتوون؟!! هەڵبەتە، ئەم کاسەیە، بێ ژێرکاسە نییە!

هەڵبەتە، ڕاستیان فەرمووە: ئەوەی دەسی لە ئاودابێ، وەک ئەوە نییە، دەسی لە ئاگردا بێ! ئاخر، ئەو کاتە و هیچ کاتێکی دیکەش، یەکێکی وەک: « حەمە سەعید »، نەک هەر دەسی بە ئاگری جەنگی نێوخۆ نەسووتاوە، بەڵکوو، چڵەپووشێکی قرچۆکی بێ بایەخیشی، لەو جەنگە چەپەڵانەی، نێوان باڵەکانی بزووتنەوەی کوردایەتییدا نەسووتاوە و ئەوەتەی هەشە، لە بزووتنەوەی کورد و شۆڕشەکەیەوە دووربووە. مەگەر لەو کاتەوە، وازی لە پارتی « کۆمۆنیست » هێنابێ، جار و بار، دەمی لە خەباتی کوردایەتییەوە دابێ! ئەگینا، یەکێ (بیری نەتەوەیی کوردیی و « عرووبەکەی سەددام حوسێن »، کە هەستی بەعس و نەتەوەی باڵادەسە، « بە دوو ڕووخساری یەک دراو، دوو تاکی یەک جووت پێڵاو » دابنێ، )«69،2» کەی دەتوانێ، ڕاژەی کورد بکا؟!! کەی تۆزی کوردایەتیی، لە قوڕولیتاوی ئەو دیدە چڵکنە هەڵدەسێ؟!! کێ بیستوویەتی و دیویێتی، ڕۆژێ لە ڕۆژان، « حەمەسەعید » کوردایەتیی کردبێ، وا بە ڕاست و چەپدا، سووکایەتیی بە کوردپەروەران دەکا؟!! تۆ بڵێی، ئەو بابەتانەی ئەمڕۆش دەیاننووسێ، بە خەباتی کوردایەتیی بزانێ؟!! مەگەر هەر ئەندامانی « پارتیی »، کەڵکیان لێ وەرگرن، ئەگینا، کوردپەروەری ڕاستەقینە، قێزی لەو جۆرە نووسینانە دێتەوە. چونکە، زۆربەی زۆری نووسینەکانی، جگە لە « ناکۆکیی، دووبەرەکیی، ئاژاوەنانەوە، ڕکوکینە و سووکایەتیکردن بە خەڵک »، هیچی دیکەیان تێدا نییە و ڕاژەی بزووتنەوەی کوردایەتیی ناکەن!

بە داخەوە، لەوە دەچێ، ئەندامانی سەرکردایەتیی « پارتیی » بە گشتیی و بنەماڵەی « بارزانیی » بە تایبەتیی، هەموو ئەو دیدە ژاراوییانەی « حەمە سەعید »یان، زۆر لا پەسەندبێ، بۆیە، وا خوێندەوارێکیان تێدا هەڵ نەکەتووە، بەلامیبداتەوە و داکۆکییش، لەو کارە مێژوویی و هەنگاوە پیرۆزەی ژەنەڕاڵ « بارزانیی » بکا، بریا، « بارزانیی » وەجاخی کوێر نەدەبوو!!!
لە کۆتاییشدا، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: لەگەڵ ئەوەی، بە باوەڕێکی تەواوەوە، لەگەڵ لێبووردن و یەکێتیی ڕیزەکانی گەل دام، بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، لەگەڵ ئەوەدا نیم، لە هیچ سەردەمێکدا، هیچ جۆرە ناپاکێ، وەک نیشتمانپەروەرێکی تێکۆشەر، ڕێزی لێ بگیرێ. بە ڕاستیی، هەرگیز نەدەبوو، سەرکردایەتیی « پارتیی » و « یەکێتیی »، ئەو ناپاکانەیان، لە ڕیزەکانی خۆیاندا وەرگرتایە، پۆستی گرنگیان، لە ڕیزەکانی سوپا، پارت و میرییدا پێ بسپاردنایە!
ئینجا، هەر ئەوە ماوە بڵێم: دەترسم، « حەمەسەعید » پێی وابێ، سەرانی « یەکێتیی » هانیاندابم، لە سەری بنووسم. چونکە، بەردێ لە ئاسمانەوە بەربێتەوە، گەر بەر خۆشی نەکەوێ، ئەو، هەر بە دەسی ئەوانی دەزانێ! جا، بۆ ئەوەی زۆر دڵنیابێ و بیری لێ نەکاتەوە، جگە لەوەی، هەموو کەسێ وەک خۆی نییە، بە ناوی بێلایەنییەوە، لایەنی لایەک بگرێ و دژایەتیی لاکەی دیکەیان بکا، هیچ ئەندامێکی « یەکێتیی »ش، هەرگیز حەز ناکا، نەک هەر من، بەڵکوو، هیچ کەسێکی دیکەش، بە شێوەیەکی باش، لە سەر « بارزانیی » بنووسێ و داکۆکیی لێ بکا! 4*

* * *

---

**تێبینیی :**

* فمن دخل بيت ابو سفيان فهو امن.

1* لەو بارەیەوە، گوتارێکی درێژم بلاوکردۆتەوە « ڕێککەوتننامەی 11ی مارسی 1970 و چەن پەندێکی مێژوویی »، ئەوی دەیەوێ، پتر لە مەبەستەکەم بگا و بزانێ، با، تەماشای ئەرشیفی نووسەر بکا!

2* قوه غير نظاميه.

3* زۆر باشم لە بیرە، « حەمەسەعید »، جگە لەوەی، ئەو گوتارە خراپەی، لە پێشەکیی ئەو پەرتووکە قەبەیەدا بلاوکردۆتەوە، کە لە سەر ڕەوانشاد « عوسمانی قادر منەوەر » نووسراوە، لە بارەگەی « پارتیی »ش لە شاری « ستۆکهۆڵم »، لە یادی چلەی کوڕی گەڕەک، هاوڕێی

منداڵیی و قوتابخانەم « خاڵە عـــەفان »دا، جارێکی دیکە خوێندیەوە. ئەو ڕۆژە، من و کاک « خەسرەوی حەمەی محە »ش لەوێ بووین، کاتێ ئەوەمان گوێ لێ بوو، هەستاین و هۆڵەکەمان جێهێشت! سەیر ئەوەبوو، ئەو ئەندامە زۆر کوردانەی « پارتیی »، سەری ڕەزامەندییان بۆ دەلەقاند و ئەو قسانەی گوتارخوێنەرەوەیان لا پەسەندبوو! قووڕ بە سەر هەر دوو « بارزانیی » بارک و کـوڕ، گەر ئەندامی وایان هەبێ، قسـەی چاک و خـراپ، لە یەکـدی جیـا نەکـەنەوە، نەزانن، « حەمەسەعید » بۆ چ مەبەستێکی تایبەتیی، ڕەخنەی لەو سەرۆکە گەورەیە گرتووە!

4* وا دەردەکەوێ، « حەمەسەعید » ئامادەبێ، هاوکاریی لەگەڵ ئەهریمەنیشدا بکا، بە مەرجێ، « یەکێتیی » تووشی نووشووستیی بێ، یا نەمێنێ! جا وەنەبێ، ئەمەشی شاردبێتەوە و لە دڵی خۆیدا، دژایەتیی هەموو شتێکی چاک و خراپی « یەکێتیی » کردبێ، بەڵکوو، چەندین ساڵە، چ بە قـسـە، چ بە نووسین، چ بە کردەوە، چ بە نهـێنیی و چ بە ئاشکرا، لەو بوارەدا، ڕاڵەیەکی زۆری دوژمنانی « یەکـێتیی » کـردووە و دژیان وەسـتـاوە. چونکە، ئەوەی « یەکـێتیی » پێی پەستە، « حەمـەسـەعـید » پێی مەستـە! هەڵبـەتە، چەن جارێکیش، هێندێ شتی لای خۆم باسکردووە، بەڵام، ئێـرە جێی ئەوە نییـە، بیـانـنووسـم و جارێ کـاتی ئەوە نەهاتووە، ئەو فـایلە قەبەیەی هەڵدەمەوە!

ج گەر « حەمەسەعید » بێلایەن بووایە، بە تەواویی، سەنگەری دوژمنایەتیی لە « یەکێتیی » نەدەگرت، لە هەموو بۆنەیەکی « پارتیی »دا، بانگ نەدەکرا! پێوەندییـەکی باشـیشی، لەگەڵ لێپرسراوانی « پارتیی » و دەزگەی « پاراستن »دا نەدەبوو، لە سەر حسێبی ناکۆکیی نێوان خۆی و سەرانی « یەکێتیی »، سووکایەتیی بە کەسانی « بێلایەن، نیشتمانپەروەر، ڕامیار، زانا، نووسـەر و هونەران »ی کورد نەدەکرد، پلاری لە خەڵکیی نەدەگرت، فرمانی دەر نەدەکرد، کێ چی بنووسێ و لە کوێ بنووسێ! پێنووسەکەی، کەسێتیی تایبەتیی ڕاو نەدەنا، هەستی مرۆیی و ڕێزی خـۆی، لە ناخـدا نەدەتاسـاند، بە هەمـوو لایەکـدا، پەلی نەدەکـوتا و پەلامـاری هەمـوو کـەسـێکی نەدەدا! سەیر ئەوەیە، خـۆشی نازانێ، چی دەوێ؟ بۆ وا دەکا؟ ئەم نووسـینانەی، لە ڕاڵەی کێ دایە؟ ئاخر، کەس دیوێتی، نووسەرێ هەبێ، پتر لە چارەکە سەدەیە، پەلاماری خەڵک بدا و بێزار نەبێ؟!! لەگەڵ ئەوەشدا، وەک دەڵێن: قسەی « حەمەسەعید »، وەک قوڕوچڵپاوی زستان وایە، دەرلنگی شرواڵی هەموو کەسێ پیسدەکا، بەڵام، لە نوێژی نایا!!!

× ڕاستیی ئەم بۆچوونانەشم، پتر دەرکەوت، کاتێ، لێپرسراوانی « پارتیی »، بە تایبەتیی، بانگهێشتیان کرد بۆ « هەولێر » و خەلاتیان کرد!

## سـەرچاوە :


1. ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی یەکەم.
2. حوسێن محەمەد عەزیز، ململانێی ئایدۆلۆژی لە کوردستاندا، چاپ2، لە بڵاوکراوەکانی کبتاب هەرزان، سوید، 1995.
3. حەمەسەعید حەسەن، جەلالینامە، چاپی1، چاپخانەی هەڵەبجە، سوید، 2004.
4. قانع، ژیان و شیعرەکانی، برهان قانع کۆیکردۆتەوە و سەرپەرشتی چاپکردنی کردووە.

# دەردی نۆکەریی

بە ڕاستیی، هەستی بیانیپەرستیی و دەردی خۆ بە نۆکەر زانین، دوو نەخۆشی ترسناک و گەورەن، تووشی هەر گەل و نەتەوەیەکی بندەس بن، جگە لەوەی، هەستی نەتەوەییان دەتاسێنن، دەماری نیشتمانپەروەرییان سڕ دەکەن، لە خۆشەویستیی ڕۆڵەکانی گەل و نەتەوەکەیان کەمدەکەنەوە، لە ڕێزی خاکی نیشتمانەکەی خۆشیان دووریاندەخەنەوە.
ئەم نەخۆشییە سەختە کوشندەیە، بە جۆرێکی وا، کار لە مرۆی بیانییپەرست و نۆکەر دەکا، خۆی بە هاوولاتی نیشتمان و دەوڵەتێکی دیکە بزانێ. بۆیە، لەو کاتانەدا و لای ئەو جۆرە مرۆڤانە، هیچ جیاوازییەکی نییە، گەر گیانی خۆیان بۆ ئەو دەوڵەتە بیانیی و داگیرکەرانە بەختکەن، بەڵکوو، شانازیی پێوە دەکەن و قوربانییشی بۆ دەدەن!
ئەم پەتایە، پتر لەو دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانانەدا دەردەکەوێ و پەرە دەسێنێ، کاتێ، گەلێ یا نەتەوەیەکی سەردەس، بە هەموو شێوەیە هەوڵدەدا، مافەکانی گەل و نەتەوەکانی دیکەی بندەسی خۆی زەوتکا. لەبەرئەوە، ڕێزیان لێ ناگرێ، ئازادیی و مافی ژیانیان پێ ڕەوا نابینێ. زاراوەی برای گەورە و بچووک دادەتاشێ، تا، مێشکی ڕۆڵەی گەل و نەتەوە بندەسەکانی خۆی پێ سڕکا!
جا، هەر بە ڕاستیی، هێندەی نەتەوەی کورد، ڕەگی کولیی دەردی نۆکەریی و هەستی چەپەڵی بیانیپەرستیی تێدا هەیە، باوەڕ ناکەم، هیچ نەتەوەیەکی دیکە لەم جیهاندا هەبووبێ و هەشبێ، بەو شێوەیەی کوردی لێ قەوەمابێ. ئاخر بۆیە، ڕۆژی بەم ڕۆژەڕەشە گەیشووە و تا ئێستە، خاوەنی پەرژینی باخی ژیانی نەتەوەیی خۆی نییە!

جا گەر، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، ئەو هەستە خراپەیان نەبووایە، ئایا، شانازییان بە هاوولاتیتیی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « توورکیا، ئێران، عێراق و سووریا »وە دەکرد؟!! ئایا، لە ڕیزەکانی سوپای ئەو دەوڵەتانەدا، ڕاژەی سەربازییان دەکرد؟!! ئایا، لە بەرەکانی جەنگدا، چەکیان بۆ دوژمنە د گیرکەرەکەی خۆیان هەڵدەگرت، گیانی خۆیان وا بە هەرازان، پێشکەش بە سەرانی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی « کوردستان » دەکرد؟!! ئایا، ئەو هەموو زۆرداریی و چەوساندنەوەیەیان قەبووڵدەکرد؟!! بە ڕاستیی، ئەوەی لە کورد ڕوویداوە، لە هیچ نەتەوەیەکی دیکە نەقەوماوە! با لێرەدا، هێندێ نموونە، لە سەر کاری تیرۆریستیی ئەو عەرەبانە، دژی کورد بێنینەوە:
ڕۆژی « 2004. 06. 17 »، تێلێڤیزیۆنی « Kurdsat » ڕایگەیاند، گوایە: پێنج کوردی هەژاری نەگبەت، پێنج کوردی هەست و هۆشی نەتەوەیی لاواز، لە شاری « کەرکووک »ەوە، بەرەو شاری « بەغدا » ملیاننناوە، تا، لە ڕیزەکانی سوپای دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »ی نوێدا وەرگیرێن و ڕاژەی سەربازیی بکەن! لە ڕێ، تووشی چەن تیرۆریستێکی عەرەب بوون، کاتێ زانیویانە، کوردن و خەڵکی شاری « کەکرکووک »ن، یەکسەر، هەر پێنجیان گوللەباران کردوون، جەستەکانیان لەتوکوتکردوون و شێواندوویانن. پاشان، سووتاندوویانن و هەموویان لە چاڵێکدا شاردوونەتەوە.
ڕۆژی « 2004. 08. 18 »، لاوێکی دیکەی خەڵکی شاری « کەرکووک »یان، لە شارۆچکەی « دوبز » کوشتووە!
جگە لەوەی، ئەمە یەکەمین جار نییە و دوایەمین جاریش نابێ، عەرەبەکان کوردی « کەرکووک » دەکوژن. دیارە، ئەمە ڕێککەوتیش نییە، بەڵکوو، بەپێی نەخشەیەکی دیارییکراو، ئەو کارە تیرۆریستانانە ئەنجامدەدەن. چونکە، باش دەزانن، نەک هەر کوردەکانی شاری « کەرکووک »، بەڵکوو، هەموو کوردی جیهان، نە خاوەنێکی ڕاستەقینەیان هەیە، نە کەسێکیش هەیە، لە سەریان هەڵباتێ! *
جا، با « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، هەر خەوی سەوز و سووری خۆش، بە برایەتی درۆزنانەی، نێوان هەر دوو گەلی کوردی بندەس و عەرەبی سەردەسەوە ببینن! با، هەر بڵێن: کێشەی « کەرکووک »، بە شێوەیەکی ئاشتییخوازانە چارەسەردەکەین! ئاخر، چارەسەرکردنی کێشەیەکی دیارییکراو، بە شێوەیەکی دیمۆکراسییانە و ئاشتییخوازانە، کاتێ دەبێ، کە دوژمنەکەی بەرانبەر، باوەڕێکی تەواوی، بە دیمۆکراسیی و ئاشتیی هەبێ! بەڵام، نە عەرەبەکان و نە توورکمانەکان، هەرگیز نەیانشاردۆتەوە و

ناشیشارنەوە، چارەی کوردیان ناوێ و ئەو خاکەش بە « کوردستان » نازانن. بەڵکوو، هەر یەکێ لەو دوو گرووپە ئیستنیکە، بە خاکی خۆیانی دەزانن! بە ڕاستیی، کورد خاوەنی ئەو دوو سەرکردە « جوامێر » ە بێ، دەبێ، تا ماوە، هەر « فەتەڕۆ »، بۆ نێوچە بەعەرەبکراوەکانی « باشووری کوردستان » بچڕێ! ئەز، وەک کوردێکی دوورە وڵات، ئەو کارەم پێ ناخۆشبوو. چونکە، پێنج کوردیان بە خۆڕایی کوشتووە، ماڵ و منداڵیان لە پاش بەجێماوە، ڕووداوێکی پڕ لە خەم و تیرۆریستانەش بوو. بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، یەک تۆزقاڵ، هەستی تووڕەبوونم نەجـــــووڵا و ناشجوڵێ. هەرچەندە، پارت و ڕێکخراوە « کوردستانیی »یەکان، نارەزایی خۆیان دەربڕی، تووڕەبوونی خۆیان پیشاندا و بە شانازییشەوە باسیاندەکرد، گوایە: کورد داکۆکیی لە سەربەخۆیی و سەرومریی خاکی « عێراق » دەکا!

ئەز نامەوێ، هەستی خۆم بشارمەوە و زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: هەر وەک چۆن، هیچ کوردێکم بە شەهید نەزانیوە، گەر لە ڕیزەکانی سوپای یەکێ، لە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان » بە گشتیی و « عێراق » بە تایبەتیی کوژرابێ. یا، ئەوانەی لە جەنگی نێوخۆی نێوان پارتەکانی « کوردستان »دا کوژرابن، بە هەمان شێوەش، هەر کوردێ، لە پێناوی داکۆکیکردن، لە خاکی دەوڵەتێکی داگیرکەری « کوردستان »دا بکوژرێ، لە پێناوی گەڕانەوەی دەسەلات و سەرومریی بۆ « عێراق » تێدابچێ، نە شانازییان پێوە دەکەم و نە بە شەهیدی کوردیشیان دەزانم. چونکە، کورد لە مێژە گوتوویەتی: « تا ماڵ وەستابێ، مزگەوت حەرامە! »

* * *

---

* ئەم پێشبینییە، بە زیادەوە هاتەدی. چونکە، کەم ڕۆژ هەیە، عەرەبە داگیرکەرەکان، هەر وا بە خۆڕایی، ڕۆڵەیەکی کورد نەکوژن. هەر بۆ نموونە: ڕۆژی « 2004. 11. 03 » دوو کـــوردی خەڵکی « کەرکووک »، سەردانی شاری « موسڵ »یان کرد، کوژران.

بە کورتیی: لەو ڕۆژەوە، « بەعس » دەســـەلاتی لە « عێراق »دا نەماوە و ڕوخاوە، تا، ڕۆژی « 2005. 01. 01 »، جگە لەوەی، چەندین کوردیان فڕاندووە و کوشتووە، هەر بە سەربڕین، « 132 » کوردیان سەربڕیوە! تیرۆریستە ئیسلامییەکان و پاشماوەی هێزەکانی « بەعس »، دژی ڕۆڵەکانی گەلی کورد یەکیانگرتووە، کوردیان بە « گاوور » داناوە و بڕیاری قەلاچۆکردنیان داوە!

# وڵات،
# دەوڵەت
# و
# میریی!

پێشەکیی دەبێ، ئەوە باش بزانین، جیاوازییەکی گەورە، لە نێوان هەر سێ زاراوە گرنگەکانی جوگرافیا و ڕامیاریی وەک: « وڵات **Country**، دەوڵەت **State** و میریی **Government** »دا هەیە. چونکە، زۆر جار، گوێم لێ بووە، هێندێ کورد گوتوویانە: ئێمە « وڵات »مان نییە. منیش، یەکسەر تێگەیشتووم، مەبەستیان ئەوەبووە، کورد « دەوڵەت »ی نییە و بۆم ڕاستکردوونەتەوە.

لە ڕاستییدا، « وڵات » وەک زاراوەیەکی جوگرافیایی، پێوەندیی بە خاکەوە هەیە، [illegible] دەکرێتەوە، کە کۆمەڵێکی ئێتنیی دیارییکراو، لە [illegible]ی دەژین. بەڵام، « دەوڵەت » پێوەندیی بە سنووری وڵات و تاڵای نەتەوەیی دانیشتووانی دەوڵەتەکەوە هەیە، دەبێ، لە نێو دەوڵەت و دەزگە نێو دەوڵەتییەکانی جیهانیشدا، دانی پێدا بنرێ. کەچی، « میریی » پێوەندیی بە کابینەیەکەوە هەیە، کە لە سەردەمە جیاجیاکانی فەرمانڕەوایی دەوڵەتێکی دیارییکراودا دروستدەکرێن، هەر چەن ساڵ جارێکیش دەگۆڕدرێن و کابینەی دیکەی نوێیان، لە جێ دادەمەزرێ. لە کاتێکدا، « وڵات » هەرگیز ناگۆڕدرێ و « دەوڵەت »یش، لە چاو « میریی »دا، کەمتر دەگۆڕدرێ.

بۆ نموونە: « کوردستان »، وولاتی نەتەوەی کوردە. بەڵام، تا ئێستە، لە هیچ پارچەیەکی نیشتمانەکەیدا، نە دەوڵەتی سەربەخۆ و نە میریی یەکگرتووی نییە! هەروەها، وولاتی عەرەب، لە هەموو نیشتمانی عەرەبیی پێکهاتووە، وەک خۆشیان دەڵێن: « لە ئۆقیانووسەوە بۆ کەنداو » دەگرێتەوە. لە هەمان کاتیشدا، یەک دەوڵەتی یەکگرتوویان نییە، بەڵکوو، « 22 » دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان هەیە و هەر دەوڵەتێکیش تا ئێستە، چەندین میریی هەبووە!
هەروەها، جیاوازییەکی دیکەی گرنگ، لە نێوان هەر دوو چەمکی « دەوڵەت » و « میریی »دا هەیە، ئەویش ئەوەیە: لە رووی خەسڵەتەوە، چوونیەک نین. چونکە، خەسڵەتەکانی « دەوڵەت »، پتر لە چوارچێوەی فاکتەری جوگرافیادا دەردەکەون و خۆیان دەنوێنن. جگە لەوەی، « دەوڵەت » پێوەندییەکی توندوتۆڵیشی، بە سامانە سروشتییەکانەوە هەیە. بۆ نموونە دەڵێین: دەوڵەتێکی « شاخاویی، دەشتاویی، بیاباناویی، دەوڵەمەند، هەژار ... » ئەم خەسڵەتانەش، پتر لە خەسڵەتەکانی « وولات »ەوە نزیکترن.
بەڵام، « میریی » پتر، لە خەسڵەتەکانی « بیر، فەلسەفە، ئایدۆلۆژیا و رامیاریی »یەوە، پێناسە و نیشانەکانی خۆی وەردەگرێ. وەک ئەوەی بڵێین: میرییەکی « نیشتمانیی، نانیشتمانیی، تەکنۆکرات، سەربازیی، نەتەوەیی، کۆمۆنیست، کرێکاریی، جووتیاریی، پیشکەوتووخواز، کۆنەپەرست، دیمۆکراسیی، دیکتاتۆریی، فاشیی، نازیی ... »
لە هەمان کاتیشدا، پێوەندییەکی ئارەزوومەندانە، یا داگیرکەرانە، لە نێوان ئەو سێ چەمکەی « وولات، دەوڵەت و میریی »دا هەیە. واتە: چەن « وولات »ێ دەتوانن، بە ویست و ئارەزووی تایبەتیی خۆیان، لە نێو سنووری چوارچێوەی یەک « دەوڵەت »دا کۆببنەوە و یەک « میریی » هاوبەش دامەزرێنن، وەک لە دەوڵەتە سۆسیالیستەکاندا هەبوو. بۆ نموونە: « یەکێتیی سۆڤێت »، لە دەیان « وولات »ی جیاواز پێکهاتبوو، هەموویان، لە چوارچێوەی یەک « دەوڵەت »ی یەکگرتوودا کۆببووبوونەوە و یەک « میریی » هاوبەشیشیان دروستکردبوو.
یا، دەوڵەتێکی گەورەی بە توانا، چەن « وولات »ێ داگیردەکا، بێ ئەوەی، دانیشتووانەکانیان بیانەوێ، ئەو نیشتمانانە، بە رەورەوەی « دەوڵەت »ەکەی خۆیەوە دەبەستێتەوە و یەک « میریی »ش، فرمانرەوایی هەموویان دەکا. بۆ نموونە: هەموو ئەو ئیمپراتۆریا گەورانەی، لە مێژوودا هەبوون، وەک: « رووسیا، ئەڵمانیا، نەمسا و مەجەر، عوسمانیی ... »، چەندین « وولات »ی جیهانیان داگیرکردبوو، ئەو وولاتانەش، بە بەشێ لە خاکی ئەو ئیمپراتۆرانە دەژمێرران و لە لایەن ئیمپراتۆر خۆیەوە، بەڕێوەدەبران!

ئیجا، با لێرەدا، کەمێ لە « دەوڵەت » بدوێین و بزانین، چەن جۆرە دەوڵەت هەیە؟
هەڵبەتە، هەر لەو کاتانەوە، بیرۆکەی دەوڵەت درووستبووە و یەکەمین دەوڵەت لە مێژوودا دامەزراوە، گەلێ شێوەی جیاواز پەیدابووە. هێندێکیان تێداچوون و نەماون. هێندێکی دیکەشیان، تا ئەورۆ زیندوون و ماون. بەلام، بە شێوەیەکی گشتیی، لە باری سەرنجی پێکهاتەی ئیتنیک و هەڵکەوتی جیۆپۆلیتیکەوە، دوو جۆرە دەوڵەت هەیە:
1. دەوڵەتی نەتەوەیی « ناسیۆنال »:
هەموو ئەو دەوڵەتانە دەگریتەوە، کە یەک گەل، یا، یەک نەتەوەی دیارییکراو، لە سەر خاکەکەی دەژی. لە ڕاستییدا، بەشێکی کەمی دەوڵەتەکانی جیهان، لە دەوڵەتی « ناسیۆنال » پێکهاتوون. بۆ نموونە: « کوێت، لیبیا، دانمارک، گرێک، ئەڵمان... »
2. دەوڵەتی فرەنەتەوە و نیشتمان « تێریتۆریال »:
ئەم جۆرەیان، بە پێچەوانەی جۆری یەکەمەوە، لە چەن گرووپێکی ئیتنیکی جیاواز و چەن نیشتمانێکی جیاجیای تایبەتیی پێکدێ. زۆربەی هەرە زۆری دەوڵەتەکانی جیهان، بە دەوڵەتی « تێریتۆریاڵ » دادەنرێن. بۆ نموونە: هەموو دەوڵەتەکانی « توورکیا، ئێران، عێراق، سووریا، ڕووسیای فیدراڵ ... »، چەن دەوڵەتێکی « تێریتۆریاڵ » پێکدێنن.
بەلام دەتوانین، بە شێوەیەکی گشتیی، هەموو ئەو جۆرە دەوڵەتانەی، هەر لە سەرەتای درووستبوونیانەوە هەبوون، تا ئەورۆ، بە چەن جۆرێ دەستنیشانکەین. بۆ نموونە:
أ. دەوڵەتی نیشتمانیی یەککگرتوو:
چەمکە کلاسیکییەکەی، خۆی لە ڕەگەزەکانی « گەل، خاک، میریی و سەروەریی »دا دەنوێنێ. ئەم شێوە دەوڵەتە، لە هەموو شێوەکانی دیکە، لە جیهانی ئەورۆدا بلاوترە و هەیە. مەرج نییە، لە دەوڵەتێکی « ناسیۆنال »ی خاوێن پێکهاتبێ، بەڵکوو دەشێ، لە دەوڵەتێکی « تێریتۆریاڵ »یشدا خۆی بنوێنێ.
2. ئیمپراتۆریاکان:
ئەمەش خۆی لە خۆیدا، بە ڕژێمێکی ڕامیاریی گەورە دادەنرێ و لە سەروو « دەوڵەتی نیشتمانیی یەککگرتوو »وە دێ. گومانی تێدا نییە، بە دەوڵەتێکی مەزنی « تێریتۆریاڵ » دەژمێررێ.
3. زانکۆ:

چەن دەوڵەتێکی سەربەخۆ، خاوەن دەسەلات و سەروەریی دیارییکراوی سەر بە یەک نەتەوە، بە ئارەزووی خۆیان، لە ژێر چەتری دەزگەیەکی نەتەوەیی تایبەتییدا کۆدەبنەوە، بەرنامەیەکی هاوبەش، بۆ کاری « نەتەوەیی، رامیاریی، ئابووریی، کەلتووریی ... » دادەنێن و پێڕەویدەکەن. وەک « زانکۆی دەوڵەتە عەرەبیی »یەکان.

4. دەوڵەتە هاوپەیمانەکان « بلۆک »:

چەن دەوڵەتێکی جیاوازی سەربەخۆی، سەر بە چەن نەتەوەیەکی جیاواز کۆ دەبنەوە، لە بەر رۆشنایی فەلسەفە و ئایدۆلۆژیایەکی دیارییکراودا یەکدەگرن، دەزگەیەکی نێونەتەوەیی دادەمەزرێنن و دژی بلۆکەکانی دیکەی بەرانبەر دەوەستن. ئەم جۆرە گەلەکۆمەکییەی ئەم دەوڵەتانە، پتر لە بواری سەربازییدا خۆیان دەنوێنن. ئامانجی سەرەکییان ئەوەیە: دوژمنەکانیان گەمارۆبدەن و نەیەڵن، ئایدۆلۆژیاکانیان بڵاوبێتەوە و خۆشیان دەسەلات پەیداکەن. داکۆکیی لە ئەندامانی ئەو بلۆکە دەکەن و بەرژەوەندیی ئابووریی خۆیان دەپارێزن. هەر وەک بلۆکی « ناتۆ »، سالی « 1949 » بە سەرکردایەتیی « ئەمێریکا » دامەزرا و هێندێ لە دەوڵەتەکانی دیکەی بەرەی خۆراوای، لە خۆی کۆکردۆتەوە. هەروەها، سالی « 1955 »یش، بلۆکی « وارشۆ » درووستبوو، لە « یەکێتی سۆڤێت » و دەوڵەتە سۆسیالیستەکان پێکهاتبوو. هەرچەندە، ئەم بلۆکەی دوایییان هەڵوەشاوەتەوە، بەلام، تا ئێستە، بلۆکی « ناتۆ » هەر ماوە و زۆر بەهێزتریشبووە!

جگە لەو دوو بلۆکەش، « رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیی » و « رێکخراوی دەوڵەتە بێلایەنەکان »یش هەن. بەلام، دەسەلاتێکی سەربازیی ئەوتۆیان نییە!

5. دەوڵەتی یەکێتی کۆنفیدراڵیی:

چەن دەوڵەتێکی سەربەخۆ، لە یەکێتییەکی « کۆنفیدراڵیی »دا یەکدەگرن، تا، بەرنامەی کاری رامیاریی، دیپلۆماسیی و داکۆکییکردن لە وولات، پێکەوە دارێژن و لەو بوارانەدا، هاوکارییەکی تەواوبکەن. وەک « سویسرا »، لە کۆندا، دەوڵەتێکی « کۆنفیدراڵیی » بوو.

6. رێکخراوی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان:

ئەمەش، بە نوێترین دەزگەی نێو دەوڵەتیی دەوڵەتەکانی جیهان دەژمێررێ. هەموو یا زۆربەی دەوڵەتەکانی جیهان، لە دەزگەیەکی تایبەتییدا کۆدەبنەوە، بەپێی بەرنامە و دەستوورێکی دیارییکراو، هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکدی و لە تەک رووداوە جیهانییەکاندا دەکەن. ئەورۆش، ژمارەی دەوڵەتەکانی ئەندام، نزیکەی « 200 » دەوڵەت دەبن.

ئینجا، گەر لە بەر ڕۆشنایی ئەو جۆرە دەوڵەتانەی سەرەوە و لە ڕوانگەی جیۆپۆلیتیکەوە، سەرنجێ لە دەوڵەتی « عێراق » بدەین، ئەوا دەبینین: بە دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمان دەژمێررێ. واتە: لە دوو وڵاتی جیاوازی وەک: « باشووری کوردستان » و « عەرەبستانی عێراق » پێکهاتووە، دوو گەلی سەرەکیی وەک « کورد » و « عەرەب »، چەن کەمینەیەکی نەتەوەیی وەک: « توورکمان، ئاشوور، ئەرمەن و کلدان »ی تێدا دەژی، بێ ئەوەی، پرس بەو گروپە ئێتنییانە کرابێ، پێکیانەوە گرێداون. بەڵام، هیچ ڕێکخراو، پارت و دەوڵەتێکی عەرەبیی نییە، دان بەم ڕاستییەدا بنێ. بەڵکوو، « عێراق » بە خاک و دانیشتووانەکەیەوە، بە بەشێ لە نیشتمان و نەتەوەی عەرەب دادەنێن. ئا لێرەوە دەبێ، لە هەموو کێشەکان بڕوانین، چونکە، هەر لێرەوە، گرفتە گەورەکەی کورد دەستپێدەکا!

ئێستەش، کاتی ئەوە هاتووە، چەن پرسیارێ، ئاراستەی ڕۆڵەکانی کورد و سەرکردەی پارتەکان بکەم، بابەتێ بۆ دەمەتەقێ بورووژێنم و بڵێم:

ئایا، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد بە گشتیی، گەلی کورد لە « باشووری کوردستان » بە تایبەتیی، بیر لە چ جۆرە دەوڵەتێ دەکەنەوە، لە ئاییندەدا دایمەزرێنن؟!!

ئایا، سەرانی کورد، کەی ئەم ژنە سۆزانییەی دەوڵەتی « عێراق » بەرەڵڵا دەکەن و لێی جیادەبنەوە؟!!

ئایا، کەی بە تەواویی، دەس لە ملانی بووکی سەربەخۆیی و ئازادیی « کوردستان » دەبن؟!!

ئینجا، بۆچی و چۆن، تا نەتەوەی کورد، لە چوارچێوەی ئەو چوار دەوڵەتە داگیرکەرانەدا بمێنێتەوە، نە هیچی دەسدەکەوێ و نە گرفتەکانیشی بۆ چارەسەر دەکرێ، ئەوەیان با بمێنێ و لە کۆتاری داهاتوودا، دوو قسەی لە سەر دەکەین!

* * *

---

* دوکتۆر عبدالوهاب حمید رشید، العراق المعاصر، السوید، 2001، ل 15-20.

# پۆست
# و
# دەسەڵاتی ڕامیاریی

هێندێ کەس پێیان وایە، گەر کوردێ، لە پۆستێکی گرنگی میریی « عێراق »دا بەشدارییکرد، ئیدی، هەموو شتێ تەواوبووە و مافی کورد وەرگیراوە! بەڵام، لە ڕاستییدا، تا ئەو دەوڵەتە، لە نێو نێوەندی دەوڵەتە عەرەبیی، جیهانیی و دەزگە نێو دەوڵەتییەکانی دیکەدا، بە دەوڵەتێکی « عەرەبیی » بناسرێ، تەک چەن پۆستێکی شالیارگەکان، بەڵکوو، گەر هەر دوو پۆستی سەرکۆماریش و شالیارانیش، بە کورد بدرێ، هیچ لە باسەکە ناگۆڕێ! چونکە، لە هەموو شتێ گرنگتر ئەوەیە: لە دەستووری هەمیشەیی ئەو دەوڵەتەدا، چی دەنووسرێ؟!! ڕۆڵەی ئەو دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانە، چۆن لە دەوڵەتەکە دەبوانن و لە بواری نێو نەتەوەییشدا، بە چ شێوەیە، هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو میرییەدا دەکرێ؟!!

گەر دەوڵەتی « عێراق »، بە دەوڵەتێکی نێوکۆیی نێوان، هەر دوو گەلی سەرەکیی « کورد » و « عەرەب » نەژمێررێ، ئەوا، گەر زۆربەی کابینەکانی شالیارگەکان، هەر دوو پۆستە گرنگەکەی سەرۆک کۆمار و شالیارانیش، بەر کورد بکەوێ، هیچ جۆرە بایەخێکی نابێ. چونکە، جگە لەوەی، دەوڵەتەکە دەوڵەتێکی کوردیی نییە و هەموو ئەو کوردانەی، لەو دەوڵەتەدا پۆست وەردەگرن، ڕاژەی دەوڵەتێکی عەرەبیی دەکەن، لە هەمان کاتیشدا، هەموو ئەو پۆستانە، شتێکی کاتین و دەگۆڕێن، کاتێ کابینەیەکی نوێ دادەمەزرێ، دەتوانرێ، یەک کوردی تێدا نەبێ، یا، هەر بۆ ناو، چەن کوردێ دانێن، بەڵام، ڕێزیان لێ نەگیرێ، هیچ دەسەڵاتێکیان نەبێ و نەتوانن، ڕاژەی گەلەکەی خۆیان بکەن، وەک چەندین جار، لە مێژووی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا ڕوویداوە! هەر بۆ نموونە: « تەها محێدین مەعرووف »، جێگری سەرۆک

کۆماری « عێراق » بوو، بەڵام، جگە لەوەی خۆفرۆشبوو، ناپاکیی لە گەل و نیشتمانەکەی کردبوو، ڕاژەی نەتەوەی عەرەب و پارتێکی نەتەوەیی فاشیی وەک: « بەعس »ی دەکرد، سەربازێکی عەرەبی « بەعسیی »، ڕێزی لەو پتربوو و پتریش دەستی دەرۆی! یا، وەک هەموو ئەو کوردانەی، هەر لە سەرەتاوە، بەشدارییان لە دامەزراندنی دەوڵەتی « عێراق »دا کردووە، چ قازانجێکیان بە کورد گەیاندووە؟!! ئاخر، چەندین کوردی خاوەن بەهرە و بە توانای وەک: « محەمەد ئەمین زەکیی، تۆفیق وەهبیی، بەکر سدقیی ... »، لە سەردەمە جیاجیاکانی دەسەلاتی میریی « عێراق »دا، شالیار و سەرۆک شالیاران بوون، چییان پێ کراوە؟!! چییان لە باری ژێردەسیی و چەوساندنەوەی کورد گۆڕیوە؟!!

جا ئەوڕۆ، نیگەرانیی هەر دوو سەرکردەی پارت « بارزانیی » و « تاڵەبانیی » لەوە دایە، گوایە: دەبووایە، یەکێ لەو دوو پۆستە گرنگە بە کورد بدرایە! ئایا، هەر یەکێ لەو دوو سەرکردەیە، گەر سەرۆک کۆمار، یا سەرۆک شالیارانیش بوونایە، جگە لەوەی، دەسکەوتێکی تایبەتییان بۆ خۆیان مسۆگەردەکرد، لافی سەرۆکیان لێدەدا، چ جۆرە دەسکەوتێکی گرنگ و نوێیان، بۆ گەلی کورد لە « باشووری کوردستان »دا بەدیدەهێنا؟!! ئایا دەیانتوانی، بە فرمانێکی کۆماریی، هەموو پارێزگەی « کەرکووک » و نێوچە بە عەرەبکراوەکانی دیکەی « باشووری کوردستان »، بۆ کورد بگەڕێننەوە؟!! گومانی تێدا نییە، گەر بڕیارێکی وایان بدایە، هەر زوو، دەریاندەکردن، یا لەنێویاندەبرن، وەک چۆن، ساڵی « 1937 »، عەرەبە نەتەوەییە شۆڤێنیستەکان، سەرۆک شالیارانی « عێراق » ژەنەراڵ « بەکر سدقیی »یان، بە ڕۆژی نیوەڕۆ، لە نێو شاری « مووسڵ »دا کوشت! جا با ئێدی، هەر دوو سەرکردە، « کاکە » و « مامە »، خەفەت بۆ یەکێ لەو دوو پۆستە نەخۆن، بەس نییە، سەریان سەلامەتە!

ئەز لەو باوەڕەدام، گەر یەکێ لەو دوو سەرکردەی پارتە، یەکێ لەو دوو پۆستە گرنگەیان پێ بسپێررایە، نەک هەر نەیاندەتوانێ، هیچ شتێ بۆ کورد بکەن، نەوەک دڵی برا عەرەبەکانیان لێ بیەشێ و پێیان بڵێن: « کاکە حەمە !»، پۆستەکەی خۆی، بۆ ڕاژەکرنی کورد بەکاردێنێ و برا عەرەبەکانیشی پشتگوێخستووە! بەڵکوو، دەسەلاتێکی ئەوتۆشیان نەدەبوو. چونکە، بە دەیان سیخوڕ و چاودێری عەرەبیان، بەسەرەوە دادەنان و دەوڵەتە عەرەبییەکانیش، ڕێیان نەدەدا و هەرگیز ڕێش نادەن، سەرۆک کۆمار، یا، سەرۆک شالیارانی « عێراق » کوردبێ. ئاخر، کەس بیستوویەتی، سەرۆکی دەوڵەتێکی عەرەبیی، عەرەب نەبێ، چونکە، ئەوان « عێراق »، بە دەوڵەتێکی عەرەبیی دەزانن؟!!

جگە لەوەی، هەر دوو سـەرکـردە، « بارازانیی » و « تاڵەبانیی »، پتـر لە عەرەبەکانی « عێراق »، خۆیان بە « عێراقیی » دادەنا و « عێراقچێتیی »یەکی هێندە خەستوخۆڵیشیان دەکرد، خورەی نەهاتایە! بە شێوەیەکیش، ڕاژەی گەلی عەرەب و کۆماری « عێراق »یان دەکرد، عەرەبەکان خۆیان نەیانکردایە، تا، دڵی برا عەرەبەکانیان ڕازیکەن و ئەوانیش پێیان بڵێن: بە ڕاستیی، ئێوە بۆ دەوڵەتی « عێراق » و نەتەوەی عەرەب دڵسۆزن! چونکە، یەکێ لە خەسڵەتە هەرە دزێو و خراپەکانی نەتەوەی کورد، خۆی لە بیانییپەرستیی و نۆکەرییدا دەنوێنێ!

جا ئێستە، لە بەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستییانەی سەرەوەدا، وەک کوردێکی نەتەوەیی دیمۆکراسییخوازی بێلایەن، بۆم هەیە، بپرسم: دوکتۆر « ڕۆژ نووریی شاوەیس »، جێگری دووەمی سەرۆک کۆمار، دوکتۆر « بەرهەم ئەحمەد سالح »، جێگری دووەمی سەرۆک شالیاران، چ جۆرە دەسەڵاتێکیان هەیە؟!! ڕاژەی کام دەولەت و میریی دەکەن؟!! ئایا، ئەوەی دەیانەوێ، بۆ کوردی بکەن، دەتوانن، بەدییبێنن؟!! بۆچی دەبێ، بەرنامەکانی هەر دوو سەرۆک کۆمار و شالیاران، وەک ئامێرێکی ئەلکترۆنی جێبەجێکەن؟!! بۆ دەبێ، لەگەڵ باشترین بڕیاردا بن، کە بۆ نێوچەکانی « عەرەبستانی عێراق » بدرێ، بەڵام، لە ئاستی زۆر گرفتی وەک بەعەرەبکردن و چەسپاندنی سیستێمی « فیدراڵیی »دا، دەسیان لە « کەروێشک » کورتربێ؟!!

یا، ئەو پێنج شالیارەی دانراون، چ جۆرە دەسەڵاتێکیان هەیە؟!! چی بۆ کورد دەکەن؟!! خۆزگە دەمزانی، هەر دوو شالیاری مافی مرۆڤ و ژن، چی بۆ خەڵکی « عێراق » بە گشتیی و دانیشتووانی « باشووری کوردستان » بە تایبەتیی دەکەن؟!! ڕەنگە، سەرانی کورد، دڵیان خۆشبێ و بڵێن: دوو شالیارگەی گرنگمان بەرکەوتووە! بۆچی مافی مرۆ، نەک هەر لە « عێراق »، بەڵکوو، لە هەموو نێوچەکە و دەوڵەتە ئیسلامییەکانیشدا هەیە، تا شالیاری بۆ دانێن؟!! بۆچی زۆریەی هەرە زۆری خەڵکی « عێراق »، باوەڕیان بە مافی ژنان، یەکسانیی نێوان ژن و پیاو هەیە، تا شالیاریان هەبێ؟!!

ئاخر دەبێ، « وشیار زێباریی »، شالیاری دەرەوەی « عێراق »، نوێنەری کام گەل، دەوڵەت و میریی بێ؟!! بە ناوی کام گەلی « عێراق »ەوە قسەبکا؟!! بۆ کێ تێبکۆشی؟!! ئایا، لە کۆبوونەوەکانی « کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان » و دەزگەی « ئەنجوومەنی ئاسایش »دا، بە چ شێوەیە، باسی کوردی کردووە و لە ئاییندەشدا، چۆن داکۆکیی لێ دەکا؟!! ئاخر، « وشیار زێباریی »، کوردە و ئەندامی پەلیتبیرۆی « پارتی دیمۆکراتی کوردستان »یشە، کەچیی، لە هەمان

کاتیشدا، شـــالیاری دەرەوەی « عێراق »ە و بەشداریی لە کۆبوونەوەکانی « زانکۆی دەوڵەتە عـەرەبییەکان »یشدا دەکا، نەک هەر باسی کێشەی کورد ناکا، بەڵکوو، داوادەکا، « عێراق لە حەزیرەی عەرەبیی وەرگیرێتەوە! ».*

ئایا، « زێباریی » لە رێکخراوی « زانکۆی دەوڵەتە عـەرەبیی »یەکاندا، خۆی بە کـورد، یا بە عـەرەب دەناسـێنێ؟!! لە نێـو ئەو هەمـوو عـەرەبە چەنەبازە ناکۆکـانەدا، چی دەڵێ؟ چی دەکا؟ چی پێ دەکرێ؟!! تۆ بڵێـی، بوێرێ، ناوی کورد و مافەکانی بێنێ؟!! یا، لە کۆبوونەوەکانی شـالیارانی دەرەوەی عەرەبدا دەبێ، واز لە جـامـانە سوورەکەی خۆی بێنێ، چەفتە و عەگالی عـەرەبیی لە سـەر کـا؟!! ئاخـر، « زانـکۆ »یەک، « زانکۆی دەوڵەتەکـانـی عـەرەب » بێ، شـالیـارەکانی دەرەوەی عـەرەبیی تێدا کـۆبنەوە، گفـتوگـۆ لە سـەر گـرفـت و کێشەکانی عەرەب بکەن، کوردێکی بـێ دەسـەڵاتی وەک هەڤاڵ « زێباریی »، جگە لەوەی دەبێ، تەنیا گوێگربێ، چی دیکەی پێ دەکرێ؟!! چونکە، یا دەبێ، کوردبێ و لە سەر کێشـەی کورد هەڵبداتێ، ئەو کاتە عـەرەبەکان لێی قەبووڵ ناکەن. یا دەبێ، لە عەرەب عـەرەبتربێ، داکۆکیی لە کێشـەکانی عەرەب بکا و دژی دوژمنەکـانیـان بوەستێ! ئەگینا، لەو دەزگـە نەتەوەیـیـەی عـەرەبدا چی دەکا؟!! ئاخر، یەکێ لەو شتە هەرە گرنگانەی، نوێنەری دەوڵەتە عەرەبییەکان هەمیشـە، لە کۆبوونەوەکانی « زانکۆ »دا باسیدەکەن، ئەوەیە: یەکپارچەیی خاکی « عێراق » بپارێزن و مافی کورد نەدەن!

سـەیر ئەوەیە، دەبێ، شـالیـاری دەرەوەی « عـێـراق »، بە ناوی کـام گـەل و دەوڵەتەوە، داکۆکیی لە گەلی « فلەسـتین » و دژایەتیی دەوڵەتی « ئیسرایل » بـکا؟!! بـۆچی دەبـێ، دژی لەتوپەتکردنی خـاکی « سـۆدان » بوەسـتێ، لە کـاتێکدا، ئەو کـرووپە ئیـتنیکـانە نایانەوێ، پێکەوە بژین؟!! ئایا، ئەو جـۆرە کێشـانە، چ پێوەندییەکیان، بە گرفتی کوردەوە هەیە؟!! بۆچی دەبێ، هەڤاڵی شـالیـار هەوڵبدا و بکۆشێ، پێوەندیی « دیپلۆمـاسـیی، رامـیاریی، ئابووریی، کەلتووریی ... »، نێوان دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » و دەوڵەتەکانی عەرەب، ئیسلام و جیـهان رێکخاتەوە و کۆکیانکا، ئەوەش، بە ئەرکێکی پیرۆزی سەر شـانی « زانکۆ » و ئەندامـەکـانی دابنێ. بەڵام، هـەر هەمـان ئەو دەزگـەیە، پێوەندیی نێوان کورد و کورد، لە سەر ئاستی نەتەوەیی ئاڵۆزترکا؟!! بۆ دەبێ، داکـۆکـیی لە عـەرەبێکی دوورگـەی « واقلواق » بکا، بەڵام، بۆی نەبێ، باسی گرفتەکانی کورد، لە نێو چوارچێوەی هەر سـێ دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « توورکیـا، ئێـران و سـووریا »دا بکا؟!! ئەوەش، بە دەسـتێوەردان لە کـاری نێوخۆی، ئەو دەوڵەتانە دابنێ!

هەمووسان دەزانین، تا ئێستەش، دەوڵەتی « عێراق »، بە دەوڵەتێکی عەرەبیی دادەنرێ، جا، گەر « زێباریی » کوردە و عەرەب نییە، نوێنەری کام دەوڵەتە؟!! لە « زانکۆ »دا چی دەکا؟!! چونکە، ئەو دەزگەیە، دەزگەیەکی نەتەوەیی عەرەبیی ڕووت نەبێ، هیچ شتێکی دیکە نییە! لەبەرئەوە، بۆی نییە، نوێنەری دەوڵەتێکی عەرەبیی بێ و لە « زانکۆ »دا نوێنەرایەتیی عەرەب بکا!

گەر « عێراق »، دەوڵەتێکی عەرەبییش نییە، بە ئاشکرا، لە دەستووردا تۆماری دەکەن، دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمانە، ئەوا، ئەو کاتە دەبێ، دەوڵەتە فرەنەتەوەکە لە « زانکۆ »دا، نوێنەری هەر دوو گەلی سەرەکیی تێدابێ!

لەبەرئەوە، پێم وایە، شالیاری دەرەوەی هەرێمی « عەرەبستانی عێراق » دەبێ، عەرەببێ. نوێنەری میریی هەرێمی « کوردستانی فیدراڵ »یش کوردبێ، وەک ئەندامێکی چاودێر، لە « زانکۆ »دا بەشدارییبکا، ئاگای لە هەموو ئەو کێشە و بڕیارانە بێ، کە بە شێوەیەکی گشتیی، پێوەندیی بە « عێراق » و بە شێوەیەکی تایبەتییش، پێوەندیی بە « باشووری کوردستان »ەوە هەیە. هەر وەک چۆن، لەم دواییانەدا، هەر دوو دەوڵەتی « توورکیا » و « ئێران »، داوایانکردووە، وەک دوو ئەندامی چاودێر، بەشداریی لە کۆبوونەوەکانی « زانکۆ »دا بکەن و داوایان نەکردووە، وەک دوو ئەندامی ڕەسەن وەرگیرێن!

ئەمە بۆ؟ چونکە، دوو دەوڵەتی عەرەبیی نین. بەڵام، لەبەرئەوەی، لە لایەکەوە، بە دوو دەوڵەتی موسوڵمان دادەنرێن. لە لایەکی دیکەشەوە، دوو دەوڵەتی دراوسێی عەرەبن و لە نێوچەی خۆرهەڵاتی نێوەندا دەژین، تا لە نزیکەوە، ئاگایان لە گرفتەکانی نێوچەکە بێ، بەشداریی لە بڕیاردان و چارەسەرکردنیدا بکەن، یارمەتیی یەکدی بدەن و کۆمەک بە یەکدی بکەن، بە تایبەتیی، لە کێشەی کورددا دەتوانن، بەرەیەکی دژ بە کورد و مافە ڕەواکانی پێکبێنن! ئەگینا، گەر هەر بە تەنیا، لەبەرئەوە بووایە، دوو دەوڵەتی موسوڵمانن، ئەوا دەبووایە، هەموو دەوڵەتە موسوڵمانەکانی دیکەش، وەک ئەندام، لە « زانکۆ »دا بەشدارییانبکردایە!

بۆیە، زۆر سەیرم لێدێ، کاتێ، ڕۆژی « **2004. 06. 28** »، ڕێوشوێنی ڕاگەیاندنی میریی کاتیی « عێراق » بەڕێوەچوو، هێندەی دوکتۆر « ڕۆژ »، وەک « پیاوی تەنگانە و چارەسەری گرفتە سەختەکان »،# پێشکەش بە خەڵکی « عێراق » و جیهان کرا، هێندە، وەک دووەمین جێگری سەرۆک کۆمار، پێشکەش نەکرا و بایەخی پێ نەدرا!

سەیر ئەوەیە، دوکتۆر « ڕۆژ »، تا سەرۆک شالیاران و پەرلەمانی « پارتیی » بوو، لە کاتی جەنگی نێوخۆدا، هیچ ڕۆڵێکی گرنگی، بۆ گەل و نیشتمانەکەی

خـۆی نەدی، بۆ کـێشـەی گـەلەکـەی خـۆی، « پیـاوی تەنگانە » نەبوو، چارەسـەرێکی بنەبڕیی بۆ نەدۆزییەوە، بەڵکوو، تەنیا بۆ « پارت »ەکەی خۆی دەکۆشا. تەنانەت، بەشداریی لە جەنگەکەشدا کرد و بریندارییشبوو! واتـــە: « کوردایەتیی » نەدەکرد، بەڵکوو، « پارتایەتیی » دەکرد!
ئەوە جگە لەوەی، گوتاری هیچ یەکێ، لەو بەرپرسە عەرەبە « عێراقیی »یانە، بە هیچ شێوەیە، باسی برایەتیی نێوان هەر دوو گەلی عەرەب و کوردی تێدا نەبوو. کەچیی، کاتێ دوکتـۆر « ڕۆژ »، گوتارەکەی خۆی پێشکەشکرد، ئەو برایەتییـیـە مێـژوویییـە دەسکردە درۆزنانەیـەی « بریتـانیـای گـەورە »ی بیر نەچوو!
هەروەها دەبێ، گـەنجـێکی بە توانا و لێـهـاتووی وەک دوکـتــۆر « بەرهەم »، لەگەڵ سەرۆک شـالیـارانێکی کۆنە « بەعسیـی » و چەندین شالیاری عەرەبی شـۆڤێنیـستی بە خـوێنی سـەری کـورد تینـوو، چی پێ بکرێ؟!! ئایـا، بۆچی وازیهێنا و بۆچی گەڕایەوە؟!! تۆ بڵێی، بێ پرسی « تاڵەبانیی » توانیبێتی، وازبێنێ و پاشـــان بگەڕێتـــەوە؟!! من پێم وایە، نە وازهێنانەکـــەی و نە پەسەندکردنی پۆستەکەشی، هیچ دەسەڵاتێکی نوێی پێ نەبەخشیوە. چونکە، جگە لەوەی، عەرەبەکان دەیانەوێ، لە لایەکەوە، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، بیر لە سـەربەخـۆیی تەواو و دامـەزاندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی نەکاتـەوە. لە لایەکی دیکەشـەوە، دەوڵەتە لە کرێژنـە هەڵوەشـاوەکەی خـۆیان، بە پسپـۆڕ و پیـاوە بلیـمـەتەکـانی کـورد درووسـتکەنەوە! ئاخر، هەر لە سـەرەتای دامـەزراندنی دەوڵەتی « عێراق »یشەوە، چۆن لە کوردیان ڕوانیوە، ئێستەش، گەر خراپتر نەبێ، باشتر نەبووە و هەرگیز باشتریش نابێ! چونکە، نە ئایینی ئیسلام، نە کەلتووری عەرەب و نە بیری شۆڤێنیستی عەرەبییش، ڕێی ئەوە دەدەن، کورد سەربەخۆبێ و وەک گەلانی دیکەی جیهان، خاوەنی دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆی بێ! جا، مەگەر یەکێ خۆی بخەڵەتێنێ، باوەڕ بە کۆماری هاوبەشی نێوان دوو گەلی سەردەس و بندەس بکا! یا، بە تەمای « عێراق »ی « هیوا و ئاشتیی » بێ! چونکە، ئەزموونی پتر لە « **1400** » ساڵ بە گشتیی و ئەم « **80** » ساڵەی دەوڵەتی « عـێـراق » بە تایبـەتیی، وەک مـانگی چواردەی سـەر لە ئێـوارە، بە ئاسمانی ئەزموونی مێژووی کوردەوە دەدرەوشێتەوە، کەسێکیش باوەڕ ناکا، ئەوا ڕۆژگار، ڕاستیی ئەم دید و بۆچوونانەی بۆ دەسەلمێنێ!
سـەیرەکـە پتر لەوە دایە، « وشـیـار زێبـاریی »، پتر شـانازیی بەوەوە دەکـا، توانیـویەتی، « ئەنجـوومـەنی ئاسایش » قایلکا، تا، سـەربەخـۆیی ڕامیـاریی و سەروەریی، بۆ دەوڵەتی « عێراق » بگێڕێتەوە! لە کاتێکدا، بە یەک ووشـەش،

ناوی کورد و باسی مانەکانی گەلەکەی خۆی نەکردووە!!! باشە، ئەو کوردە هەلکەوتووە زیرەکە، بۆ تا ئێستە، لە بواری دیپلۆماسییدا، بەو دڵسۆزیی و کوڵوڕڵەوە، کاری بۆ کێشە رەوا و پیرۆزەکەی خۆی نەکردووە؟!! بۆ لە کاتی جەنگی نێوخۆدا، هەوڵێکی کوردانە و مەردانەی نەداوە، ئاوێکی ئاشتییخوازانەی بە ئاگری ئەو جەنگە چەپەڵەدا بکردایە و بیکوژاندایەتەوە؟!!
راستە، کورد گەلێ پیاوی گەورە و بلیمەتی تێدا هەڵکەوتووە، بەڵام، بە داخێکی گەورە و گرانەوە، تەنیا هەر بە ناو، لە سەر کورد ماڵبوون، ئەگینا، گەر واز لە هەست و سۆزیی نەتەوەیی بێنین، خۆمان نەخەڵەتێنین، لە راستییدا هیچیان، نە راژەی نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆیان کردووە، نە ئاوڕێکیان لە زمانی کوردیی داوەتەوە و نە هیچیشیان، پێشکەش بە کورد کردووە! ئاخر، ئێمەی کورد، چەندین پیاوی گەورەی وەک: « سەلاحەددینی ئەیووبیی، کەریم خانی زەند، ئیدریسی بەدلیسیی، مەلای خەتێ، دینەوەریی، ئامیدیی، شارەزووریی، سەهرەوەردیی، تاجشەلعافین، ئیبن خەلەکان، ئەبولفیدا، ئیبنو حاجیب، ئیبنو سەلاح، هەر سێ ئیبن ئەسیرەکان، محەمەد عەلی عەونی، محەمەد عەبدە، محەمەد عەبدولباست، عەبباس مەحموود عەقاد، قاسم ئەمین، مەحموود تەیموور، ئەحمەد شەوقیی، جەمیل سدقی زەهاویی، مەعرووف رەسافیی، بڵند حەیدەریی ... »مان هەبووە، بە شێوەیە، راژەی زمانی عەرەبیی، نەتەوەی عەرەب و ئایینی ئیسلامیان کردووە، کەم عەرەب توانیویانە، بەو شێوەیە، راژەی زمان و ئایینەکەی خۆیان بکەن.
«118 -74،1»
بۆیە، تا نەتەوەی عەرەب و ئایینی ئیسلام بمێنن، شانازییان پێوە دەکەن! کەچیی، رەنگە هێندێکیان، خۆشیان بە کورد نەزانیبێ! چونکە، گوێیان لە پەندە کوردییەکە نەگرتووە، کە دەڵێ: « تا ماڵ وەستابێ، مزگەوت حەرامە !» دە دیارە، ئەو کەلەپیاوە کوردانەش، پشتیان لە ماڵی کورد و روویان لە مزگەوتی عەرەب کردووە، بۆیە، هیچیان بۆ کورد نەکردووە و عەرەبەکانیش، هەر بە عەرەبیان دادەنێن! ئەوەتە، یەکێکی وەک دوکتۆر « تەها حوسێن »، نووسەر و زانای ناسراوی نابینای « میسر »، دەربارەی راژەکردنی زمانی عەرەبیی و نووسین بە عەرەبیی، هیچ نەسڵەمیوەتەوە، لە یادی « ئیبن سینا » و لە گوتارێکدا، زۆر بە راشکاویی گوتوویەتی: (« ئەبو عەلی سینا »، بە عەرەبیی نووسیوویەتیی و ئێمە، بە عەرەبی دەزانین. جا با « ئێرانیی »یەکان، هەر هاوارکەن و بڵێن: لە خۆمانە.)«6،2»

* * *

تێبینی:

* سەیر ئەوەیە، « وشیار زێباریی »، لە کۆبوونەوەی یانەی ئابووریی لە « داڤۆس »، دەوڵەتەکانی جیهان و عەرەبەکانیشی دڵنیاکردەوە، کە دڵیان هیچ تەکا، « عێراق » ناسنامەی نەتەوەیی و خەسڵەتە عەرەبییەکەی خۆی لەدەس نادا »!

# رجل المهمات الصعبه.

سەرچاوە :


1. حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی، چاپی1، چاپخانەی هەواڵ، سولەیمانیی، 1999، ل 560.

2. دیوانی مەلای جزیری، تهران، 1361.

# بلۆک

کاتێ دوای ڕاپەڕین، بۆ یەکەمین جار گەڕامەوە بۆ « کوردستان »، بانک نەما بوو. چونکە، ئەوەی تێیدابوو، هێزە چەکدارە ئازاکانی « ڕاووڕووت ـ **RR** »، گسکیان لێ دابوو. لەبەرئەوە، هەروا بە خۆڕایی، دەرگەکەی کرابۆوە، هیچ جۆرە کارێکی ئاڵوگۆڕی پارەی تێدا نەدەکرا و کارمەندەکانیشی، بێ کار لێی دانیشتبوون!
بەڵام، هێندێ لە خەڵکی شارەکە، لە سەر شەقامەکان وەستابوون، یەکی بەستەیە پارەی جۆراوجۆریان بەدەستەوەبوو، ڕۆڵی بانکی دەسگێڕیان دەبینی و پارەیان بۆ خەڵک دەگۆڕییەوە. ئەوەبوو، منیش وەک ئەو هەموو کوردانەی، لە هەندەرانەوە گەڕابوونەوە، پێویستم بەوەبوو، هێندێ « دۆلار » بە « دینار » بگۆڕمەوە. بۆیە، لە ناچاریدا، پەنام بۆ بەر یەکێ، لە خاوەن بانکە گەڕۆکەکانی سەرجادەکان برد!
هەر هێندەی لێیان نزیببوومەوە، چەن کەسێ دەورەیاندام و هەر یەکێکیان دەیویست، لای ئەو بیگۆڕمەوە. بۆیە، هەموویان هەر یەک جۆرە پرسیاریان دەکرد. منیش، ڕووی دەمم لە کوڕێکی لاو کرد و و گوتم: « دینار » بە چەندە؟
گوتی: چ جۆرە پارەیەک پێ هەیە؟
گوتم: « دۆلار ».
گوتی: چەن « گەلا »ت هەیە؟
بە ڕاستیی، تێ نەگەیشتم، مەبەستی لە ووشەی « گەلا » چی بوو. بۆیە، گوتم: « گەلا »ی چی؟
گوتی: یەک « گەلا »، سەد « دۆلار »ە.
سەیرم لێهات، بۆچی ئەو پارەیەیان بە « گەلا » چواندووە؟ تۆ بڵێی، هەر لەبەرئەوەی، ڕەنگی لە ڕەنگی « گەلا » دەچێ و هەر دووکیان سەوزن، بۆیە وایان ناوناوە!
بە ڕاستیی، خەڵکی شاری « سولەیمانیی »، خەڵکێکی زیندوون و لە نێوانی شتدا، دەسێکی بالایان هەیە. هەڵبەتە، گەر زیرەک و بلیمەت نەبوونایە، لەگەڵ هەموو ڕەوشێکی نوێی « کوردستان » و « عێراق »دا نەدەگونجان، بە دەیان نوکتەیان دروست نەدەکرد و قسەی خۆشیان نەدەکرد! زۆر خێرا، ناوی نوێ و نهێنییان، لە شتەکان نەدەنا!

چەن ساڵێ دوای ئەوە، سەردانێکی دیکەی « کوردستان »م کردەوە. ئەم جارەیان، باری خەڵکەکە و بازاڕ، کەمێ پێشکەوتووتربوو، لەگەڵ یەکەمین ساڵدا، جیاوازیی زۆربوو. بۆیە، لە « گەڵا » گەورەتر داهاتبوو. بەڵام، ئەم جارەیان، سەیرم لێ نەهات، کاتێ بیستم: خەڵکەکە، « دەفتەر »یان داهێناوە و هەر « دەفتەر »ێکیش، دەهەزار « 10.000 » دۆلارە!

ئیدی بەو شێوەیە، ماوەیەکی زۆر، لە نێوان ساڵانی « 1991 - 2003 »دا، نازناوی « دۆلار »، لە نێوان « گەڵا ـ دەفتەر »دا وەستا. لەوە پتر نەڕۆی و نەگۆڕا! کەچیی، ڕۆژی « 2004. 07. 08 »، برادەرێ لە « کوردستان » گەڕابۆوە، بە ڕێککەوت، چاوم پێی کەوت و پێکەوە وەستاین. هەروا باسی باری « کوردستان » و ڕەوشی خەڵکەکەی بۆ دەکردم. منیش وردەوردە، پرسیارم لێ دەکرد و ئەویش وەڵامیدەدامەوە. لە پڕ گوتی: پارەکە هێندە زۆر بووە، وەک گەڵای دار ڕژاوە. بە شێوەیە، کار لەوەدا نەماوە. تەنانەت، خەڵک ئێستە بە « دەفتەر » قسە ناکەن، بەڵکوو، بە « بلۆک » دەدوێن. گوتی: دەزانی، « بلۆک » چییە؟!!

هەرچەندە، ئەزموونێکم پەیداکردبوو، بە « دەفتەر »ەکەشدا دەمزانی، ناوی بڕێ پارەیە و تازە داهاتووە. بەڵام، نە لەوە پێشتر بیستبووم، نەدەمزانی، چەن دەکا؟ لەگەڵ ئەوەشدا، یەکسەر ئەو دوو چینە بلۆکەی ماڵی باوکم بیرکەوتەوە، کە کاتێ خۆی، دیواری حەوشەکەمان نزمبوو، باوکم، هەروا بێ وەستا و چیمەنتۆ، لە سەر یەک کەڵەکەی کردن، تا، دیوارەکە کەمێ بەرزبێتەوە، دراوسێ و ڕێبوارەکان لە کۆڵانەوە، بە ئاسانیی، نێو حەوشە و هەیوانەکەمان نەبینن! بۆیە گوتم: نەخێر، نازانم، « بلۆک » چییە و چەندە؟!!

گوتی: ئێستە، ئەوەتەی ڕژێمی « بەعس » ڕووخاوە، هاتوچۆ لە نێوان شارەکانی « کوردستان » و « عێراق »دا زۆربووە و دەرگەی خێر داخراوی، هێندێ نێوچەی پێشووی نێوان هەر دوو وڵات، لە سەر گازی پشتە. بۆیە، خەڵکێکی زۆر، هاتووچۆدەکەن، بازرگانەکان لە کڕین و فرۆشتنێکی بەردەوام دان، بازاڕەکان بوژاونەتەوە و پارە زۆربووە. لەبەرئەوە، خەڵکەکە بە « گەڵا » و « دەفتەر » نادوێن و فریا ناکەون، دۆلارەکان بژمێرن، بەڵکوو، زاراوەیەکی ئابووریی دیکەی نوێیان داناوە، ئەویش « بلۆک »ە و هەر یەک « بلۆک »یش، بە سەدهەزار « 100.000 » دۆلارە!

لە ڕاستییدا، زۆرم پێ خۆشبوو، « بلۆک » لە کەرەسەی خانووەوە خوازراوە، سەرکردایەتیی پارتەکان دەیانەوێ، بنچینەی ئابووریی « کوردستان »ی پێ هەڵچنن و بەهێزیکەن. بەڵام، ئەم جارەیان، بە لم و چیمەنتۆ نا، بەڵکوو، بە دۆلاری « ئەمێریکایی » بەهێزیدەکەن!

ئاخر، چۆنم پێ خۆش نەبێ، چۆن خەنی نەبم، گەر ئابوورییناسانی سەر شەقامی شارەکانی « کوردستان »، زاراوەیەکی نوێیان، بۆ « بۆرســـــە »ی « کوردستان » داهێنابێ؟!! چونکە، فاکتەری ئابووریی، بە یەکێ لە هەرە فاکتەرەکانی پێشکەوتنی هەموو کۆمەڵگەیە دادەنرێ!
ئەورۆ « کوردستان »، پێویستییەکی زۆری، بە سەرمایە هەیە، بۆی بچێ، بەڵام، لێی دەر نەچێ. واتە: هەر لە « کوردستان » کۆبێتەوە و چەقببەستێ! بەڵکوو، ئەمە خوایە، هێندە پارە زۆربێ، چی دیکەش، ســەرانی « پارتیی » و « یەکێتیی »، لە سەر پارە، پەلاماری یەکدی نەدەن و کوڕی کورد، بە خۆڕایی بە کوشت نەدەن!
لێرەدا، پرسیارێ سەرهەڵدەدا: ئایا، گەر ڕۆژبەڕۆژ، پارە لە « کوردستان »، وەک « کەروێشک » زاوزێبکا و لە زیادبووندا بێ، دەبێ، ئابوورییناسەکانی سەر شەقامەکان،، لە دوای « بلۆک »، چ جۆرە زاراوەیەکی دیکەی ئابووریی، بۆ « میلیۆن، میلیار و بلیۆن » بدۆزنەوە؟!! دیارە دەبێ، لە « بلۆک » گەلێ گەورەتربێ، ئەگینا، نە کەس تێیدەگا و نەدەسیشدەدا!
بەڵام، لە هەمان کاتیشدا دەبێ، ئەوە باش بزانین، ئەو پارە زۆرە، لە کوێوە هاتووە؟!! کێ بڵاویکردۆتەوە؟!! بۆ چ مەبەستێ ڕژاندوویەتی؟!! ئایا، تەنیا هەر، بۆ بوژاندنەوەی ئابووریی « کوردستان »ە، یا، سەرانی پارتەکانی پێ بێ دەنگ دەکەن؟!! ئایا، بە پارە، پاداشتی بەشداربوونی کورد، لە پرۆسەی داگیرکردنی « عێراق » و ڕزگارکردنی « باشووری کوردستان » دەدەنەوە؟!! ئایا، بەو پارە زۆرە، خەباتی کوردایەتی ڕاستەقینە و داواکاریی مافە ڕەواکان، لە بیر ڕۆڵەکانی کورد دەبەنەوە؟!! بۆیە پێویستــە، هەمـوو دەرکەوتەیەکی نوێ، زۆر بە وردیی، لێی بکۆڵرێتەوە، لایەنە چاک و خراپەکانی دەستنیشانکرێ، لەگەڵ بەرژەوەندیی نەتەوەیی کورددا بەراوردکرێ، زیان و قازانجەکانی بزانرێ، تەنیا هەر ئەو کاتە، گەر لەبری « بلۆک »، چەندین زاراوەی وەک « گابەرد »یش داهێنن، مەترسیی نابێ!
چونکە، هەر کاتێ، لە هەر وڵاتێکدا، پارەیەکی زۆر ڕژا، بێ ئەوەی، ڕۆڵەکانی گەل، پێوەی ماندووبووبن، بە عارەقی نێوچەوانی خۆیان پەیدایانکردبێ، واتە: بە خۆڕایی دەسیانکەوتبێ، ئەوا، جگە لەوەی، بایەخی ئەو پارەیە نازانن، گەلێکی لاواز، بێ ویست و توانای نەتەوەیی و ڕامیاریی سرووستدەکا، گەلێ دروستدەبێ، تەنیا دەخوا و دەنوێ، بێ ئەوەی، بەرهەمێکی ئەوتۆی هەبێ!
هەڵبەتە، هیچ کەسێکی ژیر، حەز ناکا، ڕۆڵەکانی گەلەکەی، بە هەژاریی و کەساسیی بژین، بۆ دۆلارێ، وەک فیشەکەشێتە، بە حەوادا بچن. بەڵام،

باشتر وایە، ئەو پارەیە، بە ڕەنجی شانی خۆیان پەیداکەن، نەک فێری پارەیەکی زۆری خۆڕایی بکرێن، بە ڕاست و چەپدا، خەرجیکەن و پێ نەزانن! ئاخر، کاتێ سەرچاوەی ئەو پارەیە وشکیکرد، ڕۆڵەکانی ئەو گەلە تەمەڵە مشەخۆرە ناتوانن، پارە پەیداکەن و خۆیان بژێنن، وەک ئەو ژیانەی، لە سەری ڕاهاتوون. بۆیە، پەنا بۆ بەر هەموو شتێکی خراپ دەبن، تا پارە بەدەسبێنن!
دیارە، سەرانی کورد و لێپرسراوانی « ئەمێریکا »، لە قازانجیان دایە، بەو شێوەیە، پارە لە نێو ڕیزەکانی گەلدا بڵاوکەنەوە. چونکە دەیانەوێ، ڕۆڵەکانی گەل، هەست بە هیچ نەکەن، هەر وەک ئاژەڵ بلەوەڕێن، لە تەڕ بخۆن و لە وشک لێی بنوون، ئاگایان لە هیچ جۆرە شتێ نەبێ، خەریکی پارە و ڕابواردن بن، خۆیان بە داوێنپیسیی و خواردنەوەوە خەریکەن، تا، هیچ جۆرە هەڵە، تاوان و ناپاکییەکانیان نەبینن، یا، چاوپۆشییان لێ بکەن، هەست بە لاوازیی کەسێتیی، بڕیاری خراپ و هەڵوێستە چەوتەکانیان نەکەن. بۆیە دەبینین، زۆر بە ئاشکرا، هەموو جۆرە کارێکی خراپ، لە نێو ڕیزەکانی کۆمەڵدا بڵاوبۆتەوە، کەسیش نییە، سنوورێ بۆ ئەو کارانە دانێ و قەدەغەیان کا، بە ناوی دیمۆکراسیی و ئازادیی تاک و کۆمەڵەوە، گەلێ تاوانی گەورە دەکرێ، کە لەگەڵ کەلتووری نەتەوەیی و ئایینیی کورددا ناکۆکن! ئەمەش خۆی لە خۆیدا، بە گەورەترین ناپاکیی سەرانی کورد دادەنرێ!

# فەلسەفەی برایەتیی و دۆزەخی ژێردەسیی!

لەم گوتارە درێژەدا، هەوڵدەدەم، هێندێ لە گوتە و کردەوەکانی، سەرانی پارتەکانی « باشووری کوردستان »، لێپرسراوانی پارت و دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، لە شێوەی چەن بابەتێکی پچووکپچووکی بەراوردکارییدا، بە نموونە بێنمەوە، تا لە لایەکەوە، هیچمان بیر نەچێتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، هەم بزانین، ئایا، سەرکردەکانی کورد، لە ئاستی لێپرسینەوەی مێژوویی و ئەرکەکانی سەر شانی خۆیان دان؟!! هەم لە خۆشمان بپرسین: ئاخۆ، لە دیوەخانی ئەو دەسەڵاتدارە نوێیانەی عەرەبی « عێراق »دا، چ باسە؟!!

**عەرەب و حوشتر:**

جاران، عەرەبە دەشتەکیی و خێڵەکییەکانی « عێراق »، لە تاو بێ ئاویی و قاتوقڕیی، لە کەژی هاویندا، مەڕوماڵات و حوشترەکانیان، پێش خۆیان دەدا و دەهاتن بۆ « کوردستان » دەیانلەوەڕاندن. کوردە ساویلکە گوندییەکانیش، ڕێزێکی زۆریان لێ دەگرتن و میوانداریییەکی باشیان دەکردن. تەنانەت، حوشترەکانیان، بە مەڕی پەیامبەر دەزانی، پشقلەکانیان کۆدەکردەوە و دەیانگوت: پیرۆزە! بەڵام، دوای ئەوەی، دەسەڵاتدارانی عەرەب، چاوی غەدر و پیسیان، لە بەهەشتی « کوردستان »ەکەمان بڕی، وردەوردە، هێندێ گوندیان داگیرکرد، کوردیان لە زێد و نیشتمانەکەی خۆی هەڵکەند و عەرەبی چاوبرسییان، لەجێیان نیشتەجێکرد، هێندێ لە ناوچە جیاجیاکانی نیشتمانەکەمانیان کیمیابارانکرد، سەر و ماڵیان ئەنفالکردین، بە هەزاران کوڕی کوردیان کوشت، دەسیان بۆ ئابڕووی ژنان و کیژانی کورد درێژکرد، دەڵێم: دوای هەشتا ساڵ خاک داگیرکردن و چەوساندنەوەی کورد، ئێستە، گەر ڕۆڵەکانی گەلی کورد، کەمێ ژیربن، کەمێ هوشیاریی نەتەوەیی و ڕ.میارییان بەهێزبێ، نەک هەر نایەڵن، جارێکی دیکە، عەرەب و حوشتر، پێ لە خاکی « کوردستان » بنێن، بەڵکوو، گەر پەیامبەرەکە خۆشی زیندووبێتەوە و حوشترەکانی بۆ لەوەڕاندن، پێش خۆی بدا، هەق وایە، نارەزایی خۆیان دەربڕن، ڕێیان لێ بگرن و نەیەڵن، بێن!

بەڵام، سەیر ئەوەیە، یەکێکی وەک « مەسعوود بارزانیی »، کە لافی سەرۆکی گەلی کورد لێدەدا، بە هیچ شێوەیە، کەڵکی لە ڕووداوەکانی مێژوو وەر نەگرتووە و لەوەش ناچێ، لێی وەرگرێ! چونکە، گەر وا نییە، بۆچی چەن ساڵێ لەمەوبەر، لەو بێ بارانیی و بێ ئاوییەدا، لەو قاتوقڕیی و بێ کارییەدا، ڕێی بە ئاژەڵدارەکانی عەرەب دا، لە سەر حسێبی زەوی، ئاو، گیای تەڕ و پووشی وشکی جووتیارانی کورد، مەڕ و ماڵاتەکانیان، لە « کوردستان » بلەوەڕێنن؟!! تۆ بڵێی، ئەمە تەنیا هەر بۆ ئەوە بووبێ، عەرەبەکان لێی ڕازیبن؟!! ئەوە لە کاتێکدا، بێ ئاویی، تەنگی بە کورد خۆی هەڵچنیبوو، هەر لەو کاتانەشدا، مووچەی چەن مانگێکی دەسوپێوەندەکەی خۆی نەدابوو!!!

**خووی شـیریی:**

هەر لە کۆنەوە، زۆربەی هەرە زۆری، تیرە و هۆزەکانی عەرەب، لە بواری کۆمەڵایەتییدا دواکەوتووبوون. چونکە، کیژۆڵەی ساوایان زیندەبەچاڵدەکرد، دەسیان بۆ ئابڕووی کچ، خوشک، پوور و کەسەکانی خۆیان درێژدەکرد. لەو

بارەیەشــەوە، چەندین ئایەت لە قــورئاندا هەیە، ئامــۆژگــارییــیاندەكــا و ستوورێكی بۆ ئەو كارانە داناوە، تا وازی لێ بێنن.
هەروەها، لە بواری هێمنیی و ئاساییشیشدا، ئەوەتەی ڕۆڵەكانی نەتەوەی عەرەب هەن، جگە لە پەلاماردان، تالانكردن، كاولكردن، كوشتن و بڕین، هیچ جۆرە هونەرێكی دیكەیان نەزانیوە. بۆیە، خوای گەورە، لە قورئانی پیرۆزدا، زۆر بە ڕاشكاویی فەرموویەتی: « انا انزلنا قرانا عربیا لعلكم تعقلون ». بەڵام ئەوان، هەر لە سەر قەلاچۆكردنی خەڵكی بێ تاوان و نەیارانی خۆیان، بەردەوامبوون، لە جەنگ و داگیركردنی خاكی گەلانی جیاجیای جیهان، كۆڵیان نەداوە. بۆیە، لە نیوەدوورگەی عەرەبەوە، بە هەموو جیهاندا بڵاوبوونەتەوە و ئەوڕۆ، پانتایی ئەو خاكەی لە سەری دەژین، نزیكەی دە میلیۆن كیلۆمەتری چوارگۆشە دەبێ!
لەبەرئەوە، سەیرم لێدێ، هێندێ لەم عەرەبانەی ئەوڕۆ، بە تیرۆریست و هێندێكی دیكەشیان، بە مرۆڤپەروەر ناودەبرێن. چونكە، گەر هەلیان بۆ بڕەخسێ، زۆربەی هەرە زۆریان، وەك یەك بیردەكەنەوە، ئەوەی بە دوژمنی خۆیانی بزانن، قەلاچۆیدەكەن! ئەم كارە دڕندانانەیەی، ئەوڕۆ عەرەبەكان، بە ناوی ئایینی ئیسلامەوە، لە هەموو جیهاندا دەیكەن، شتێكی نوێ نییە، بەڵكوو، بە شیرەوە خواردوویانە، هەر كەڵێكیش، « خوویەكی گرت بە شیریی، وازی لێ ناهێنێ بە پیریی! »
ئاخر، « سەددام حوسێن »، گرووپە ئیتنیەكەكانی « كورد، توركمان، ئاسووریی، ئەرمەن و كلدان »، گرووپە ئایینیی و ئایینزاییەكانی « جوو، فەلە، صابئە، یەزدیی و كاكەیی » لەنێودەبرد. ئەوڕۆش، ئیسلامیی ڕامیاریی لە « عێراق »، نەك هەر هەمان كاری ئەو تەواودەكەن، بەڵكوو، گەلێ كاری دیكەی، لەوەی ئەویش خراپتر دەكەن! چونكە، بەوەشەوە نەوەستاون، هەڕەشەی مەرگ، لەو گرووپانە بكەن، بەڵكوو، بە دەیان كەسیان لە « كورد، عەرەب و بیانیی » سەربڕیوە و لە سەر شەقامی شارەكان، جەستەكانیان فڕێداون!
ئەوان دەیانەوێ، گرووپە ئیتنیكەكانی « عێراق »، بەزۆر بكەن بە عەرەب، گرووپە ئایینییەكانیش، بە هەڕەشە بترسێنن، تا موسوڵمانبن. بۆیە، كەنیسەكان دەتەقێننەوە و لە سەر دەرگەی ماڵ و كەنیسەی « فەلە »كان دەنووسن: « موسوڵمانبە، تا بێوەیی! » ئەم دروشمەش، پەیامبەری ئیسلام دایناوە. چونكە كاتی خۆی، نامەیەكی بۆ « مونزیر بن ساوا ئەلعەبدی » شای « بەحرەین » ناردووە و نووسیوێتی: « ئیسلەم، تەسلەم ». ئەوڕۆش، ئەو

گرووپە ئیسلامییانە، جارێکی دیکە و بە هەمان شێوە دەیانەوێ، ڕەوڕەوەی مێژوو، بەرەو دواوە بگێڕنەوە!
جگە لە ئەمانەش، لە دەوڵەتێکی دواکەوتووی هەژاری لە برسـامردووی وەک: « سۆدان »، گرووپە چەکدارەکانی ڕێکخراوی ڕەگەزپەرستی « جەنجەوید »، دانیشـتووانی هەرێمی « دارفـوور » قـڕدەکـەن، هەر لەبەرئەوەی، ئایینیـان جیایە! بۆیە، تا ئێستە، بە هەزاران کەسیان لێ کوشتوون، پتر لە یەک ملیۆنیان لێ دەربەدەرکردوون، ماڵ و کاری خۆیان پێ جێهێشتوون، لە ترسی مـەرگ ڕایانکردووە و لە ژێر چادردا دەژین. کەچیی، لێپـرسـراوانی میریی « سۆدان »یش، پتر هانیاندەدەن، یارمەتییاندەدەن، تا، لە سـەر کارە درندەکانیان خراپتربن و پتر بەردەوامبن. لە هەمان کاتیشدا، نکوولیی لە جینۆسایدی ئەو گرووپە ئیتنیکە دەکەن!

## سەرکردەی پارتەکانی باشـوور:

ئاخر، سەرکردەی کام گەل و نەتەوەی بندەسی، خاک داگیر و دابەشکراوی ئەم جیـهانە، هێندە دەس و دڵ فـراوانبـوون، لە پێناوی دیمۆکراسـیی بۆ دەوڵەتە داگیرکـەرەکەی خۆیان، لە پێناوی مـافێکی نیوەناچڵ بۆ گەلەکانی خۆیان، ماوەی هەشتا دانـە ساڵی ڕەبەق، ڕۆڵە دڵسـۆز و ئازاکانی گەلەکانی خۆیان، بە خۆڕایی بەکوشتدابێ و هیچ ئەنجامێکیشی نەبووبێ؟!!
ئـ خـر، سـەرکردەی کـام گەل و نەتەوەی بـندەسی ئەم جیـهانە، بێ بۆنە و بە بۆنـە، ڕۆژانە، کـوتاری بـێ سـەروبەریان داوە، ئاوێکی فـێنکیـان، بە دڵ و دەروونی، سـەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانیـاندا کردووە و گوتوویانە: ئێمە، دژی جیابوونەوەین، هـەرگیز، هەوڵ بۆ سەربەخۆیی خۆمان نادەین، دەوڵەتی نەتەوەییمـان ناوێ، بەڵکوو، تا ماوین، هەر بە نۆکـەریی دەژین، بیر لە هیچ شـتێکی دیکە ناکـەینەوە، تەنیـا هەر، لە چوارچێوەی دەوڵەتە پۆلیـسـیی و دیکتاتۆرییەکانتاندا، فشەمافێکمان بدەنێ، هیچی دیکەمان ناوێ؟!!
ئەم تراژیدیا گەورەیە، مەگەر هەر لە کورد قەومابێ! ئەم کاڵتەجاڕییە بێ وێنەیە، مەگەر هەر لە سەرکردەکانی کورد ڕوویدابێ! چونکە، ئەوەتەی هەن، جگە لە فـشەمـافێکی نانیوەندیی، داوای هیچ جۆرە مـافێکی سـەرەکیی و گرنگیـان، بۆ گەلەکەی خۆیان نەکردووە! نەیانویسـتووە و نایانەوێ، گرفتی کورد، بە شێوەیەکی بنەبڕیی چارەسـەرکەن. کوردیان بە نۆکەر و برا گچکە، عـەرەبیشیان بە ئاغا و برا گـەورە داناوە. کەچیی، لە ئاسـتی یەکدیشدا، دوژمنی باوەکوشتەی یەکدی بوون!

ئەو سەرکردانە، لە کاتێکدا، بە دەیان هەلی مێژوویییان بۆ هەڵکەوتووە، لەکیس خۆیان و گەلەکەیان داوە، ئەو مافە ڕەوا و پیرۆزانەیان، بە گەلەکەی خۆیان ڕەوا نەبینیوە و هیچ هەنگاوێکی ڕاستەقینەیان بۆ نەناوە. کەچیی، مافی سەربەخۆیی تەواو و دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەییان، بە گەلانی دوور و نزیک ڕەوابینیوە، بە دڵ و بە گیانیش، پشتگیریی خۆیانیان بۆ دەربڕیون!
ئاخر، سەرانی داگیرکەری دەوڵەتی « عێراق »یش، مینتالیتێتی سەرانی کوردیان باش ناسیوە، زانیویانە، لە چ قوڕێ درووستکراون، بایی چەندن و چییان دەوێ. بۆیە، گەر لە بەرژەوەندییاندا بووبێ، فشەمافێکیان داونەتێ، هەر وەک چۆن، مرۆڤێ لە ترساندا، پارچە نانێ، بۆ سەگێکی هار هەڵدەدا، تا هێوریکاتەوە!

## هەلی مێژوویی و هاوپەیمانێتیی:

سەرکردایەتی هەموو گەل و نەتەوەیەکی بندس بە گشتیی، گەر باری جوگرافیایی و جیۆپۆلیتیکی وولاتەکەیان، یارمەتیی نەدابن، تا، خەونە نەتەوەیی و ئامانجە ڕامیارییەکانی گەلەکەیان بەدیبێنن، گەر دۆستی ڕاستەقینەی ستراتیژییان نەبووبێ، گەر دوژمنە داگیرکەرەکانیان، لە هەموو ڕوویەکەوە، لە خۆیان بە تواناتربووبن، ئەوا، زۆر بە بێ ئارامیی و بە پەرۆشەوە، چاوەڕێی هەلێکی مێژوویی لەباریان کردووە، تا، هەموو داواکارییەکاتی خۆیان، بە سەر دوژمنەکانیاندا بسەپێنن، بەرنامە ڕامیارییەکانی خۆیان جێبەجێکەن و مافە ڕەواکانی گەلەکەیان دابینکەن.
کەچیی، سەرانی کورد نەیانتوانیوە، وەک پێویست، کەڵک لە باری جیۆپۆلیتیکی « کوردستان » وەرگرن، دۆست و دوژمنی ڕاستەقینەی گەلەکەیان، بە تەواویی و درووستیی دەستنیشانکەن. گەلێ هەلی مێژووییشیان بۆ هەڵکەوتووە، بەڵام، کەڵکیان لێ وەر نەگرتووە و هەمیشەش، بە پێچەوانەی ئەم یاسا ڕامیارییەوە کاریانکردووە. هەرگیز، بیریان لەوە نەکردۆتەوە، گەر یارمەتیی لایەنێ بدەن، پێشەکیی، مەرجەکانی خۆیانیان بە سەردا بسەپێنن.
ئاخر، ئەوڕۆ سەرانی کورد دەبێ، گللەیی چی لە دەوڵەتێکی زلهێزی وەک: « ئەمێریکا » بکەن و بڵێن: مافەکانی گەلی کورد لە « باشووری کوردستان »، لە دەزگەی ئەنجوومەنی ئاسایشی « UN »دا باس نەکراوە؟!! یا، یاسای کاتیی دەوڵەتی « عێراق »، لە بڕیاری « 1546 »دا نەهاتووە؟!! ئایا ئەوان، پێش ئەوەی جەنگی نێوان « ئەمێریکا » و « عێراق » دەستپێبکا، پێش ئەوەی،

پێشمەرگەی کورد، شانبەشانی سوپای هێزەکانی هاوپەیمان، دژی لەشکری « عێراق » بجەنگێ، هیچ جۆرە ڕێککەوتننامەیەکیان لە نێواندا هەبووە؟!! ئایا « ئەمێریکا »، هیچ جۆرە بەڵێنێکی بە « بارزانیی » و « تاڵەبانیی » داوە، تەنانەت، مافی « فیدراڵیی »ش بە کورد بدەن؟!! ئیدی دەبێ، گلەیی چی لە دەوڵەتێکی سەرمایەداری داگیرکەری چاوچنۆکی وەک « ئەمێریکا » و هاوبەشەکانی دیکەی بکەین؟!! کەی ئەوە هاوپەیمانێتیی دەگەیەنێ، گەر تەنیا لە یەک لاوە، دەهۆڵی بۆ بکوترێ؟!! جا گەر هاوپەیمان بوونایە، هەڵبەتە، ئێستە لەو کێکە گەورەیەی « عێراق »، پارچەیەکی پچکۆلانەش، بەر سەرانی « پارتیی » و « یەکێتیی » دەکەوت، وەک بەر هاوپەیمانەکانی دیکەیان کەوتووە! ئەمە تەنیا هەر، خۆخەڵەتاندن و کورد چەواشەکردن نەبێ، هیچی دیکە نییە. بە ڕاستیی، کورد پیاوی ڕامیار، بلیمەت، زرنگ، وریا و دیپلۆماسیی، زۆر کەم تێدا هەڵکەوتووە، یا، هەر تێیدا نییە، بۆیە، ڕۆژمان بەم ڕۆژەڕەشە گەیشتووە!

## قومار و نوێژ:

سەیر ئەوەیە، سەرانی داگیرکەری دەوڵەتی « عێراق »، بە هەموو پارت و ڕێبازە جیاجیاکانیانەوە « ئیسلامیی و سیکولار »، لەگەڵ « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »دا، لە سەر ئاییندەی کورد و چارەنووسی « کوردستان »، قومار دەکەن! لەبەرئەوە، فێڵکردن، هەڵخەڵەتاندن، درۆکردن و پەشیمانبوونەوە لە بەڵێنەکانیان، بە شتێکی ڕەوا دەزانن! کەچیی، سەرکردایەتی ئەو دوو پارتە، هێندە ساکار و ساویلکەن، لەبری قوماریان لەگەڵ بکەن، نوێژیان لەگەڵ دەکەن! بۆیە، تا ئێستە نەیانتوانیوە، مافە سەرەکییەکانی کورد بەدیبێنن. بەڵکوو، بە دڵپاکیی و ساویلکەیی خۆیان، گەلێ شتی گرنگیشیان، لە دەستداوە! هەر زۆر دوور نەڕۆین، یاسایەکی شەپلەلێدراوی، وەک یاسای کاتیی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »یان واژووکردووە، کە هێندێ خاڵی، جگە لە دوژمنایەتییکردنی گەلی کورد، هیچی دیکە ناگەیەنێ! ئەوڕۆش، دۆشداماون و زۆر بە کەساسییەوە، لە بەردەم بارەگەی پارت و دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا وەستاون و دەپاڕێنەوە، تا، هێندێ مافی نەتەوەیی و دیمۆکراسییان بدەنێ! یا، نامە بۆ سەرۆک « بوش » دەنووسن، تا، گەر مافەکانیان لە عەرەب بۆ وەر ناگرن، هێندێ پارەیان بدەنێ، بۆ ئەوەی، ڕۆڵەکانی گەلی کوردی، پێ بێ دەنگکەن. بۆیە، وەک دەڵێن: پارە لە « کوردستان »، وەک گەڵای دار ڕژاوە! « دۆلار »ی « ئەمێریکایی »ش، هەر

ڕۆژەی، نازناوێکی نوێ وەردەگرێ، سەرەتا، « گەلا » بوو، دوایـــــی گۆڕا بە « دەفتەر »، لەم دواییانەشدا، بەرزبۆوە و پلەی « بلۆک »ی وەرگرت!

## برایەتیی و دوژمنایەتیی:

ئەوەی لە نێو گەلانی بندەسی جیهاندا باوبووە و باوە، هەر گەلێ یا دەوڵەتێ، خاکی گەلێکی دیکەی داگیرکردبێ، بە داگیرکەر ناسراوە، لە نێو دەزگە نێو دەوڵەتیی و گەلەکانی جیهانیشدا، هەر بە داگیرکەر ناوبراوە. کەچیی، ئەوەتەی خاکی « کوردستان »، لە لایەن هەر سێ نەتەوەی « توورک، فارس و عەرەب »ەوە داگیرکراوە، مەگەر، دۆستەکانی کورد خۆیان، ئەو ڕاستییەیان، بە ئاشکرا درکاندبێ. ئەگینا، ئەوەتەی سەرانی کورد و پارتەکانی « باشووری کوردستان » هەن، لە قوتابخانەی کوردایەتیی و تێکۆشاندا، وەک مامۆستایەکی چەواشەکار، هەر وانەی برایەتی درۆزنانە، کۆمار و نیشتمانی هاوبەشی کورد و عەرەبیان، فێری ڕۆڵەکانی کورد کردووە. بە درۆی برایەتیی و بە ناوی ئایینی هاوبەشەوە، هەڵیانخەڵەتاندوون!
باشە، وا پتر لە هەشتا ساڵ، بە سەر داگیرکردنی « باشووری کوردستان »دا تێپەڕی، لەم ماوە دووروودرێژەدا، ڕۆژێ نەبوو، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، پڕ بە سییەکانی خۆیان، شنەبای ئازادیی و سەربەخۆییان هەڵمژیبێ، جگە لە چەوساندنەوە و کوشتنوبڕینیش، هیچ خێر و خۆشییەکیان، نە لە سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » و نە لە ڕۆڵەکانی گەلی عەرەب دیوە. جا، گەر ئەم تراژیدیا گەورە نەتەوەیییەی، نێوان ئەم دوو گەلە سەردەس و بندەسەی، نێو دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، برایەتیی ناوبێ، دەبێ، دوژمنایەتیی چۆن بێ؟!! گەر، ئەم هەموو جەنگانەی، تا ئێستە، لە نێوان سەرانی عەرەب و کورددا ڕوویانداوە، جەنگی نێوان عەرەب و کورد نەبووبێ، تۆ بڵێی، جەنگی نێوان کرێکاری کورد و بۆرژوای عەرەب، یا، جەنگی نێوان جووتیاری کورد و دەرەبەگی عەرەب بووبێ، وا تا ئێستە، کەس نەیزانیوە! جا گەر جەنگەکە، لە نێوان هەر دوو گەلی داگیرکەر و داگیرکراودا نەبووبێ، کەواتە، هەموو ئەو جەنگانەی، لە ماوەی یەک سەدەدا، لە « باشووری کوردستان » ڕوویانداوە، چەن جەنگێ نەبوون، لە نێوان کورد و میرییە یەک لە دوا یەکەکانی دەوڵەتی « عێراق »یشدا ڕوویاندابێ! بەڵکوو، لە ساڵانی بیست و سییەکانی سەدەی پێشوودا، تەنیا هەر، جەنگی نێوان خودی « شێخ مەحموودی حەفید » و شا « فەیسەڵ » بووە! لە ساڵانی سی و چلەکاندا، جەنگی نێوان سەرکردەکانی شێخانی « بارزان » و خودی شا « فەیسەڵ » بووە! لە سەرەتای شەستەکان

تا نێوەڕاستی ساڵی حەفتا، جەنگی نێوان « پارتیی » و سیستێمی کۆماریی سەردەمی « عەبدولکەریم قاسم، عەبدولسەلام عارف، عەبدولڕەحمان عارف، ئەحمەد حەسەن بەکر و سەددام حوسێن » بووە! یا، ئەم شۆڕشەی دوایی حەفتاکانی ســــــەدەی پێشوو « 1976 - 1991 » جەنگی نێوان پارتەکانی « کوردستان » و ڕژێمی داگیرکەری « بەعس » بووە! چونکە، لە لایەکەوە، گەر گەلی عەرەبی لێ دووربخەینەوە، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، تەنیا هەر، لەگەڵ دەستەیەک لە عەرەبی « عێراق » جەنگابن، ئیدی، بۆچی دەبێ، هەموو کوردی تێوەگلێنین و بڵێین: ئەو دەسەلاتدارانە، دژی گەلی کورد بوون؟!! لە هەمان کـ تیشدا نابێ، بڵێین: جەنگی هەموو گەلی کورد بووە، یا عەرەبەکانیش ویستبێتیان، گەلی کورد لەنێوبەرن، بەڵکوو دەبێ، بڵێین: جەنگی نێوان دەستەیەک لە هەر دوو گەلی سەردەس و بندەس بووە؟!!
لە لایەکی دیکەشەوە، گەر سەرانی کورد، بە جەنگی نێوان عەرەب و کوردیان نەزانیوە، ئەوا، هەموو میریی و پارتەکانی عەرەبی « عێراق »، هەر بەو چاوە تەماشایانکردووە! تەنانەت، عەرەبی دەوڵەتەکانی دیکەش، هەر دژی کورد بوون و بە شێوەیە لە شێوەکان، یارمەتیی دەوڵەتی « عێراق »یان داوە!
بەلام، هەڵبەتە لە بەرژەوەندیی کورددا نەبووە و نییە، هەموو نەتەوەی عەرەب، بە دوژمنی خۆی دابنێ و نابێ، بەو شێوەیە لێی بدوێ، یا تێڕوانینەکەش ڕاستبێ. چونکە، ئێمە دەمانەوێ، ڕێژەی دوژمنەکانمان کەمترکەینەوە و ڕێژەی دۆستەکانیشمان، لە سەر حسێبی دوژمنەکانمان پترکەین!

## بڕیارێکی گرنگ:

ڕۆژی « 16 .04 .2003 »، نوێنەری دەســـەلاتی داگیرکەری « ئەمێریکا » لە « عێراق »، میستەر « پۆڵ برێمەر »، بڕیارێکی مێژوویی دەرکرد. بڕیارەکە، دەربارەی لە ڕەگکوریشە هەڵکێشانی پارتی « بەعس »ی فاشیی بوو. لەبەرئەوە، « دەزگەی نیشتمانیی بنەبڕکردنی بەعس »یان دامەزراند.* ئەو بڕیارەش، لە چوارچێوەی « یاسای کاتیی بەڕێوەبردنی دەوڵەت »دا، لە بڕگەی « ئەلف »ی خاڵی « 49 »دا جێگیرکرا!
کەچیی، ئێستە خەریکە، لێی پەشیماندەبنەوە و دەیانەوێ، ئەو بڕیارە پشتگوێخەن، وردەوردە، کادیرەکانی « بەعس »، لە دەزگەکانی دەوڵەتدا دامەزرێننەوە. هەر ئەو عەرەبانەی، ئەو بڕیارەشیان واژووکردبوو، لێی پەشیمانبوونەتەوە. چونکە، لە لایەکەوە، هێندێ لەو عەرەبانە، باوەڕێکی زۆر و

* الهیئە الوطنیە لاجتثاث البعث.

ئەواویان، بەو کارانە هەیە، کە ڕژێمی « بەعس » و سەرۆک « سەددام »، دژی گەلانی « عێراق » بە گشتیی و گەلی کورد بە تایبەتیی ئەنجامیانداوە. لە لایەکی دیکەشەوە، بیانووی بۆ دێننەوە، گوایە: ئەو بڕیارانە، هەم وا بە ئاسانیی ناسڕێنەوە. هەم ناشتوانن، بیر و هۆشی ڕۆڵەکانی عەرەب، بەو پەلەپەلە بگۆڕن! جگە لەوەی، هەموو ئەو کارە ڕەگەزپەرست و فاشستانانەیەی « سەددام » ئەنجامیداوە، بە تایبەتیی، دژی گەلی عەرەبی « عێراق » نەکراوە، ئیدی، بۆ ڕەتیکەنەوە!
یەکێ لەو قارەمانە گەورانەی، پێش ڕووخاندنی ڕژێمی « بەعس »، لە دەرەوەی « عێراق »، دەوڵەت بە دەوڵەت دەگەڕا، کۆڕی بۆ پەنابەرانی کورد و عەرەب دەگرت، لە کۆڕەکانیدا، قسەی زلزلیدەکرد، دژی « بەعس » و « سەددام » دەدوا، تەنانەت، داوای دەوڵەتێکی یەککگرتووی « کوردستانیی »شی، بۆ هەموو کورد دەکرد، « مشعان ئەلجبووریی » بوو. کەچیی ئێستە، بە هەموو توانای خۆیەوە، داکۆکیی لە کۆنە « بەعسیی »یەکان دەکا و دەیەوێ، بە لای خۆیدا ڕایانکێشێ. بۆیە، دژی ئەو بڕیارە کاردەکا و هەوڵ بۆ هەڵوەشاندنەوەی دەدا!

## ئاشتبوونەوە:

لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە، یەکێکی وەک « مەسعوود بارزانیی »، بێ ئەوەی پێ بزانێ، چی دەڵێ و چی دەکا، لە مانگی « مارسی **2004** »دا، لە شاری « هەولێر »، کۆمەڵێ عەرەبی جیاجیای کۆکردەوە، کۆنگرەی « ئاشتبوونەوەی گشتیی » بۆ گرتن. بەڵێ، کۆنگرەی بۆ ئەو عەرەبە ڕەگەزپەرستانە سازکرد، کە تا ئێستەش بە تەواویی، دان بە مافە ڕەواکانی گەلی کورددا نانێن!
ئاخر، « بارزانیی » ئەمەی بۆیە کرد، تا، بۆ عەرەبەکانی جیهانی بسەلمێنێ، زۆر بە تەنگ پاشەڕۆژی گەلانی « عێراق »ەوە دێ و خۆی لە عەرەبەکانیش، بە « عێراقیی »تر دەزانێ! هەر لەو کاتەشدا بوو، بەشدارانی کۆنگرە داوایانکرد و بڕیاریشیاندا، « دەزگەی نیشتمانیی بنەبڕکردنی بەعس » هەڵوەشێنرێتەوە. تەنانەت، ئەو پێکهاتنەوە و ئاشتبوونەوە گشتییەی داوایانکردووە، ئەندام و کادێرەکانی « بەعس »یش دەگرێتەوە. لەو بڕوایەوە، گوایە دەبێ، جیاوازیی لە نێوان « بەعسیی » ڕاستەقینە و نۆکەرەکانی « سەددام »دا بکرێ. ئەوە لە کاتێکدا، هەموومان دەزانین، هیچ دۆست و ئەندامێکی، شانەکانی خوارەوە و سەرەوەی، دەزگەکانی پارتی « بەعس » نەمابوو، « سەددام » بە سەرکردە و ڕابەری خۆیان نەزانن، فرمانەکانیشی، زۆر بە دڵسۆزیی جێبەجێ نەکەن و لە پێناویدا نەمرن!

ئاخر دەبووایە، « بارزانیی » بە هیچ شێوەیە، ئەو کارەی نەکردایە، بەڵکوو، لەبری ئەوە، باشتر وابوو، لە گەڵەکەی خۆیەوە دەسپێبکردایە، کۆنگرەیەکی نیشتمانیی، بۆ هەموو هێزە « کوردستانیی »یەکان بگرتایە و داوای لێ بکردنایە، بە یەک دڵ و بە یەک گیان، بۆ کورد و « کوردستان » هەوڵبدەن، چارەسەرێکی بنەڕەتیی و یەکجارییان، بۆ کێشەی کورد بدۆزیایەتەوە.
خۆ گەر، باسی تێکشکانی شۆڕشی « 11/سێپتێمبەر »، لەسێدارەدانی هەزاران ڕۆڵەی کورد، کاولکردنی نێوچە جیاجیاکانی « کوردستان »، کیمیابارانی « هەڵەبجە » و نێوچەکانی دیکەی نیشتمانەکەمان، ئەنفالکردنی « 182 » هەزار منداڵ، کوڕ، کیژ، ژن، پیاو، پیر و پەککەوتەی کورد، دەستدرێژییکردنە سەر ئابڕووی ژنان و کیژانی کورد نەکەین، تەنیا هەر، باسی بێ سەروشوێنکردنی « 8 » هەزار « بارزانیی » و سووکایەتییپێکردنی ژنان و کیژانی هۆزی گەورەی « بارزانیی »یەکانی هۆردوگەی « قوشتەپە » بکەین، هەرگیز نەدەبوو، کارێکی وا ئەنجامبدا!
ئیدی، بۆ دەبێ، هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر و دڵسۆز، سەری لەو کارەی « بارزانیی » سووڕ نەمێنێ؟!! ئاخر، ئەوانەی ئەوڕۆ، دژی دامەزراندنەوەی دەوڵەتی « عێراق » دەجەنگن، هێمنیی و ئاسایشی « عێراق » تێکدەدەن، زۆربەی هەرە زۆریان، لە کادیرەکانی « بەعس » پێک نەهاتوون؟!! ئایا، زۆربەی هەرە زۆری، ئەو کارە دڕندانانەی ئەوڕۆ دەکرێ، لە نێوچەکانی سێگۆشەی « سوننە »نشینەکاندا ناکرێ؟!! ئەمە بۆ وایە؟ چونکە، قەورسایی و هێزی سەرەکیی « بەعسیی »یەکان، هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆش، لە نێو کەمینەی « سوننە »دا بووە و زۆر بە قووڵیی، ڕەگیان داکوتاوە.
ئەز لەو باوەڕەدام، بە هیچ جۆرێ نابێ، ڕۆڵە دڵسۆزە بە ئەمەکەکانی گەلی کورد، لە هیچ « بەعسیی »یەکی فاشیی ڕەگەزپەرست خۆشبن، هیچ پارتێکی « کوردستانیی » نابێ، ئەو دروشمە بەرزکاتەوە و پێوەندیی ڕامیارییان، لەگەڵدا ببەستێ! جا کەواتە، کاتێ دووەمین جەنگی جیهان تەواوبوو، بە ژێرکەوتنی « نازیی »یەکان و سەرکەوتنی بەرەی ئاشتییخوازان کۆتاییهات، ڕۆڵەکانی گەلی « ئەڵمان » و نەیارەکانی بیری « نازیی » دەبووایە، دەستی ئاشتبوونەوەیان، بۆ ئەندامان و تاوانبارانی پارتەکەی « هیتلەر » ڕاکێشایە و جارێکی دیکە، ئەو هەلەیان بۆ بڕەخسانندنایەوە، وردەوردە، لە سەر شانۆی ڕامیاریی نیشتمان و دەوڵەت، خۆیان بنوێنن و دەسەڵات پەیداکەنەوە!!! بەڵام، ئەوان ئەوەیان نەکرد، بەڵکوو، یاسایەکیان دەرکرد، بیری « نازیزم »یان قەدەغەکرد. لەبەرئەوە دەبێ، ئێمەی کوردیش، چاو لە « ئەڵمان »ەکان بکەین، چونکە، هەر دوو بیری گەندەڵی « بەعس » و « نازیزم »، لە یەک سەرچاوەی

بۆگەنی، دژ بە بیری دیمۆکراسیی، ئازادیی و سەرەتاکانی مافی مرۆڤەوە ئاودەخۆنەوە. دوو فەلسەفەی ڕەگەزپەرستیی نەبن، هیچی دیکەیان تێدا نییە.
ئای چەندم پێ خۆشبوو، کاتێ بینیم: دانیشتووانی بە ڕوومەتی شارۆچکەی « هەڵەبجە »ی شەهید، دروشمێکیان بەرزکردۆتەوە و لێیان نووسیوە: نابێ، هیچ « بەعسیی »یەک، سەردانی « هەڵەبجە » بکا! من پێم وایە، ڕۆڵەکانی گەلەکەمان، گەلێ لە سەرکردەی پارتەکان زیرەکتر و بلیمەترن، گەر وازیان لێ بێنن، دەزانن، چۆن تۆڵەی خۆیان، لە دوژمنی داگیرکەر دەسەننەوە و مافە ڕەواکانیان بەدەسدێنن!
ئاخر، ئەو برینە قووڵەی، ڕژێمە یەک لە دوا یەکەکانی « عێراق »، لە ماوەی « 80 »ساڵدا بە گشتیی، ڕژێمی « بەعس » لە ماوەی « 35 » ساڵدا بە تایبەتیی، لە جەستەی گەلی کوردیان کردووە، هەرگیز، وا زوو سارێژ نابێتەوە، تا، ڕۆڵەکانی هەر دوو گەلی سەرەکیی عەرەب و کورد، ژان و ئازارەکانی کۆنیان بیر نەچێتەوە. بیری تۆڵەسەندنەوە، لە بیر و هۆشیاندا نەسڕێتەوە. ئەمەش، تەنیا هەر بەوە دەبێ، عەرەبەکانی « عێراق »، دان بە هەموو مافە ڕەواکانی گەلی کورددا بنێن، ڕێزی لێ بگرن، وەک خۆیان و وەک هاونیشتمانییەکی پلە یەک لێی بڕوانن! ئەگینا، تا لە سەر ئەو دید و بۆچوونە شۆڤێنیستانەیەی خۆیان بەردەوامبن، هەرگیز، ئاشتبوونەوەی گشتیی، لە نێوان ئەو دوو گەلە سەرەکییەدا پێک نایە. جا با دەیانی وەک « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، خۆیان هەڵخەڵەتێنن، کۆبوونەوەی فراوان، بۆ « ئاشتەوانیی گشتیی » ببەستن. بەڵام، هەرگیز ناتوانن، هیچ لەو ڕاستییە بگۆڕن، کە عەرەب و کورد، هەرگیز نە برابوون، نە هەرگیزا و هەرگیزیش دەتوانن، برابن! چونکە، پێوەندیی نێوانیان، خۆی لە پێوەندیی نێوان دوو گەلی داگیرکەر و داگیرکراو، چەوسێنەر و چەوساوە، زۆردار و زۆرلێکراودا دەبینێ. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، پێوەندییەکی داگیرکەرانەی نامرۆیانە نەبێ، هیچی دیکە نییە!
ئەوەتە، سەرۆک شالیارانی کاتیی « عێراق »، دوکتۆر « ئەیاد عەلاویی » کۆنە « بەعسیی »، ڕۆژی « 23 .09 .2004 »، لە بەردەم هەر دوو ئەنجوومەنی « پیران » و « نوێنەران »ی « ئەمێریکا »دا، گوتارێکی درێژی پێشکەشکرد، لە هەموو گرفتەکانی « عێراق » و چارەسەرکردنەکانیان دوا. بەڵام، بە هیچ شێوەیە، باسی کێشەی کورد، جینۆسایید، فیدراڵیی و مافە ڕەواکانی گەلی کوردی نەکرد! ئەمە چی دەگەیەنێ؟ ئایا، نیشانەی ئەوە نییە، زۆر بایەخ بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد نادەن؟!!

## عێراقچێتیی یەکلایەنە:

ئەم پەتای « عێراقچێتیی »یە، وەنەبێ، شتێکی نوێبێ، بەڵکوو، نزیکەی هەشتا ساڵ دەبێ، چ لێپرسراوانی ئیمپریالیزمی « بریتانیای گەورە »، چ عەرەبەکانی « عێراق » و چ کوردە « عێراقچیی »یەکان، بە شێوەیەکی بەردەوام، کاریان بۆ کردووە. بەلام، لەگەڵ ئەوەشدا، لە نێو بیر و هۆشی ڕۆڵەکانی گەلدا، ڕەگێکی قووڵی دا نەکوتاوە و هیچی لێ شین نەبووە. بۆیە ئەڕۆ، تاڵەمووی ئەو برایەتییەی نێوان کورد و عەرەب، لە هەموو کاتێ پتر، قرچۆکتر و لاوازترە! ئاخر، کام برایەتیی، لە نێوان کورد و عەرەبدا هەبێ؟!!

بە ڕاستیی، ئەوەی لە سەرکردایەتی پارتەکانی « باشووری کوردستان » ڕوویداوە، ئەو زیادەڕۆییەی، لە باسی کێشەی « عێراقچێتیی »دا دەیکەن و خۆیان بە « عێراقیی » دادەنێن، ئەو خەرەکە درێژەی، بۆ برایەتی درۆزنانەی، نێوان هەر دوو گەلی بندەسی کورد و سەردەسی عەرەب دەیڕێسن، لە مێژووی هیچ گەلێکی بندەس و داگیرکراودا نەبووە و ڕووی نەداوە.

سەیرەکە لەوە دایە، ئەم دید و بۆچوونە دەسکردە، تەنیا هەر لە یەک لایەنەوە، هەستی پێ دەکرێ. چونکە، عەرەبەکان بە گشتیی، ئەو هەستەیان نییە، بەو گەرموگوڕیی و کوڵودڵەوە، نە باسی برایەتی کورد و عەرەب دەکەن، نە بۆی تێدەکۆشن، نە هێندەش بۆی بەپرۆشن. بەڵکوو، تەنیا هەر، بۆ خەڵەتاندن و دەمکوتکردنی ڕۆڵەکانی گەلی کورد نەبێ، هێندێ جار و لە کاتی پێویستدا باسیدەکەن، تا، کورد داوای مافە سەرەکیی و ڕەواکانی خۆی نەکا، زۆرداریی و چەوساندنەوەی بیرچێتەوە، پتر بیر لە برایەتیی و پێکەوە ژیانی هاوبەش بکاتەوە. لە ڕاستییدا، ئەمە وەک ئەوە وایە، یەکێ بە بەژن و بالای شۆخێکدا هەڵدا، بەلام، ئەو هەر ئاوڕیشی لێ نەداتەوە، واتە: دڵداریی یەکلایەنە بکا!

هەر بۆ نموونە: ڕۆژی « 2004 .10 .09 »، کەناڵی « ئەلجەزیرە »ی دوژمنی کورد، لە سەر کێشەی کورد و « ڕیفراندۆم »، بەرنامەیەکی پێشکەشکرد. چەندین کەسی کورد و عەرەب، بەشدارییان تێدا کرد. نوێنەری باڵی شیعەکانی سەر بە « موقتەدا سەدر »یش ئامادەبوو. ئەو عەرەبە داگیرکەرانە، زۆر بە ئاشکرا، دژی هەموو جۆرە سەربەخۆیی و ئازادییەکی گەلی کورد لە « باشووری کوردستان » دەدوان و دیسانەوە، قەوانی سواوی « برایەتیی » و « هاوئایینیی »یان لێدەدا، بەرقسانەیان دەیانویست، جارێکی دیکە، ڕۆڵە بە هۆش و گۆشەکانی گەلی کورد، کوێر و کەڕ و لاڵ کەن، لە خشتەیانبەرن و بیر لە مافە ڕەواکانی خۆیان نەکەنەوە!

سەیر ئەوەیە، پەیمانگەیەکی تایبەتیی، لە شاری « هەولێر » دامەزراوە،* ناوبەناو، کۆڕی تایبەتیی دەگرێ، تا برایەتی نێوان کورد و عەرەب پتەوتربێ! ئەوە لە کاتێکدا، ئەوەتەی دەوڵەتی « عێراق » داتاشراوە، ئەو برایەتییە، بە کردەوە نەبووە و ئەوڕۆش، هەر هەستی پێ ناکرێ! بەڵام، ئەمە وەک ئەوە وایە، بەڕێوەبەرانی ئەو پەیمانگەیە، گوێزی پووچ، بە گومەزێکی خڕی گەورەدا هەڵدەن! یا، قسە بۆ چەن مرۆڤێ بکەن، هەر لە بنەڕەتدا، « کەڕ » بن!
بەزمەکە لەوە دایە، زۆربەی هەرە زۆری عەرەبەکانی « عێراق »، واز لە عەرەبێتیی خۆیان ناهێنن و عەرەبچێتیی خۆیان دەکەن. واتە: هێندەی خۆیان بە عەرەب دەزانن، هێندە خۆیان بە « عێراقیی » نازانن. لەبەرئەوە، دەوڵەتی « عێراق »، بە خاک و گەلەکەیەوە، بە بەشێ لە نیشتمان و نەتەوەی عەرەب دادەنێن. کەچیی، سەرانی پارتەکانی « کوردستان »، وەک ئەوان بیر ناکەنەوە، کوردایەتی ڕاستەقینە ناکەن، وازیان لە « کوردستانێتی » خۆیان هێناوە. واتە: لەبری ئەوەی، گەلی کورد لە « عێراق »دا، بە بەشێ لە نەتەوەی کورد و خاکی « باشوور »یش، بە بەشێ لە « کوردستان »ی مەزن دانێن، کورد بە بەشێ لە گەلی « عێراق » و « باشووری کوردستان »یش، بە بەشێ لە خاکی « عێراق » دەزانن! بۆیە هەمیشە، زاراوەی گەلی « عێراق »، لەبری گەلانی « عێراق » بەکاردێنن! جا، ئەم دوو جۆرە دید و بۆچوونە، چۆن لە یەک دەوڵەتی ناسیۆنالی عەرەبیدا، ڕێکدەکەون و یەکدەگرن؟!!

## دوژمنان و دژایەتیکردنی کورد:

نەک تەنیا هەر، عەرەبەکانی « عێراق »، بەڵکوو، هەموو عەرەب، هەر لە « ئۆقیانووس »ەوە تا بە « کەنداو » دەگا، یەک هەڵوێستی نەگۆڕی شۆڤێنیستانە و ڕەگەزپەرستانەیان، بەرانبەر بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد هەیە، ئەویش ئەوەیە، دژی هەموو جۆرە مافێکی ڕەوای کورد دەوەستنەوە!
هەشتا دانە ساڵی ڕێکە، هەر لە « ئۆقیانووس »ەوە تا « کەنداو »، لە « 95٪»ی عەرەب، هەڕەشەی مەرگ و تواندنەوە، لە گەلی کوردی هەر دوو پارچەکەی خۆراوا و خوارووی « کوردستان » دەکەن. تاوێ بە جنۆکە، تاوێکی دیکە بە نۆکەر و تاوێکی دیکەش، بە « ئیسرایل »ی دووەممان دادەنێن. ئیدی، برایەتی چی؟ چۆن برایەتی، لە نێوان دوو گەلی دژ بە یەکدا دروستدەبێ؟!! ئەوەتە، لە

---

* معهد العراق للاصلاحات و الثقافه الدیمقراطیه.

« عێراق »ی نوێی دوای « بەعس »یشدا، مافی « فیدراڵیی » جوگرافیایی و رامیاریی بە گەلی کورد رەوا نابینن، جا، ئیدی چۆن دەتوانین، بە ئاشتیی، ئاساییش، هێمنیی و تەبایی، لە چوارچێوەی یەک دەوڵەتی ناسیۆنالی عەرەبییدا بژین؟!! ئاخر، ئێمە و عەرەب، تەنیا هەر خوامان یەکە، ئەگینا، لە هێندێ دید و بۆچوونی ئایینەکەشماندا، جیاوازییمان هەر هەیە!

هەر بۆ نموونە: عەرەبەکان بە گشتیی، هێندە رقیان لە کوردە، ئەو چەن سەد کوردەی لە « جەزایر » گیرساونەتەوە و بە هەر کولەمەرگییەک بێ، لەوێ دەژین، هێندێکیان کرێکاریی دەکەن و هێندێکی دیکەشیان دەخوێنن، لە دەس پەلامار و شاڵاوی عەرەبە ناسیۆنالیست و موسوڵمانە فەناتیکەکان قووتاریان نەبووە. سەیر ئەوەیە، لەبری ئەوەی، هێزەکانی پۆلیسی ئەو وڵاتە، گەر لەسەریشیان هەڵ نەدەنێ و بە چاوێکی دادپەروەرانە، لە کێشەکەیان نەڕوانن، بە لانی کەمەوە دەبووایە، دژیان نەوەستانایە. کەچیی، ئەوانیش پەلاماریانداون و حەفدە کەسیان لێ گرتوون!

ئاخر، ئەوە ئەو گەلە شۆڕشگێڕەی « جەزایر »ە، کە کاتی خۆی، دژی ئیمپریالیزمی « فەرەنسە » دەجەنگان. رۆڵەکانی نەتەوەی کورد بە گشتیی، بە هەموو شێوەیە، پشتگیرییاندەکردن و پارەیان بۆ کۆدەکردنەوە. رامیارەکانمان، گوتاری ئاگرینیان لە سەر دەنووسین. نووسەرەکانمان، بە کورتە چیرۆک، ژان و ئازارەکانیان دەردەبڕین. هونەرمەکانمان، هۆنراوەی ناسک و جوانیان، بە سەردا هەڵدەدان. تەنانەت، لە خۆشیی کیژە عەرەبی ئازا « جەمیلە بوحەیرد »، هێندێ کوردی بێ هۆش هەبوون، کیژۆڵە ناسکە منداڵەکانیان، بە ناوی ئەو کیژە « جەزایریی »یەوە ناودەنا! بەڵێ، ئەوە ئەوڕۆ، ئەو گەل و دەوڵەتەی « جەزایر »ە، کە بە قۆناغی بزووتنەوەی رزگارییخوازی نیشتمانییدا تێپەڕبوون، بۆ سەربەخۆیی وڵاتەکەیان و ئازادیی گەلەکەیان، پتر لە یەک ملیۆن قوربانییانداوە، کەچیی، بەو شێوەیەش، لە کێشەی کورد دەڕوانن!

یا، رۆڵەکانی گەلی ژێردەسی « فەلەستین »، چەندین ساڵە، دژی داواکاریی و ئامانجەکانی کورد وەستاون، بە مەرجێ، نەک هەر کوردێ نەبووە و نییە، پشتگیریی کێشە رەواکەیانی نەکردبێ، بەڵکوو، یارمەتییەکی زۆرمان داون و خوێنیشمان بۆ رشتوون! ئاخر، ئەوە لای خۆی، ئەوڕۆ ژێردەسن و بۆ ئازادیی تێدەکۆشن، وا بەو شێوەیە، پشتگیریی هەر دوو داگیرکەری دەوڵەتی « عێراق » و « سووریا » دەکەن، ئاخۆ، گەر سبەینێ، دەوڵەتی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆیان دامەزرێنن و دەسیان هەبێ، چی بە کورد بکەن؟!!

ئەدی، بۆ باسی ڕۆڵەکانی گەلی کورد لە « خۆراوای کوردستان » نەکەین، تا ئێستەش، هیچ جۆرە مافێکی « مرۆیی، نەتەوەیی، ڕامیاریی، کەلتووریی و دیمۆکراسیی »یان نییە! ڕووداوەکانی ئەم دواییەی شاری « قامیشلیی »ش، گەواهیی قسەکانم دەدەن! سەرەڕای ئەوەش، ڕۆڵەکانی کوردی « خۆراوا »، هێندە سۆز و خۆشەویستیی خۆیان، بۆ کێشەی گەلی « فلەستین »، شۆڕشگێڕەکانی گەلی « جەزایر » دەربڕیوە و کۆمەکیان پێ کردوون، کەچیی، زۆر بێ ویژدانانە، لە شاری « عامووده »، سێسەد منداڵی کوردیان، لە سینەمایەکدا سووتاند، لە کاتێکدا دانیشتبوون، تەماشای فیلمێکی بەرگریی قارەمانانەی ڕۆڵەکانی گەلی « جەزایر »یان دەکرد، قازانجی فیلمەکەش، هەر بۆ منداڵانی « جەزایر » بوو! ئەوە جگە لەوەی، هەڵوێستی ئەم دواییانەی، دەوڵەتەکانی « سووریا، سعوودیە، قەتەر ... »، بەرانبەر بە مافی « فیدراڵیی » بۆ گەلی کورد لە « باشووری کوردستان »دا، زۆر ڕوون ئاشکرایە!

## ڕەشەخەڵک و ڕووناکبیر:

لەو ڕۆژەوە، دەوڵەتی « عێراق » دامەزراوە و « باشووری کوردستان »ی پێوە لکێنراوە، نەک تەنیا هەر عەرەبە نەخوێندەوار و ڕەشەخەڵکەکە، لە ئاستی تاوانەکانی ڕژێمە یەک لە دوا یەکەکان بە گشتیی و ڕژێمی « بەعس » بە تایبەتیی، چاویان نووقاندووە، بەڵکوو بە دەگمەن، خوێندەوار و ڕووناکبیرەکانیشیان، نووزەیەکیان لێوە هاتووە، مەگەر تەنیا هەر، ئەو چەن دەنگە کزولاوازانەمان گوێ لێ بووبێ، کە لە سەردەمە جیاوازەکانی فرمانڕەوایی دەسەڵاتدارانی عەرەبدا، دژی ڕژێمە جیاوازەکان بەرزبوونەتەوە و پتریش لە دەرەوەی وڵات، هاوارێکیان لێ هەستابێ. ئەگینا، لە ئاستی ئەو هەموو تاوانانەی دژی گەلی کورد ئەنجامدراون، لە ئاستی کیمیابارانی شارۆچکەی « هەڵەبجە » بە تایبەتیی، نێوچەی « بادینان » و شوێنەکانی دیکە بە گشتیی، بۆچی ڕۆژێ لە ڕۆژان، بۆ نموونە: یاساناسان و پارێزەرەکانی عەرەب، دەنگیان لێوە نەهاتووە؟!! کەچیی، ئەورۆ دەبینین، هەر هەمان ئەو پارێزەرانەی عەرەب، بە شێوەیەکی خۆبەخشانە، پێشبڕکێدەکەن، بۆ ئەوەی، داکۆکیی لە دڕندەیەکی کێویلەی وەک « سەددام حوسێن » بکەن. لە کەتێکدا، خۆشیان زۆر باش دەزانن، چ عەرەبێکی ڕەگەزپەرست و تاوانبارێکی خوێنڕێژە!!! ئەمە، نیشانەی ئەوەیە: ئەو عەرەبە مافناس و ڕووناکبیرانە، ئەو کارە دڕندانانەی سەرۆکە فاشستەکەیان پێ باشبووە، کە دژی گەلی کورد ئەنجامیداوە، بۆیە، بە هەموو توانایانەوە، داکۆکیی لێ دەکەن!

## سەرۆک خێڵێکی گەورەی عەرەب:

لەگەڵ ئەوەشدا، هەر دوو سەرکردە « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، لە هەڵبژاردنی « یاوەر »دا، دەستێکی باڵایان هەبووە و یارمەتییشیانداوە، تا بەو پۆستە بگا. کەچیی، لە ئاستی ئەو فرماییشتانەی، سەرۆک کۆماری کاتیی « عێراق »ی « هیوا » و « ئاشتیی »دا، دەنگ لە بەردەوە هاتبێ، دەنگ لەو دوو « جوامێر »ە و ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتەکانیانەوە نەهاتووە!

لەوەش سەیرتر ئەوەیە، لێپرسراوانی بزووتنەوەی « ریفراندۆم »یش، لە ئاستی ئەو کەللەشەکرانەی سەرۆکی خێڵی « شەمەر » شکاندی، بێ دەنگبوون، کە ڕاستەوخۆ، هەڕەشەی لەوان کردبوو! ئاخر ئێمە، لە خوێندەوار و ڕووناکبیرەکانی عەرەب، زۆر تێرمانخوارد، ئینجا، نۆرەی نەزان و سەرۆک خێڵەکانیانە، تا، بە ئارەزووی دڵی پڕ لە کینەی خۆیان، دەرد و زوخاوی هەناوی ڕەشیان، دژی داخوازییەکانی گەلی کورد هەڵڕێژن، گوتاربدەن و کاربکەن!

ئاشکرایە، کێشەی سەرەکیی نێوان هەر دوو سەرکردایەتی « پارتیی » و « یەکێتیی »، خۆی لە جیاوازیی جۆری چارەسەرکردنی گرفتی کورددا نابینێ. بەڵکوو، وەک بۆ کۆمەڵانی خەڵک ڕوونبۆتەوە، چ لە « کوردستان » و چ لە « عێراق »، کێشەکە، پتر خۆی لەوەدا دەبینێ، لە سەر کورسیی دەسەڵات و پارە بێ، تا سەر ئێسکیش، دژایەتیی یەکدی بکەن! ئەگینا، باوەڕ ناکەم، هیچ جۆرە ناکۆکیی، دووبەرەکیی، ململانێیەکی ئایدۆلۆژیایی و فەلسەفیی، لە نێوانیاندا هەبێ! لەبەرئەوە، هەر دوولایان ئامادەن، لە سەر حسێبی کێشە ڕەواکەی کورد، لەگەڵ دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا، دانوستانبکەن، بە مەرجێ، لایەکیان دەسەڵاتی پتر هەبێ، لایەنە نەیار و ڕکەبەرەکەی دیکەشیان، بێ دەسەڵات، مات، مەلوول، سووک و چرووک بێ. بۆیە، لە ئاستی جانەوەرێکی خێڵەکیی وەک « یاوەر »دا، هەر دوولایان، بێ دەنگییان بۆ خۆیان هەڵبژارد!

لە لایەکی دیکەشەوە دەبێ، ئەوە بڵێین: ئایا، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، ڕەخنەی چی، لە سەرکردەی پارتەکانی « باشووری کوردستان » بگرن، کە وەڵامی « یاوەر »یان نەداوەتەوە، لە کاتێکدا، ئەوان خۆیان، ئامانجی سەرەکییان ئەوەیە، یەکپارچەیی خاکی « عێراق » بپارێزن؟!! ئەدی، لە هەموو گوتار و گەشتەکانیاندا، بە بۆنە و بێ بۆنە، ئەم قەوانە سواوە، دەیان جار لێ نادەنەوە، ئیدی چ پێویستدەکا، شۆڤێنیستێکی وەک « یاوەر »، هەڕەشەی جینۆساید لە کورد بکا؟!!

من پێم وایە، بۆچوونەکانی سەرۆک خێڵی « سەمەر »، لەگەڵ دید و بۆچوونەکانی هەموو کوردێکی « عێراقچیی »دا، بە موو جیاوازییان نییە. تەنیا هێندە نەبێ، « یاوەر » لە جیابوونەوەی کورد دەترسێ، بۆیە هەڕەشە دەکا. بەڵام، سەرانی پارتەکان، نە بیر لە جیابوونەوە دەکەنەوە و نە دەشترسن!

جا گەر دوێنێ، سەرکردەیەکی ناوداری دەسەڵاتداری ڕووناکبیری وەک: « تاریق عەزیز »، دەربارەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی و کیمیابارانی شارۆچکەی « هەڵەبجە »، لە وەڵامی پرسیارێکدا، زۆر بە ڕاشکاویی گوتبێتی: (ئێمە چەکی کیمیاوییمان، دژی ئەو خەڵکە دواکەوتووانە بەکارهێناوە. گەر چەکی ئەتۆمییشمان هەبووایە، هەر بەکارماندەهێنا)«1»

ئەوا ئەورۆ، سەرۆک خێڵێکی دواکەوتووی نەزانی عەرەب، بە شێوەیەکی دیکە، هەر هەمان هەڕەشە لە کورد دەکا؟!! ئیدی دەبێ، چ جۆرە جیاوازییەکیان هەبێ؟!! چۆن کورد دەتوانێ، لەگەڵ برا گەورە زۆردارەکەیدا بژی؟!! لە کام دەوڵەتی « عێراق »ی « هیوا » و « ئاشتیی »دا، پێکەوە بژین؟!!

## کێشەی کورد:

پێش هەموو شتێ دەبێ؛ ئەوە بزانین، کێشەی کورد لە « عێراق »دا، کێشەی برایەتی کورد و عەرەب نییە، یا، کێشەیەک نییە، تەنیا هەر، خۆی لە بەشدارییکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت و وەرگرتنی چەن پۆستێکدا بنوێنێ. بەڵکوو، کێشەیەکی نەتەوەیی و ڕامیاریی نەبێ، هیچی دیکە نییە. چونکە، گەلی کورد، هەموو مەرجەکانی نەتەوایەتیی خۆی « زمان، مێژوو، خاک ... »ی تێدا هەیە. بەڵام، هیچ جۆرە مافێکی نەتەوەیی و دیمۆکراسیی خۆی، پێ ڕەوا نابینرێ. بۆیە، پێویستی بە چارەسەرێکی ڕامیاریی بنەڕەتیی هەیە، نەک تەنیا هەر، گوێ لە بەڵێنی درۆ و گوتاری ساختەی، سەرۆک پارت و لێپرسراوانی دەوڵەتی « عێراق » بگرێ! ئەو جۆرە چارەسەرکردنەش، تەنیا هەر، بە دیالۆگێکی گشتیی ڕاشکاوانە و ڕاستەقینەی، نێوان نوێنەرانی هەر دوو گەلی سەرەکیی کورد و عەرەب نەبێ، هەرگیز بەدی نایە.

پێویستە عەرەبەکان، پێشەکیی، دان بە هەموو مافەکانی گەلی کورددا بنێن و ئەو مافانەش، لە دەستووری هەمیشەیی دەوڵەتی « عێراق »دا تۆمارکرێ. گرنگترین شتیش ئەوەیە، سنووری جوگرافیایی « باشووری کوردستان » دەستنیشانکرێ. دان بە فیدراڵیی جوگرافیایی و ڕامیارییدا بنرێ. ئەگینا، گەر هەزاران ساڵی دیکە، کورد و عەرەب، لە سنووری ئەو دەوڵەتەدا پێکەوە

بژین، پێوەندیی نێوانیان، لە پێوەندیی نێوان داگیرکەر و داگیرکراو، چەوسێنەر و چەوساوە، زۆردار و زۆرلێکراو زیاتر، تێپەڕناکا!
ئاخر، گەر پێوەندیی ئەو دوو گەلە سەرەکییە، تەنیا هەر، بەو شێوەیە و لەو سنوورەدا دەستنیشان نەکرێ، هەرگیز ناتوانن، وەک دوو گەلی دۆست و هاوبەش، بە ئاشتیی و ئاساییش، پێکەوە هەڵکەن و بژین! چونکە، ئەزموونی مێژوویی، پتر لە هەشتا ساڵی پێکەوە ژیانیان، زۆر بە ئاشکرا، پێوەندیی کۆیلەیی نێوان کورد و عەرەبمان بۆ دەردەخا. لەبەرئەوە، تا ڕۆڵەکانی گەلی کورد، بۆ « عێراق » دڵسۆزبن، خۆیان بە برا پچووک و عەرەبیش بە برا گەورە بزانن، ئەوا ئەوان، هەر بە چاوی نۆکەر و پیاوی بیانیی لێیان دەڕوانن!
هەروەها، هەر کاتێکیش، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، هۆشێکیان بەبەرداهاتبێتەوە، لە چوارچێوەی دەوڵەتی « عێراق »دا، داوای مافە ڕەواکانی خۆیان کردبێ، نەک داوای جیابوونەوەیان کردبێ، ئەوا، بە ناپاک، نۆکەری « ئیسرایل » و بەرەی خۆراوایان داناون! ئیدی، چۆن برایەتی کورد و عەرەب، لە دەوڵەتێکی فرەگەل و نیشتمانی خاوەن دەسەڵاتێکی دیکتاتۆریی و شۆڤێنیستدا، سەردەگرێ و سەردەکەوێ؟ کامەیە ئەو برایەتییەی، سەرانی پارتەکانی « باشووری کوردستان »، چەپڵەی بۆ دەکوتن، لە پێناویدا، کچی کورد، بە قوربانی کوڕی عەرەب دەکەن؟!!

## دوا ئێسگە:

ئەوەتەی دەوڵەتی « عێراق » داتاشراوە، هەر دەستە و تاقمێ هاتبن، یەک لە یەکی خراپتربوون. خۆزگە بمزانیایە، کەی دەستە و تاقمێکی دیکە دێن، دەوڵەتی « عێراق »ی نوێی « هیوا » و « ئاشتیی »مان بۆ دادەمەزرێنن، هەر وەک سەرانی پارتەکانی « باشوور »، بانگەشەی هەڵخەڵەتێنەرانەی بۆ دەکەن، خەونی سەوز و سووری پێوە دەبینن!!!
گەر گەلی عەرەب، هەموو گرفتەکانیان لە « عێراق »دا چارەسەرکەن، دەسیان ئاواڵەبێ و هێزیان هەبێ، باوەڕ ناکەم، مافی کەلتووریش، بە کورد ڕەوابیبنن! بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەش، گەر چاوێ بە گوتاری ڕامیاریی بەرپرسارانی پارت و لێپرسراوانی دەوڵەتی « عێراق »دا بخشێنین، لە ماوەی ئەم هەشتا ساڵەدا، چ ژارێکیان، بەرانبەر گەلی کورد هەڵڕشتووە، ئەو کاتە، بە تەواویی بۆمان ڕووندەبێتەوە، مەبەستیان چییە و بە چ جۆرێ، دژایەتیی کورد دەکەن! مەگەر هەر تەنیا، چەن ڕووناکبیر و نووسەرێکی پێشکەوتووخواز، فشەمافێکیان بە کورد ڕەوابیبینێ. ئەوانیش، لە نێو کۆمەڵگە دواکەوتووەکەی

خۆیاندا، سەنگ و کێشێکی ئەوتۆیان نەبووە و نییە، دەنگیان نابیسرێ و ڕەنگیان نابینرێ!
گەر لە دوارۆژێکی نزیکدا، دەوڵەتی « عێراق » لە لایەن هێندێ ناسیۆنالیستی عەرەب، یا، ئیسلامی ڕامیارییەوە بەڕێوەبچێ، ئایا، چ جیاوازییەکی، لەگەڵ « عێراق »ی سەردەمی « بەعس » و « سەددام »ی عەرەبدا دەبێ؟!! ئایا، پێویست نییە، سەرکردایەتیی هەر دوو پارتی فرمانڕەوا، هەر لە ئێستەوە، بیری لەو ڕۆژەڕەشە بکەنەوە، تا درەنگتر نەبووە، ڕیزەکانی گەلی کورد ڕێکخەن، بۆ ئەوەی، هەموو ڕۆڵەکانی گەل، یەک دەنگ و یەک ڕەنگبن، داوای سەربەخۆیی تەواو بکەن و دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆیان دامەزرێنن؟!! چونکە، مەحاڵە کورد بتوانێ، لەگەڵ ئەو هێزە فاشیست، شۆڤێنیست، ڕەگەزپەرست و فەناتیکانەدا بژی!
ئاخر، هەشتا دانە ساڵی ڕەبەقە، باخ و گوڵزارەکانی دەوڵەتی « عێراق »، بە خوێنی ئاڵ و گەشی لاوانی کورد ئاودەدرێ. ئەورۆ، نۆرەی ئەوە هاتووە، خوێنی هەموو لایەنەکانی « عێراق » بڕژێ و وەک ڕووبار، لەبەری بڕوا. نۆرەی ئەوە هاتووە، ئەم جارەیان، لە « عێراق »ەوە، بە خوێنی ڕۆڵەکانی عەرەب، گوڵاڵەسوورەی دەشت و کێوە سەرکەشەکانی « کوردستان » ئاوبدرێ، تۆڵەی بەرودوایان لێ بکرێتەوە و خونچەی هیوای کورد بگەشێتەوە!
چونکە، ئەو ڕووباری خوێنەی ئەورۆ، لە بەر جەستەی شار و شارۆچکەکانی « بەغدا، ڕومادیی، مووسڵ، سامەڕا، فەلووجە، بەعقوویە ... » دەڕوا، هەمووی کۆکەیتەوە، هێشتا، بەرانبەر کیمیابارانی « کوردستان » و ئەنفالکردنی سەر و ماڵی ڕۆڵەکانی گەلی کورد نابێ! ئاخر، لەو نێوچانەی جەنگ و پێکدادانی سەربازیی تێدا هەیە، جگە لە چەن گرووپێکی کۆنە « بەعسیی »، ئیسلامی ڕامیاریی و تیرۆریستی نێودەوڵەتیی، کەسی دیکەیان تێدا نییە. جا گەر هەر کوردێ، پێی ناخۆشبێ و فرمێسکی گەرم، بۆ ئەو تاوانبار و فاشستانە بڕێژێ، کاتێ لێیان دەکوژرێ و پاکتاودەکرێن، دیارە، لەگەڵ ئەواندا، هیچ جۆرە جیاوازییەکی نییە و لە سەنگەری بەرەی دوژمنانی گەلی کورددا، خۆیان دەبیننەوە، لە ژێر هەر ناو و بە هەر بڕەبیانوویەکیشەوە، داکۆکییان لێ بکا، هیچ لە ناوەڕۆکی باسەکە ناگۆڕێ!
ئاخر، سەیرەکە پتر لەوە دایە، ڕۆژی « **2004 .11 .06** »، کەناڵی ئاسمانیی « ئەلعەرەبیە » ڕایگەیاند: « **26** » پیاوی ناوداری ئایینیی « شانشینی عەرەبستانی سعوودیە »، بڵاڤۆکێکیان دەرکردووە، پشتگیریی خۆیان، بۆ هێزەکانی بەرگریی « عێراق » دەربڕیوە. گوایە: هێزەکانی « ئەمێریکا » و

ماوپەیمانەکانی، ماڵ و مزگەوت دەڕوخێنن، ژن و منداڵ دەکوژن! لەبەرئەوە، داوایان لێ کردوون، واز لە جەنگی نێوخۆ بێنن، ڕیزەکانی خۆیان یەکخەن و دژی سوپای داگیرکەری « ئەمێریکا » بجەنگن! کەچی، کاتێ عەرەبە موسوڵمانە « بەعسیی »یەکان، لە ماوەیەکی کەمدا، بە چەندین جۆر چەکی کیمیاویی، « 5 » هەزار مرۆڤی کوردی بێ دەسەلاتیان، لە شـــارۆچکەی « هەڵەبجە » قڕکرد، بە ناوی ئایەتەکانی « قورئان »ەوە، « 182 » هەزار ژن و منداڵیان ئەنفالکرد، پتر لە چوار هەزار گوندیان، لەگەڵ زەویدا ژێروژوورکرد، بە هەزاران مزگەوتیان ڕوخاند و بە میلیۆنان قورئانیشیان سوتاند، ئەو موسوڵمانە مێشک پووتە شۆڤێنیستانە، دەنگیان لێوە نەهات! دیارە، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، بە موسوڵمان نازانن، مزگەوتەکانی « کوردستان »، بە جێی بتپەرستیی دادەنێن، قورئانەکانیش، بە پــەرتووکە پیرۆزەکانی ئایینی « زەردەشتیی، یەزدیی و کاکەیی » دەزانن!
لە کۆتاییدا دەڵێم: هەموو تاکێکی عەرەب، سەبارەت بەو تاوانانەی، بەرانبەر بە ڕۆڵەکانی گەلی کورد کراوە و دەکرێ، تاوانبارن، چونکە، کۆمەڵێکی کەم نەبێ، دژی چەوساندنەوەی گەلی کورد، دەنگیان بەرزکردۆتەوە، کەسی دیکە دەنگی لێوە نەهاتووە!*
لەبەرئەوە، ئەز، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: گەر ڕۆڵەکانی گەلی عەرەب، مافی ژیان و سەربەخۆیی تەواو، بە ڕۆڵەکانی گەلی کورد ڕەوا نەبینن، دان بە مافی چارەنووس و دامەزراندنی دەوڵەتێکی « کوردستانیی » سەربەخۆدا نەنێن، چەن خۆیان بە دۆستی کورد بزانن، چەن موسوڵمان بن، ئەز، بە دوژمنی سەرەکیی خۆم و گەلەکەمیان دەزانم، جا با پێوەندیی ئایینییش، پێکمانەوە ببەستێ! چونکە دەبێ، ڕێزی بەرابەری لە نێواندا هەبێ، ئەو مافانەی ئەوان، بە خۆیانی ڕەوادەبینن، بە ئێمەشی ڕەواببینن!
دەبا ئیدی، سەرکردەی پارتەکانی « باشوور »، چی دیکە لەوە پتر، بە قەوانی سواوی برایەتی درۆزنانەی، نێوان هەر دوو گەلی عەرەبی داگیرکەر و گەلی کوردی داگیرکراو، ڕۆڵەکانی گەلی کورد نەخەڵەتێنن! بۆچی، عەرەب و عەرەب لە « عێراق »، کورد و کورد لە « باشووری کوردستان » بران، تا، هەر دوو گەلی کورد و عەرەب، لە « عێراق »دا برابن؟!! ئەز پێم وایە، هەر دوو گەلی عەرەبی چەوساوەی « فلەستین » و چەوسێنەری « ئیسرایل »، چەن بران، کورد و عەرەبیش لە « عێراق »دا، هەر هێندە بران!!!

* لە گوتاری داهاتوودا، لەو بارەیەوە، باسێکی تایبەتیی، پێشکەش بە خوێنەرانی هێژا دەکەم!

ئاخر، هەر کوردێ، کەمێ دڵسۆزی خاکی نیشتمان و ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆی بێ، تا چاو لێکدەنێ و لە ژیاندابێ، چۆن ژانی کیمیابارانی شارۆچکەی « هەڵەبجە »ی، لە دڵ دەردەچێ؟!! ئاخر، هەر کوردێ، کەمێ بە ئەمەکبێ، تا لنگی جووتدەکا و ملی لاردەبێتەوە، چۆن چزووی ژاراویی ئەنفالەکان، لە ناخی دەروونی دەردێ؟!! ئاخر، کەی سەرکردەکانی کورد، لە تۆڵەی هەموو ژان و ئازارەکانی هەشتا ساڵی داگیرکردن و چەوساندنەوەی کورددا، لەم ژنە سۆزانییەی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » جیادەبنەوە؟!! تۆ بڵێی، دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، ئەو مامرە قەڵەوەبێ، هەموو ڕۆژێ، هێلکەیەکی زێڕین، بۆ ڕۆڵەکانی گەلی کورد بکا، وا سەرانی پارتەکانی « باشوور »، دەسیان لێی نابێتەوە!

1. المنار الكوردي، العدد **53**، لندن، ئاب **1998**.

# سەرانی پارتەکانی « باشوور »

# و

# دۆستەکانی کورد!

هەر وەک چۆن، لۆمەی هیچ عەرەبێکی دەشتەکیی و خێڵەکیی دواکەوتوو، هیچ عەرەبێکی شارنشین و شارستانیی پێشکەوتوو ناکەم، گەر، تا سەر مۆخ و ئێسک عەرەببن، چونکە، مافێکی ڕەوای سروشتیی خۆیانە و خوا بە عەرەبێتیی ئەفراندوونی! هەروەها، لۆمەی هیچ ڕامیارێکی عەرەبیش ناکەم، گەر « عێراقیی » بن و هەوڵبدەن، ئەو سنوورە دەسـکردەی ئیمپریالیزمی « بریتانیا »، بۆی دروستکردوون، بیپارێزن، چونکە، قازانجێکی زۆریان لێ کردووە!

بەڵام، ئەک هەر لۆمەی کوردێ دەکەم، باوەڕی بە خۆی و نەتەوەکەی نەبێ، باوەڕی بەو سنوورە دەسکردانەی نێوان خاکی « کوردستان » و دەوڵەتە داگیرکەرەکان بە گشتیی، « باشووری کوردستان » و دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » بە تایبەتیی هەبێ، بەڵکوو، گاڵتەشم بەو کوردە گوندنشینە دواکەوتوو و کوردە شارنشینە پێشکەوتووە دێ، پێش ئەوەی، خۆی بە کورد بزانێ، خۆی بە هەر شتێکی دیکە دانێ. چونکە، ئەویش وەک عەرەبەکە، خوا بە کوردێتیی ئەفراندوویەتی!

هەروەها، ئەو رامیارە کوردەی، خۆی بە « کوردستانیی » نەزانێ، داکۆکیی لە بوونی کورد و خاکی « کوردستان » نەکا، نەک هەر خۆی بە « عێراقیی » بزانێ، بەڵکوو، گەر خۆی بە خەڵکی نێو مانگیش دانێ، ئەوا نە دەتوانێ، ڕاژەی گەلەکەی خۆی و گەلی عەرەب بکا، نە ئەمەکی بۆ « کوردستان » دەبێ، نە « عێراقیی »یەکی تەواو دەردەچێ، نە ڕامیارەکانی عەرەب و سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکەی « عێراق »یش، باوەڕییدەکەن! چونکە، گەر وابێ، وەک دەڵێن: لە کوردەکەی هەر دوو جێژن دەبێ، هەم باوەڕی کۆمەلانی خەڵکی کورد دەدۆڕێنێ، هەم عەرەبە داگیرکەرەکانیش، ڕێزی لێ ناگرن!

ئاخر، گەر هەر عەرەبێکی خەڵکی « عێراق » و « سووریا »، یا، هەر توورکێکی دانیشتووی « توورکیا »، یا، هەر فارسێکی نێو دەوڵەتی « ئێران »، کوردیان خۆشبویستایە، ڕەخنەیان لە کردارە چەپەڵ و دڕندانەکانی سەرکردەکانیان بگرتایە، دژی هەستی نەتەوەیی شۆڤێنیستیی نەتەوەی بالادەس بوەستانایە، هەڵوێست و کردەوەکانیان لەقاوبدانایە، پشتگیریی بزووتنەوەی گەلێکی بندەسی چەوساوەی وەک کوردیان بکردایە، جگە لەوەی، ئەرکێکی مرۆپەروەریی و دێموکراسیی، سەر شانی خۆیان جێبەجێدەکرد، بە مرۆیەکی بەرچاوڕوون و پێشکەوتووخوازیش دەناسران. ئەو کاتەش، نەک هەر لای من، بەڵکوو، لای هەموو ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، لە گەورەترین ڕامیار و سەرکردەی کورد، ڕێز و پلەوپایەیان پتردەبوو!

بەلام، گەر هەر کوردێکی بێ هەست و هۆشی نەتەوەیی، پێش ئەوەی، خۆی بە خەڵکی « کوردستان » بزانێ، شانازیی بە « عێراقیی »بوونی خۆیەوە بکا، بە سەر دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا هەڵدا، پتر هەوڵ بۆ کۆیلەکردنی خۆی و ژێردەسکردنی گەلەکەی بدا، بەردی بنچینەی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرە قایمتر کا، سنوورە دەسکردەکەی نێوان، هەر دوو وولاتی « باشووری کوردستان » و « عەرەبستانی عێراق »، پتر بپارێزێ و پێکیانەوە ببەستێتەوە، خەبات بۆ ڕزگاربوونی خۆی، سەربەستیی کورد و سەربەخۆیی خاکی « کوردستان » نەکا، تا ماوە، هەوڵبدا، هەر لە چوارچێوەی گرتووخانە تاریکونووتەکەکەی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرەدا بمێنێتەوە، ئەوا، وەک ئەو کۆیلەیە وایە، کە « لینین » باسیکردووە و نووسیویەتی:

(کۆیلەیەک لۆمە ناکرێ، گەر بە کۆیلەیی لەدایکبێ. بەلام، کۆیلەیەک نەیەوێ، سەربەستبێ و لە سەروو ئەوەشەوە، پاکانە بۆ کۆیلەیی خۆی بکا و بیرازێنێتەوە، ئەو جۆرە کۆیلەیە، سووک و بێ بایەخە، بە ڕاستیی، هەستی ڕقوکینە و بێزاریی دەبزوێنێ.)«174،4»

ڕاستیان فەرمووە: « چەم بێ چەقەڵ نابێ ». بەڵام، چەمی هیچ داگیرکەرێ، هێندەی چەمی داگیرکەرانی « کوردستان »، چەقەڵی زۆر نەبووە و نییە!
لە ڕاستییدا، زۆربەی هەرە زۆری، ڕۆڵەکانی نەتەوە داگیرکەرەکان بە گشتیی، خوێندەوار و ڕووناکبیرەکان بە تایبەتیی، دژایەتی بزووتنەوەی کوردایەتیی و کێشە ڕەواکەی دەکەن. لە هەمان کاتیشدا، دۆستەکانی کورد و دێمۆکراسییخوازەکان، لە نێو نەتەوە باڵادەسەکانی « توورک، عەرەب و فارس » دا، ژمارەیان هێندە کەمە، بە پەنجەی دەس دەژمێررێن! لەبەرئەوە پێویستە، دۆستەکانی نەتەوەی کورد، لە دوژمنەکانمان جیاکەینەوە، هەر لایەنەیان، مافی تەواوی خۆیان بدەینێ و ڕێزێکی زۆر، لە دۆستەکانمان بگرین و هەوڵی پترکردنیان بدەین.
لێرەدا دەبێ، دان بەو ڕاستییەشدا بنێم، لە نێو نەتەوە داگیرکەرەکاندا، هێندێ دۆستمان هەیە، گەلێ لە سەرکردەی پارتەکانی « باشوور »، باشتر بیر لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد دەکەنەوە و مافی پترمان پێ ڕەوا دەبینن!
ئاخر، گەر تەنیا هەر، باسی کورد و بیانیی بکەم، من چۆن دەتوانم، لە لایەکەوە، جیاوازیی لە نێوان چەن توورکێکی مرۆپەروەری دێمۆکراسییخوازی پێشکەوتووخوازی وەک پرۆفیسۆر « ئیسماعیل بێشکچیی » و « ئەکین بیردال »ی سەرۆکی مافی مرۆڤ لە « توورکیا »، لە لایەکی دیکەشەوە، هەر دوو سەرکردەی پارت « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »دا نەکەم؟!! چونکە « بێشکچیی »، چەندین جار، لە بەرهەمە نایابەکەیدا « کوردستان کۆلۆنیایەکی نێودەوڵەتییە »، زۆر بە ڕاشکاویی نووسیوێتی:
(« کوردستان » لە نێوان دەوڵەتەکانی « توورکیا، ئێران، عێراق و سووریا »دا دابەشکراوە، کۆلۆنیایەکی هاوبەشە و ئەو داگیرکەرانە، لە تواندنەوە و تێوبڕکردنی کورددا، بەرژەوەندییان یەکە!) «1،26-54»
کەچیی، سەرکردە کوردەکانی زۆربەی پارتەکان بە گشتیی و ئەو دوو پارتەی « باشووری کوردستان » بە تایبەتیی، پێیان وایە: ئەو چوار دەوڵەتە، چەن دەوڵەتێکی داگیرکەر نین و بە نیشتمانی خۆیانی دەزانن!
ئاخر، ئەز چۆن جیاوازیی، لە نێوان چەن عەرەبێکی مرۆپەروەری دێمۆکراسییخوازی بەرچاوڕوونی، هێندێ مامۆستای وەک: « عەزیز شەریف، کامیل چادرچی، هیلال ناجی، د. مونزیر ئەلفەزڵ، د. کازم حەبیب، پرۆفیسۆر عەبدول ئیلا ئەلسایغ، د. ئەحمەد ئەبو مەطەر، زوهێر کاظم عەبوود ... » و سەرکردەی پارتەکانی « کوردستان »دا نەکەم؟!! چونکە،

یەکـــێکێی وەک « عـــەزیز شـــەریف »، باوەڕێکی تەواویی، بە ئازادیی و سـەربەخـۆیی « کـوردسـتـان » هەبووە، لە پەنجاکـاندا، زۆر بە ڕاشکاویی، دەربارەی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » نووسیویێتی: (یەکێتی « عێراق » یەکـێـتـیـیـەکـە، لە لایەن ئیـمـپـریالیزمی « بریتـانیـا »وە درووسـتـکراوە. ئەو یەکێتییە، بۆ سەرکووتکردنی بەردەوامی پۆلیس و سوپا بەڕێوە ناڕوا. یەکێتی کـۆت و زنجـیـر، کـەلەپچـە و پێـوەندە. هەمـوو هەوڵدانێ بۆ بەردەوامـبـوونی، هەوڵدانە بۆ بەردەوامـبـوونی ڕامـیـاریی ئیـمـپـریالیـزم، کـە پێـوەندییـەکی کۆیلەییـیە ... تەنیا ڕێی ڕاست، بۆ ژیاندنەوەی باوەڕ، لای جـەمـاوەری گـەلی کـورد و نزیکخسـتنەوەیان لە جەمـاوەری عـەرەب، پشـتـگـیرییکردنی جەمـاوەری عەرەبە لە مافی چارەنووسی نەتەوەی کورد ...)«42،5»

کەچیی، سەرکردەی پارتەکانی « باشوور »، هەر ناوێرن بە پەرێزی ئەو جۆرە لێدوانانەشدا بچن، بەڵکوو، تەنیا هەر باسی « عێـراق »ی خۆشـەویسـت و داوای « ئۆتۆنۆمیی ــ فیدراڵیی » بۆ کورد دەکەن!

ئاخـر، چۆن جیـاوازیی، لە نێوان سـەرکردەیەکی عـەرەبی وەک « موعـەممەر قـەززافـیی » و سـەرانی پارتەکـاندا نەکـەم؟!! چونکە، ئەو چەندین جـار، یارمـــەتیی کـوردی داوە، داوای سـەربەخـۆیی و دامـەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی بۆ کـورد کـردووە، لە یەکێ لە گـوتارەکـانیـشـیـدا، زۆر بە ڕوونیی گوتوویەتی: (چارەسـەری کۆتایی کێشەی کورد، بە دەوڵەتێکی سەربەخـۆ لە سـەر خـاکی « کـوردسـتـان » ــ خـاکی نەتەوەی کـورد ــ دەکرێ ...)«223،2»

کەچیی، سەرانی پارتەکان، ئەو مافە بە کورد ڕەوا نابینن و کاتێکیش، گوێیان لەو جۆرە گوتارانە دەبێ، تەنیا هەر، بزە دەیانگرێ!

ئاخـر، زۆر جێی سەرسووڕمـانە، کـاتێ ڕژێمی فـاشـیی « بەعس » ڕوخـا، دەوڵەتی « عێراق » هەڵوەشـایەوە، ســـــــەرۆکی دەوڵەتێکی عـەرەبیی وەک: « قـەززافـیی »، ڕۆڵەکـانی نەتەوەی کـورد هانـدا، دەوڵەتی تایبـەتیی خـۆیان دامـەزرێنن! کەچیی، هەر دوو سـەرکردەی پارت « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، لەبری ئەوەی، ئەو هەلە زێرینە مـێـژوویـیـە، لەکـیس کـورد نەدەن، خـۆیان کۆکردەوە، تا توانیـان، گورپیانبەسـتـەوە، بەرەو « بەغدا »ی پێتەختی خوێن و تاوان ڕایانکرد، تا هێزە ڕامیارییە عەرەبییەکانی « عێراق »، لەگەڵ یەکدیدا ڕێکخەنەوە و بنچینە سەرەکییەکانی دەوڵەتی « عێراق » دامەزرێننەوە!

جگە لە هـەموو ئەوانەش، هەر زۆر زوو، سـەردانی ئایەتوڵڵا « سیـسـتـانیی » دواکەتووی کۆنەپەرستی ڕابەر و دەمڕاستی « شیعە »کانیان کرد، زۆر بە ئاشکرا، شانازییـیـان بە « عێراقچێتیی » خۆیانەوە دەکرد، هەمـوو هەوڵ و

توانایەکی خۆیان، بۆ داکۆکییکردن لە دەوڵەتی نوێی « عێراق »ی « هیوا » و « ئاشتیی » بەکەرخست، داوای گەڕانەوەی بە پەلەی « دەسەڵات » و « سەروەریی » تەواویشیان بۆ دەکرد!
ئاخر، کەس دیوێتی، مرۆڤێ، لە گرتووخانەیەکی پچکۆلانە و تاریکدا بێ، ڕۆژانە، بە خراپترین شێوە ئازاربدرێ، شەوانە، خەو لە چاوانی بتورێنرێ، هەمیشە، نان و شەقی دەرخواردبدرێ، سووکایەتیی پێ بکرێ، کەچیی هێشتا، هەر داوای سەرفرازیی و سەرکەوتن، بۆ پاسەوان و فرمانبەرە بێ ڕەوشت و بێ ویژدانە دڕندەکانی، گرتووخانەکەی خۆی بکا؟!! مەگەر ئەو مرۆڤە، شێتێکی پەتەڕیبێ و لە مەرگی خۆی بێزاربێ!
ئاخر، چۆن زانا و ڕامیارێکی عەرەبی وەک دوکتۆر « مونزیر ئەلفەزڵ »، لەگەڵ « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »دا، بە یەک چاو تەماشابکەم، لە کاتێکدا، ئەو بێ ترس و لەرز، بێ سڵەمینەوە و منجەمنجکردن، بە تەواویی، دان بە « کوردستانێتیی » هەموو نێوچە بەعەرەبکراوەکانی وەک: « کەرکووک، خانەقین، شەنگار .. »دا دەنێ. کەچیی، ئەمان تا سەر، لە سەر یەک قسە نامێننەوە، ڕووڕوو پەشیماندەبنەوە، هەر ڕۆژەی ناوێ لە شاری « کەرکووک » دەنێن، ناوێ بە « دڵ »، ناوێکی دیکە بە « قودس »، ناوێکی دیکە، بە شاری « برایەتیی » و ناوێکی دیکەش، بە شارێکی « عێراق »ی دادەنێن!
هەروەها، ڕۆژی « **2004. 06. 30** »، دوکتۆر « مونزیر ئەلفەزڵ »، لە شاری « هەولێر »، لە کۆڕێکدا گوتی: ڕۆڵەکانی گەلی « عێراق » نابێ، لە تاوانبارەکانی ڕژێمی « بەعس » خۆشبن، بەڵکوو دەبێ، دادگاییبکرێن و بە سزای دادپەروەرانەی خۆیان بگەیەنرێن، تەنانەت، هێندێکیشیان دەبێ، لەسێدارەبدرێن. چونکە، تاوانێکی زۆریان، بەرانبەر خەڵکی « عێراق » نواندووە، کیمیابارانی شارۆچکەی « هەڵەبجە »یان کردووە، بە هەزاران کوردیان، لە « ئەنفال »ەکاندا کوشتووە، هەروەها، پێکهاتەکانی دیکەی گەلی « عێراق »یش، لە دەس ئەو تاوان و کوشتنوبڕینە دەر نەچوون!
کەچیی، سەرۆکی « پارتی دێمۆکراتی کوردستان »، بیرۆکەی لێبووردنی گشتیی و ئاشتبوونەوەی نیشتمانیی ڕادەگەیەنێ، لە شاری « هەولێر »، کۆنگرە دەگرێ و داوای ئاشتبوونەوەی گشتیی دەکا! تەنانەت، ئاشتبوونەوە لەگەڵ ئەو « بەعسیی »یانەی، دەسیان بە خوێنی کورد سووورە! ئاخر کە دەڵێم: یەکێ لە گرفتە هەرە سەرەکییەکانی کێشەی کورد، پێوەندیی بە گرفتی « سەرکردایەتیی »یەوە هەیە، نانخۆرەکانیان هاواریان لێ هەڵدەسێ و دەڵێن: سەرکردەکانی کورد، زۆر تێگەیشتوو و دووربینن، دەزانن، چی دەکەن

و چۆن هەنگاودەنێن! بەڵام، من پێم وایە، هەرچی بارگەی شۆڕشگێڕیی هەیە، تێیاندا نەماوە!
کەواتە: بە ئەمانەدا بۆمان ڕووندەبێتەوە، تەنیا کوردبوون، بێ هەستێکی خاوێنی بێ گەردی کوردانە، بێ هۆشێکی بەرزی نەتەوەیی، بێ هوشیارییەکی پێگەیشتووی ڕامیاریی، گرنگ نییە، هیچ شتێ بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد ناکا و هیچیش، پێشکەش بە خاکی « کوردستان » ناکا. بەڵکوو، هەر مرۆڤێکی بە ویژانی « توورک، عەرەب و فارس »، گەر خاوەنی ئەو هەستە بەرزە مرۆیی و دیمۆکراسییە بێ، باوەڕی بە مافە ڕەواکانی چارەنووسی گەلان هەبێ، لەگەڵ کێشەی نەتەوەیی و ڕامیاریی کورددا، بە شێوەیەکی دیمۆکراسییانە هەڵسوکەوتبکا، ئەوا، گەلێ لە ڕامیار و سەرکردەی پارتەکانی « کوردستان » باشتر و دڵسۆزترە، پتریش، قازانج بە کێشەی نەتەوەیی و گرفتە ڕامیارییەکەی کورد دەگەیەنێ!
تۆ بڵێی، سەرانی پارتەکانی « باشووری کوردستان »، هەستی نەتەوەیی، هۆشی « کوردستانیی » و هوشیاریی ڕامیارییان، لە ئاستی بتی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا تاسابێ، وا بەو شێوەیە، شانازیی بە « عێراقیێتیی » خۆیانەوە دەکەن، وەک « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، لە هەموو بۆنە و گوتارەکانیاندا دووبارەیدەکەنەوە؟!! تۆ بڵێی، لە زیرەکیی و بلیمەتیی، یا، لە گەمژەیی و گێژیی خۆیان بێ، وا داوای گەڕانەوەی « دەسەڵات » و « سەروەریی » تەواو، بۆ دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » دەکەن و ڕۆژی « 2004. 06. 28 »، بە ڕۆژێکی مێژوویی دادەنێن؟!!
ئەو « عێراق »ەی ئێستە، لە مرۆیەکی لاوازی نەخۆشی پەککەوتەی بێ دەسەڵات دەچێ، ئەمان دەیانەوێ، بە خۆراکی خاوێنی کوردیی چاکیکەنەوە، قەڵەویکەنەوە، بازووی ئەستوور و بەهێزکەنەوە، جارێکی دیکە، قامچی دەسەڵاتی پێ ببەخشنەوە، پاشووی ڕۆڵەکانی گەلی کوردی بۆ بکەنەوە و بڵێن: فەرموو، دەی برای گەورەی عەرەبم، تا دەتوانی، بە ئارەزووی خۆت لێیدە و بیرازێکە! فەرموو، هەشتا ساڵە، چیت لە ڕۆڵەکانی کورد کردووە، ڕامەوەستە، هەر بەردەوامبە، ئەندامەکانی جەستەیان ڕاهاتووە، وەک بەنگکێشیان لێهاتووە، گەر بە قامچی برایەتیی لێیان نەدەی، ئازاری برینەکانیان دانامرکێتەوە، خەو لە چاویان ناکەوێ، گیانیان ئارام ناگرێ، دڵیشیان ئۆقرە ناگرێ و خورپەی خۆشیی پێدا نایە! ئەی برای گەورەم! گەر سامانی « کوردستان » تاڵان نەکەی، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، پاروویە نانی وشکی « کوردستان »یان بۆ قووت ناچێ! گەر دەس بۆ ئابرووی کیژ و ژنانی

کورد نەبەی، ئۆخەی ناکەن! جا گەر رامیار و سەرکردەی پارتەکانی گەلێکی بندەس و چەوساوە وابن، ئیدی، من و هاوزمانەکانم، گلەیی چی لە داگیرکەران بکەین! ئاخر، « بێکەس »ی هۆنەر و شۆڕشگێڕ، هەروا بە خۆڕایی نەیگوتووە:

ئەم کوردە گوردە، ئێستا کە بێ کەس و هەژارە
ملی بۆ شیری دوژمن، خوار و کەچ و لەبارە
قەومێکی هێند نەبەردە، یەکی بەشی هەزارە
خوا گەورەکانی بگرێ، بێ کەڵک و هیچ نەزانە «22،3»

ئاخر، دوای « شێخ مەحموودی حەفید » لە « باشووری کوردستان »، کام سەرکردەی کورد، داوای سەربەخۆیی تەواو و دامەزراندنی دەوڵەتێکی « کوردیی » کردووە، تا بزانین، کاردانەوەی کورد خۆی، دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، دەوڵەتەکانی دیکەی ناوچەکە و جیهان چۆن دەبێ؟!!

ئایا، سەرانی پارتەکانی « باشوور » دەیانەوێ، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، هەموو ڕۆژێ، چەن جارێ بمرن، یا، لە پێناوی ڕزگاریی و سەربەخۆیی تەواودا، تەنیا هەر یەک جار بمرن؟!! ئایا دەیانەوێ، تامەتایە، کوردی برا پچووک ژێردەسبێ و عەرەبی برا گەورەش، هەر داگیرکەربێ؟!! ئایا دەیانەوێ، بە دەیان « هەڵەبجە »ی شەهید و « بادینان »ی برینداری دیکە دووبارەکەنەوە؟!! ئایا دەیانەوێ، چەندین « ئەنفال »ی دیکە، دژی گەلی کورد جێبەجێکرێ؟!!

ئاخر، ئەوەتە ئەو « یاوەر »ە شۆڤێنیست و دواکەوتووە، مافی پرۆسەی « ریفراندۆم »، بە ڕۆڵەکانی گەلی کورد ڕەوا نابینێ، ئیدی، لە پای چی، « مەسعوود بارزانیی » دەهۆڵی بۆ دەکوتێ و بە سەرۆک کۆمارێکی باشی دادەنێ؟!! لە پاش چی، قایلدەبێ، « نەسرین بەرواریی » ژنە کوردی خوێندەوار، بۆ « یاوەر »ی دواکەتووی دوو ژنە، لە پەردەی زاوایی کرێ؟!! ئایا، ئەوە قازانجی گەلی کوردی تێدا هەیە، یا، دەسکەوتی بنەماڵەی تێدا ڕەچاوکراوە؟!! ئایا، ئەوە سووکایەتیی نییە، بە گەلێکی بندەس دەکرێ، نوێنەرەکەی لە « بەغدا »، بەو شێوەیە ئەتککرێ؟!! ئایا، گەر « نەسرین »ی شالیاری کورد، « بەرواریی » نەبووایە و « بارزانیی » بووایە، « مەسعوود بارزانیی » قایلدەبوو، ئەو کیژە کوردە نازدارە، لەو ئاژەڵە چوارپێ عەگال بەسەرە مارەکرێ؟!! بە ڕاستیی، گەر « بارزانیی »پێی وابێ، « شێخ یاوەر » دۆستی کوردە، زۆر بە هەڵەدا چووە!

* * *

سەرچاوەکان:

1. اسماعیل بیشکجی، کردستان مستعمره دولیه، ترجمه زهیر عبد الملک، الطبعه الاولی، مطبعه APEC، سوید، 1998.
2. جەمال نەبەز، بیری نەتەوەیی کوردی، چاپی1، بنکەی چاپەمەنی ئازاد، سوید، 1984.
3. دیوانی بێکەس، ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا، چاپخانەی ئۆفیستی بابان، سلێمانی، 1999.
4. ڤ. ئ. لینین، المختارات، بصدد کرامه الروس القومیه، دار التقدم، موسکو، 1969.
5. عزیز شریف، کراس المساله الکردیه فی العراق، الطبعه الثالثه، 1987.

تێبینی:

دوکتۆر «مونزیر ئەلفەزل»، بە یەکێ لە دۆستە باشەکانی نەتەوەی کورد دەژمێررێ و هاوسەرەکەشی «کوردە نەمین»، ژنێکی تێکۆشەری کوردە. لەبەرئەوە، قووڕسایی و ڕێزێکی زۆری، لە نێو ڕیزەکانی نەتەوەی عەرەبدا نییە!

# ئازایەتیی

# و

# کۆیلایەتیی!

ئەوەتەی تاڵی ڕەش و سپی، لە یەکدی جیادەکەمەوە، زۆربەی نووسەر، هۆنەر، هونەرمەند، ڕامیار و کوردپەروەران، لەو باوەڕەدابوون، گوتوویانە و نووسیویانە: گوایە، کورد نەتەوەیەکی ئازایە و بە شۆڕەسووارانی نێوچەی «خۆرهەڵاتی نێوەڕاست» ناویدەرکردووە! بەڵام، من پێم وایە: ئەم بۆچوونە، زۆر ڕاست نییە و هەڵەیەکی زۆر گەورەی مێژوویی تێدا هەیە. ئەم هەڵەیەش، لە سەر ڕۆڵەکانی کورد زۆر کەوتووە. چونکە، خوێنێکی زۆری ویستووە!

گومانی تێدا نییە، ئەم دید و بۆچوونە، جۆرێ لە ڕاستیی تێدا هەیە. چونکە، تا ئێستە، دوژمنان و داگیرکەرانی دوور و نزیک، چەن هەوڵیانداوە، نەتەوەی کورد لەنێوبەرن و لە بۆتەی نەتەوەکانی خۆیاندا بیتوێننەوە، بە هیچ شێوەیە، سەری نەگرتووە. چونکە، ڕۆڵەکانی کورد، داکۆکییان لە خۆیان و نیشتمانەکەیان کردووە. بۆیە، کورد وەک نەتەوەیەک نەتواوەتەوە و لە سەر خاکی نیشتمانەکەی خۆی ماوەتەوە. ئەمەشیان، لە لایەکەوە، دەمەتەقێی جیاواز هەڵدەگرێ، لە لایەکی دیکەشەوە، جگە لەوەی، ئێرە جێی ئەوە نییە، مەبەستی سەرەکیی بابەتەکەشم، ئەوە نییە!

بەڵام، بمانەوێ و نەمانەوێ، خۆشیمانبێ و ترشیمانبێ، کورد لە چاو هێندێ لە نەتەوەکانی نێوچەکە و جیهاندا، بەرانبەر دوژمنان و داگیرکەرانی نیشتمانەکەی خۆی، زۆر ئازا نەبووە و ئازاش نییە. چونکە، گەر وا نەبووایە، هەڵبەتە، هەر لە مێژوویەکی دێرینەوە، کاتێ لەشکری دوژمن، پەلاماری نیشتمانەکەی داوە، دەشتایی و ئاوەدانییەکانی خۆی چۆڵ نەدەکرد و بەجێی نەدەهێشت، پەنای بۆ بەر چیاوچۆڵ نەدەبرد. بەڵکوو، داکۆکیی لێ دەکرد و تا ئەورۆ، بە ژێردەستیی نەدەمایەوە و خاوەنی دەوڵەتێکی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆی دەبوو!

کەواتە: بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە، با ئێستە بزانین، سنووری سروشتیی جوگرافیای مێژوویی « کوردستان »، لە کۆندا لە کوێ بووە، ئەورۆش، لە کوێ دایە؟!! ئەو دەشتایی و نێوچانە، ئێستە بە دەس کێوەن؟!!

(لە ڕاستییدا، کێشەی دیارییکردنی سنوور، بە یەکێ لە کێشە هەرە پڕ لە گرفت و ئاڵۆزەکانی، نێوان نەتەوە و دەوڵەتە جیاجیاکانی جیهان دادەنرێ. چونکە، لەم سەر تۆپی زەوییەدا، دەوڵەتێکی دیارییکراو، هەر لەو ڕۆژەوە دامەزراوە، تا ئەورۆ، بەدی ناکرێ، لە هەمان چوارچێوە و سنووری ڕامیاریی خۆیدا، بە تەواویی مابێتەوە. نەخشەی ڕامیاریی نیشتمانی گەلانی جیاواز، بەپێی بەرژەوەندیی نێو دەوڵەتان و نەتەوەکان، لە ئەنجامی جەنگ، داگیرکردن و چاوچنۆکییاندا نەگۆڕابێ. بگرە ئەو سنوورانە، هەمیشە لە هەڵکشان و داکشاندا بوون، بە شێوەیەکی بەردەوام، بە ئارەزووی دەسەڵاتداران و خاوەن هێزەکان، قەیچییان لێ بەکارهێنراوە!

سنووری « کوردستان »یش، لەم یاسایە بەدەر نەبووە و بەدەریش نییە، بەگوێرەی ویست و ئارەزووی داگیرکەران، هەر ڕۆژەی بەشێک و پارچەیەکیان لێ دابڕیوە. یا، نێوچەیەکی نوێیان، بە سەر ئەم دەوڵەت و ئەو دەوڵەتدا بەخشیوەتەوە. بۆیە، بە شێوەیەکی بەردەوام، لە زیادکردن و کەمکردندا بووە، بە تایبەتیی، نەتەوەی کورد، هەرگیز، خاوەنی دەوڵەتێکی نێوەندیی یەکگرتوو نەبووە، هەرگیز، خاوەنی هێز و دەسەڵاتێکی کوردیی ئەتۆ نەبووە، تا بتوانێ، پارێزگاریی سنووری نیشتمانەکەی خۆی بکا و بیچەسپێنێ.)«15.3»

کەلێ لە مێژوونووس و ڕۆژهەڵاتناسەکانی کورد و بیانیی، باسی سنووری خۆرسکیی « کوردستان »یان کردووە. بۆ نموونە: لە نێو کورددا « شەرەف خانی بەدلیسیی، حوسێن حوزنی موکریانیی، محەمەد ئەمین زەکی بەگ، محەمەد عەلی عەونی، دوکتۆر جەمال نەبەز، دوکتۆر عەبدوڵڵا غەفوور ... » لە نێو بیانییەکانیشدا، هەرە بەناوبانگەکانیان: « ئەولیا چەلەبیی، حەمدوڵڵا

مستەوفی ئەلقەزوینیی، سێر مارک سایکس، لو سترەنج، ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام، مینۆرسکیی، سێر سیدنی سمیس، شاکیر خەسباک، پرۆفیسۆر لازەریف ... »، هەر یەکەیان، بەپێی دید و بۆچوونی تایبەتیی خۆیان، لەو سنوورە دواون.

بەڵام، لەو باوەڕە دام، جگە لەوەی، ڕاستترین سەرچاوەیەک، باسی سنووری « کوردستان »ی کردبێ، « شەرەفنامە » بووە، هەروەها، زۆربەی ئەوانی دیکەش، هەر پەنایان بۆ ئەو سەرچاوەیە بردووە. چونکە، مێژوونووسی گەورەمان « شەرەفخان 1543-1604ز. » ساڵی « 1596ز. »، واتە: پتر لە چوار سەدە لەمەوبەر، شاکارە نایابەکەی خۆی نووسیوە. کاتێ ئەو مێژووەشی نووسیوە و سنووری « کوردستان »ی دیارییکردووە، ئەو هەستە چەپەڵە شۆڤێنیی، ئیمپراتۆریی و شێوازەی ئەمڕۆ هەیە، لە نێو نەتەوەکانی ئەو سەردەمەی نێوچەکەدا، بەو شێوەیە نەبووە. هێشتا « کوردستان »، لە نێوان دەوڵەت و ئیمپراتۆریا داگیرکەرەکانی نێوچەکەدا لەتوپەت نەکراوە. جگە لەوەی، ئەوانیش خۆیان، ئەو مێژووەی « شەرەفخان »یان بینیوە و خوێندیانەتەوە، زانیویانە، ڕاستیی نووسیوە، بۆیە، دەنگیان لێوە نەهاتووە!

با بزانین، لە « شەرەفنامە »دا، سنووری سروشتیی « کوردستان »، چۆن دیارییکراوە؟!! « شەرەفخان » نووسیوێتی:(« کوردستان » لە سەر لێواری زەریای « هورمز »[1]ەوە ـ لە سەر کەناری زەریای « هیند » هەڵکەوتووە ـ دەستپێدەکا و لەوێوە بە هێڵێکی ڕاست دەکشێ و لێت، هەتا لە مەڵبەندی « مەلاتیە »[2] و « مەرعەش »[3] دەبڕێتەوە. وولاتی « فارس »[4] و « عێراقی عەجەم » و « ئازربایجان » و « ئەرمەنستانی چکۆلە »[5] و « ئەرمەنستانی گەورە »[6] دەکەونە لای باکووری ئەو هێڵەوە. « عێراقی عەرەب »[7] و « مووسڵ » و « دیاربەکر » دەبنە باشووری ئەو سنوورە.)«30-29،4»

1. تەنگەی « هورمز » لە کەنداوی فارسە.
2. مەلاتیە: شارێکە لە مەڵبەندی خەرپووت، لە باکووری کوردستان.
3. مەرعەش: شارێکە لە باکووری حەلەب و باشووری ئەنادۆڵ.
4. فارس: مەڵبەندێکی گەورەیە، کەوتۆتە باشووری ئێران و بنکەشی شیرازە.
5. ئەرمەنستانی چکۆلە: ناوی « کیلیکیا »یە، ئێستە « ئەدەنە »ی پێ دەڵێن.
6. ئەرمەنستانی گەورە: لە نێوان گۆلی وان و چیاکانی قەفقازدا هەڵکەوتووە، پێتەختەکەی « ئاران »ە. ئێستە « یەریوان »ی پێ دەگوترێ.
7. عێراقی عارەب: لە بەغدا و بەسرە پێکهاتووە. لە لای باکوورەوە، لە تکریتەوە دەستپێدەکا و بە چیاکانی حەمریندا دەڕوا و لە زەریای فارس و لە ڕێگەی شەت ئەلعەرەب و ناوچەی حەسا دەبڕێتەوە.

هەروەها، پرۆفیسۆر « لازەریف »، لە « کورد و کێشەی کورد »دا، کاتێ باسی سنووری « کوردستان »ی کردووە، نووسیویێتی: (لە سەرووی ڕۆژاوا و خوارووی ڕۆژاواوە، سنووری بە زەریای ڕەش و زەریای نێوەڕاستەوە هەیە. بەڵام، لە سەرووی ڕۆژهەڵات و خوارووی ڕۆژهەڵاتەوە، بە زەریای قەزوێن و کەنداوی فارسەوەیە.)«37،7»

(بەو شێوەیە، بۆمان ڕووندەبێتەوە: « کوردستان » لە دوولاوە، بواری کەناری زەریایی هەیە. یەکەم: تەنگەی « هورمز »، کە لە ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی داگیرکەری « ئێران » دایە. دووەمیش: شاری « ئەسکەندەروونە »، کە لە بن چنگی دەوڵەتی داگیرکەری « توورکیا » دایە.)«17،3»

گەر سەرنجێکی ورد، لەو سنووورە بدەین، کە میر « شەرەفخان » کێشاویەتی، زۆر بە ڕوونی دەبینین: جگە لەوەی، ئێستە، نەک هەر دەوڵەتە داگیرکەرەکان، دانی پێدا نانێن، بەڵکوو، زۆربەی زۆری کورد خۆشی، باوەڕی پێ ناکەن. ئەمەش وەنەبێ، لە زیرەکیی خۆیانەوە بێ، یا، بەڵگەیەکی مێژوویی و جوگرافیایی تەواویان بەدەسەوەبێ، بەڵکوو، وەک چۆن وازیان لە زۆر نێوچەی « کوردستان » هێناوە، هەر بەو شێوەیەش، وازیان لەو سنووورە هێناوە!*

ئینجا، زۆر بە ئاشکرا دەبینین: هێندێ شار و شارۆچکە، یا نێوچەیەکی تەواو، لە سەر نەخشەی « کوردستان » نەماون و بۆ سەر نەخشەی، دەوڵەتە داگیرکەرەکان گوێزراونەتەوە. هەر بۆ نموونە: چەندین شار و شارۆچکەی گەورە و گچکە، لە بەشە جیاجیاکانی « کوردستان »، جێی سروشتیی و مێژووییان گۆڕاوە. بۆ نموونە: لە باکوور: « ئەسکەندەروونە »، لە ڕۆژهەڵات: « هەمەدان، کرماشان، ورمێ »، لە باشوور: « مووسڵ، باقووبە، خانەقین، کەرکووک، زەمار، شەنگار، عەین زاڵە، مەخموور ». هەروەها، هەموو شار و شارۆچکەکانی خۆراوای « کوردستان »یش، لە لایەن « توورکیا، ئێران، عێراق و سووریا »وە داگیرکراون. کەم و زۆر، « توورک، فارس، ئازەر، عەرەب، توورکمان »یان تێدا چێنراوە. تەنانەت، هێندێ سەرکردەی کوردیش هەن، لە پێناوی بەرژەوەندیی تەسکی پارتایەتیی خۆیاندا، هەم نووسیویانە، هەم گوتوویانە و ئێستەش هەر دەڵێن: لە « سووریا »دا « کوردستان » نییە، بەڵکوو، کورد هەیە. « کوردستانی سووریا » ڕاست نییە و شتێکی دروستکراوە، کاتێ خۆی، ڕۆڵەکانی کورد، لە دەس زۆرداریی و چەوساندنەوەی توورکەکان ڕایانکردووە و لەوێ نیشتەجێبوون! یەکێ لەو [illegible] [illegible] کردووە «17[illegible]».

ئیدی، گەر کورد ئازابووایە، چۆن دەیهێشت، نیشتمانەکەی بەو شێوەیە، لەتوکووتکرێ، هەر کوتێکیشی، بە سەر دەوڵەتێکی داگیرکەردا دابەشکرێ؟!!
چۆن تا ئێستە، نیشتمانەکەی بێ پەرژین دەبوو؟!! بۆچی تا ئێستە، نزیکەی چل میلیۆن کورد، خاوەنی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان نین، لە کاتێکدا، لە بەرەبەیاتی مێژووەوە، لە نیشتمانە کاولبووەکەی خۆیاندا دەژین، کەچی، هەر دوو نەتەوەی عەرەب و توورک، لە بنەڕەتدا، هەر خەڵکی نێوچەکەش نەبوون، نیشتمانی مێژوویی خۆشیان نەبووە، ئەوا ئێستە، خاوەنی دەوڵەتی تایبەتیی خۆیانن؟!!
بەڵێ ڕاستە، جگە لەوەی کورد، خۆی بە سەر خۆیدا هەڵیداوە، زۆر لە ڕۆهەلاتناسەکانیش، باسی ئازایەتیی کوردیان کردووە. بۆ نموونە: دەربارەی ئازایەتیی کورد گوتوویانە:(ئەگەر تووڕەبن، لە شێر توندترن. ئەگەر ڕاپەڕن، لە برووسکە سووکترن.)«379،5»
نووسەری « ئەرمەنیی » بەناوبانگ، « ئابوڤیان »یش گوتوویەتی:(مرۆ دەتوانێ، بە واتای ووشە، کوردەکان بە شۆڕەسوارانی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست ناوبەرێت. پەیمان نەشکێن و میواندۆستێکی بێ وێنەن.)«378،2»
هەروەها، « هەژاری موکریانیی »ش، دەربارەی « شەرەفنامە » نووسیوێتی: (گەر تۆزێ بە زیتیی، لە ناواخن و دێڕ و پیتە بەپیتەکانی « شەرەفنامە » وردبینەوە و ژیرانە لێی بکۆڵینەوە: سەرەڕای ڕووداوەکانی، کە زۆر دڵگر و لە بەر چاون، ئەوی زۆرتر سەرنجی پیاو ڕادەکێشێ، ئازایەتیی بێ وینەی ئەم گەلی کوردەیە، سەرلەبەری « شەرەفنامە » بپشکنە، لە هیچ لایەکەوە، کوردێکی قزە و ترسنۆکت نایەتە بەر چاو و هەمووی هەر پیاوی چاونەترس و دوژمنترسێن و گەرناسی بێ وێنەیە.)«22،4» پاشان، لە جێیەکی دیکەشدا نووسیوێتی:(ئەگەر پیاو بۆ خۆی کورد نەبێ، یان دەماری کورد باش نەناسێ، لە باسی ئازایەتیی ئەم گەلەدا، سەری دەمەاسێ و لای وایە، بەشێکن لە چیرۆک و ئەفسانە و شتی وا ڕووی نەداوە.)«24،4»
لە ڕاستییدا، هەموو کەس دەتوانێ، بە سەر خۆی و نەتەوەکەیدا هەڵدا. بەلام، کەم کەس هەیە، بە چاوی ڕەخنەوە، سەرنج لە کردەوەکانی خۆی و خەسڵەتە خراپەکانی نەتەوەکەی بدا. بە تایبەتیی، ئەوانەی وا دەزانن، گەر بە ڕاست و درۆ، بە باشە باسی کوردیان کرد، ئیدی، ئەوە بە نیشانەی نیشتمانپەروەریی و دڵسۆزیی دادەنرێ! لەبەرئەوە، پێم وایە، لە کۆندا، کورد نەتەوەیەکی هێندە خراپبووە، لە نێو یەکدی و لەگەڵ یەکدیدا، هێندە ناکۆک و ناتەبابووە، وەک کەوی خۆخۆر وابووە و ئێستەش، تا ئەندازەیەکی زۆر، هەر وایە!

جا گەر، سەرنج لە قسەکانی « هەژاری موکریانیی » بدەین و لەگەڵ فیلمی مێژووی خوێناویی « شەرەفنامە »دا بەراوردیانکەین، ئەوا دەبینین: ئەو ئازایەتییەی ئەو باسیکردووە، بەو شێوەیە نەبووە و نییە. چونکە، هیچ سەیر نییە، گەر بڵێم: لە نێو کۆمەڵی کوردەوارییدا، لە سەر دەسەڵات و پارە، برا، چاوی برای خۆی هەڵکۆڵیوە. برازا، سەری مامی خۆی پەڕاندووە. مام، برازای خۆی هەڵواسیوە. خاڵ، داوی بۆ خوارزای خۆی ناوەتەوە. خوارزا، ناپاکیی لە خاڵی خۆی کردووە. باوک، کوڕی خۆی لەنێوبردووە و کوڕیش، باوکی لە گرتووخانە توندکردووە، یا، شاربەدەریکردووە! ئاخر، مێژووی کورد نەبێ، مێژووی چ نەتەوەیەکی دیکەی ئەم سەر ڕووی زەوییە، هێندە تاڵ و قێزووناکە؟!! ئایا، ئەمە بە ئازایەتیی دادەنرێ؟!!

بەلام، پێم وایە، تا ئێستە، پێناسەیەکی ڕاستەقینەی ئازایەتیی، بۆ کورد نەکراوە. بەڵکوو، خوا هەڵ ناگرێ، کورد لە چەن بوارێکی تایبەتییدا، دەسرەنگینیی، دڵسۆزیی، قارەمانیی و ئازایەتیی خۆی نواندووە:

1. جەنگی نێوخۆی کورد ـ کورد: گەر لاپەڕە پڕ لە شەرەشوورەییەکانی مێژووی کورد، لە « شەرەفنامە »دا بخوێنینەوە، ئینجا، بە تەواویی بۆمان دەردەکەوێ، کورد لەو بوارەدا، چەن ئازا و دەسرەنگینبووە! چۆن لە پێناوی پارە و دەسەڵاتدا، نیشتمانەکەی خۆی وێرانکردووە، ماڵی یەکدیان تالان و کاولکردووە. لە وەلامی « هەژار »یشدا دەڵێم: گەر سەرلەبەری « شەرەفنامە » بپشکنین، هێندەی باسی ناکۆکیی، دووبەرەکیی، خۆخۆریی و ناپاکیی سەرنجمان ڕادەکێشێ، هێندە ئازایەتیی کورد، سەرنجمان ڕا ناکێشێ! لە ئازایەتیی شەرمەزارییش پتر، هیچی دیکەی تێدا نابینین! چونکە، کورد بۆ گیانی خۆی ئازابووە و ڕاوە کوردی کردووە، لە ئاستی دوژمن و داگیرکەرانیشدا، دەسەمۆکراوە و هیچی وای پێ نەکراوە! بە جۆرێ بووە، تەنانەت « شەرەفخان » خۆی نووسیوێتی: (چونکە، کورد نەهاتۆتە ژێر فرمانی تاکە فرماندارێکەوە، بۆیە لە یەکتر نامۆن و خوێنی یەکتری دەڕێژن و گوێ نادەنە هێمنایەتیی و ڕێکوپێکیی و لە سەر زۆر و کەم زوو هەڵدەچن.) «132،4»

یەکێکی وەک: « خواجە سەعدەدین »ی مامۆستای « سوڵتان مرادخان »ی « عوسمانیی »ش گوتوویەتی: (هەموو کوردێک، بۆ خۆی سەربەخۆیەکە و ئاڵای ملهوریی و زۆداریی بەرزکردۆتەوە و لە ناو ئەو شاخ و کێوانەدا، بە سەربەستیی دەژی، ئەگەر سەرنج بدەیە، باری یەکدی گیریی و هاوبیریی و هاوکارییانەوە، تەنیا لە شادە و ئیمانهێناندا نەبێ، لە هیچ شتێکی تردا یەکتر ناگرنەوە.) «36،4»

یا، وەک « ئەمین زەکیی بەگ » نووسیویّتی: (لە سەرەتای میّژووەوە تا ئیمرۆ، ئەگەر بە وردیی بیرکەینەوە، کە بەشۆکیی و مالویّرانیی ئەم نەتەوەیە، هەموو ئەنجامی خراپیی و دووبەرەکییان بووە و تا ئەم بارەیان بەردەوامبیّ، هەمیشە، لە ژیّردەست و پیّدا ئەچن!)«138،6» 1*

گومانی تیّدا نییە، ئەو کەمە ئازایەتییەی، رۆڵەکانی کوردیش، دژی لەشکری داگیرکەران نواندوویانە، لە ناچارییدا بووە. چونکە، کاتیّ دوژمنی داگیرکەری بیانیی، پەلاماری نیشتمانەکەیانی داوە، ئیدی ناچاربوون، داکۆکیی لە خۆیان بکەن. یا، نیوچە دەشتایی و شارەکان بەجیّبیّلن، ڕوو لە کیّو و چیا سەخت و بەرزەکان بکەن، تا خۆیان و منداڵەکانیان، لە کوشتنوبڕین بپاریّزن. ئەگینا، وەک نووسەرانی کورد، شانازیی پیّوە دەکەن، ڕۆژیّ لە ڕۆژان و لە سەرانسەری میّژوودا، کورد پەلاماری خاکی نیشتمانی هیچ گەل و نەتەوەیەکی دیکەی نەداوە، تا وڵاتەکەی لە هیّرش و پەلاماردان، جەنگ و خویّنڕشتن، تالان و برۆ، کاول و ویّرانکردن بپاریّزیّ. بەڵکوو، هەر دوژمن و داگیرکەران، هیّرشیانهیّناوە و پەلاماریانداوە. بۆیە، کورد تا ئەوڕۆش، هەر بە بندەسیی ماوەتەوە، خاوەنی قەوارەیەکی ڕامیاریی تایبەتیی خۆی نییە. بگرە، گەلیّ شتی پڕ بایەخیشی، لە دەس خۆی داوە. چونکە، لەو سەردەمە میّژوویی و چارەنووسسازانەی، میّژووی کۆمەڵگەی مرۆ و نەتەوەکاندا، چ پیّش زایین و چ دوای زایین، باو، باوی جەنگ و داگیرکردن بووە. واتە: هەر نەتەوەیە، زۆر بەهیّز و ئازابوویێ، لەشکریّکی گەورە، بەهیّز، ئازا و پڕ چەکی، لە ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆی و گەلانی بندەسی پیّکهیّناوە، پەلاماری خاکی گەل و نەتەوەکانی دوور و نزیکی داوە، تا توانیویانە، جەنگاون و لیّیان کوشتوون. پاشان بەزاندوویانن، خاکەکەیان داگیرکردوون و بە نەخشەی جوگرافیای نیشتمانەکانی خۆیانەوە دادروون! لەبەرئەوە، چۆن لە کۆندا، بە سەربەخۆیی و سەربەستیی ژیاون، ئەوڕۆش، هەر بەو شیّوەیە ماونەتەوە و خاوەنی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆشیانن!

جا، گەر هەر کوردیّ، ئەم دید و بۆچوونە، بە ڕاست نازانیّ، ئایا، ئەو هەموو دەوڵەت و ئیمپراتۆریا گەورانەی « یۆنانیی، ڕۆمانیی، هەخامەنشیی، ساسانیی، ئەمەویی، عەباسیی، عوسمانیی، سەفەویی، فرەنسیی، ئەڵمانیی، ڕووسیای تساریی، بریتانیای گەورە، نەمسا و مەجەڕ ... » چۆن دامەزراون؟!! ئەوڕۆش، ئەو گەل و نەتەوانە، بۆ هەر بە سەربەخۆیی دەژین و لە سەر داروپەردووی میراتی نەتەوەیی کۆنیان نەبیّ، بۆچی دەوڵەتی تایبەتیی خۆیان هەیە؟!!

جارێکی دیکەش، دووپارەیدەکەمەوە و دەڵێم: هێندێ نووسەر و ڕامیاری کورد هەن، لە نووسینەکانیاندا، زۆر شانازیی بەوەوە دەکەن، گوایە: کورد لە مێژووی نەتەوەیی خۆیدا، پەلاماری خاکی هیچ نەتەوەیەکی دوور و نزیکی نەداوە! بە ڕاستیی، ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە هەڵەیە. چونکە، گەر کورد لە ژیانی نەتەوەیی خۆیدا، هەڵەیەکی گەلێ گەورەی کردبێ، ئەوەیە، وەک هەموو نەتەوەکانی ئەو سەردەمانە، ئەو کارە مێژوویی و چارەنووسسازانەیەی ئەنجام نەداوە! پێم وایە، ئەو نووسەرانەش، هێشتا بە تەواویی، لە مێژووی کۆنی کۆمەڵگەی مرۆ نەگەیشتوون و جێی بەزەیی پێدا هاوتنەوەن! چونکە، لەو سەردەمانەدا، یاسای دارستان لە گۆڕێدا بووە، هەر نەتەوە بە هێزە بە توانا و دەسەڵاتدارەکان توانیویانە، بە ئازادیی و خۆشیی بژین. هێزە پچووک و لاوازەکانیش، بە کۆیلەیی و ژێردەسیی ماونەتەوە، زۆر هەوڵیان نەداوە، بە سەر چەڵەمەی نەتەوەیی و ڕەوشی ڕامیارییدا سەرکەون، هەر زوو کۆڵیانداوە، سەری خۆیان شۆڕکردووە، لەگەڵ باری داگیرکردن، ژێردەسیی و چەوساندنەوەدا گونجاندوویانە. هەر وەک چۆن ئێستە، سەرانی پارتەکان و زۆربەی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد لە « کوردستان »ی مەزندا، نەک هەر بە ژێردەسیی و کۆیلەیی، هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکە قایلن، بەڵکوو، خاکی « توورکیا، ئێران، عێراق و سووریا »ش، بە نیشتمانی خۆیان دەزانن !

سەیر ئەوەیە، هێندێ نووسەری کورد، زۆر شانازیی بەوەوە دەکەن و دەڵێن: کورد لە مێژووی نەتەوەیی خۆیدا، پەلاماری نیشتمانی هیچ نەتەوەیەکی دیکەی نەداوە، وەک ئەوەی، کارێکی زۆر باشی کردبێ!

کەچیی، عەرەبەکان لە « عەرەبستانی سعوودیە » هاتوون، بە ناوی ئایینی ئیسلامەوە، نیوەی وولاتانی جیهانیان داگیرکردووە. هەروەها توورکەکانیش، لە نێوەڕاستی « ئاسیا »وە هاتوون، نێوچەکەیان داگیرکردووە و بە ناوی ئایینی ئیسلامیشەوە، تا بەر دیوارە بەردینەکەی « چین » لە « ئاسیا » و شاری « ڤیەن ـ نەمسا » لە « خۆراوای ئەورووپا » چوون، کاول و تالانیان کردوون. ئەوڕۆش، ڕۆڵەکانی هەر دوو نەتەوەی عەرەب و توورک، شانازیی بەو داگیرکردنانەوە دەکەن، بە بەشێ لە مێژوویی سەروەریی و سەرکەوتنی خۆیانی دادەنێن. کوردیش شانازیی بەوەوە دەکا، پەلاماری کەسی نەداوە و ئێستە، بە ژێردەسیی دەژی!!! بۆیە دەڵێم: گەر کورد، نەتەوەیەکی ئازابووایە، هەڵبەتە، وەک هەر دوو نەتەوەی عەرەب و توورک دەیتوانی، نەک هەر خاکی وولاتانی دیکە داگیرکا، بەڵکوو، داکۆکیی لە نیشتمانەکەی خۆی بکردایە، ئەو هەموو نێوچە مێژوویی و جوگرافیاییانەشی، لە دەس نەدایە!

2. کاتێکیش، دوو لایەنی کوردیی « خێڵ، میرنشین، دەوڵەت و پارت »، لە نێوخۆیاندا ڕێک نەکەوتوون، دژی یەکدی وەستاون، پەلاماری یەکدیان داوە و جەنگاون، لە ئەنجامدا، لایەکیان بەهێزتربووە و سەرکەوتووە. لایەکەی دیکەشیان، لاوازبووە، توانای داکۆکیی و بەرەنگاربوونەوەی نەماوە، زیانێکی زۆری لێ کەوتووە، ئیدی، بەزیوە و هەڵاتووە. ئینجا، هانای بۆ بەر، یەکێ لە سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان » بردووە. نۆکەریی و چڵکاوخۆریی خۆی، بۆ نوێ کردۆتەوە و سەرشۆڕیی دوژمنی قەبووڵکردووە. بەڵام، بێزی نەهاتووە، دەستی برایەتیی و تەبایی، لە نێو دەستی برا هاوخوێن و هاوزمانەکانی خۆی بنێ! سەرانی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەش، بە هیچ شێوەیە درێغییان نەکردووە، بۆ ئەوەی، ڕیزەکانی گەلی کورد، لەتوپەتترکەن، ناکۆکیی و دووبەرەکیی، نێوان لایەنە نەیارەکان، قووڵترکەنەوە، ئاژاوەیەکی بەتەوەیی گەورەتر بنێنەوە، ئەو جەنگە چەپەڵەی نێوخۆ گەرمترکەن، تا، ئەو بەردە قوورسەی لە سەر سنگیان دانراوە، لە کۆڵیانبێتەوە و کورد لەنێوبەرن، لەشکرێکی زۆر و پڕ چەکیان بۆ کۆکردۆتەوە، تا، هەم هاوپەیمانەکەیان، تۆڵەی خۆی لە برا کوردەکانی بکاتەوە! هەم نیازە گڵاوەکانی، سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکەش بەدیبێ!

لە مێژووی کۆنماندا، ئەم جۆرە هانابردن و خۆفرۆشتنە، ئەم پەتای دووبەرەکیی و خۆخۆرییە، هەر لە « ماد »ەکانەوە دەستپێکردووە و بە میراتیش بۆ ئێمە ماوەتەوە! لە مێژووی نوێشماندا، مێر و پاشایەکی کورد نەماوە، پەنای بۆ بەر، هەر دوو ئیمپراتۆریا گەورە دوژمنە داگیرکەرەکەی « عوسمانیی » و « سەفەویی » نەبردبێ! گەر کەمێ نزیکیش کەوینەوە، ئەوا دەبینین: هەر لە سەرەتای ساڵەکانی شەستی سەدەی ڕابردووشەوە، پارتی ڕامیاریی و هێزی چەکداری « کوردستان » نییە، داوای کۆمەکی، لە یەکێ لە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان » نەکردبێ، تا یارمەتییبدا، لەشکری بۆ سازکا، چەک و تەقەمەنیی بداتێ، بۆ ئەوەی، دەنگی برا کوردەکانی خۆی کپکا. ئەوە مێژووی پڕ لە شەڕوشۆڕی میرەکانی « بابان، سۆران، ئەردەڵان، بادینان ... »، زۆر بە ڕوونیی، لە دووتوێی پەرتووکە مێژووییەکاندا تۆمار کراون! ئەوە مێژووی پڕ لە خوێناویی هەر دوو باڵی « جەلالیی » و « مەلایی »، هێشتا هەر گەرمە و هالاوی لێ هەڵدەستێ! ئەوەش، هەم جەنگی چەپەڵی نێوخۆی، نێوان هێزەکانی « پارتیی ـ یەکێتیی، پارتیی ـ دیمۆکرات، پارتیی ـ P.K.K. »، هەم جەنگی پۆخڵی نێوان « یەکێتیی » و هەموو لایەنەکانی دیکە، گەواهیی بۆ ئەم دید و بۆچوونانەم دەدەن!

ئاشکرایە، لە هەموو جەنگەکانیشدا، چ ڕاستەوخۆ و چ ناڕاستەوخۆ، دوژمنانی کورد و داگیرکەرانی « کوردستان »، دەستێکی باڵایان هەبووە، جەنگەکەیان هەڵگیرساندووە، گەرمیانکردووە، دژی لایەنێ، پارمەتیی لایەنێکی دیکەیان داوە، بە ڕۆژی نیوەڕۆ، سەربازەکانیان لە « کوردستان » تەراتێنیانکردووە، ڕاوە کوردیان کردووە و کوڕی کوردیان کوشتووە! لایەنە پەنابەرەکەش، بە دێوجامەی نیشتمانپەروەریی و دڵسۆزیی، لە لایەکەوە، ڕۆڵەکانی کوردی هەڵخەڵەتاندووە. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو کارە ناپاکانەیەی، هەم بە سەرکەوتن و سەربەرزیی زانیوە. هەم شانازییشی، بەو هاوکاریی و ناپاکییەوە کردووە!

خۆ، هەنگاوە ناپاکانەکەی سەرانی « پارتیی »، لە « 1996. 08. 31 »دا، مێژوویەکی هێندە دوور نییە، تا، ڕۆڵەکانی گەلەکەمان لە « باشوور »، بیریان چووبێتەوە! ئەو ڕۆژەڕەشەی، تا ئێستەش، سەرانی « پارتیی »، شانازیی پێوە دەکەن، یادیدەکەنەوە، زۆر بە پیرۆزی ناودەبەن! ئەوە لەبری ئەوەی، دان بەو ناپاکیی و تاوانەدا بنێن، داوای لێبووردن، لە ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد بکەن!

یا سەرکردایەتی « P.K.K. »، لە ساڵانی « 1993 - 2000 »دا، هاوکارییان لەگەڵ یەکێ، لە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « ئێران، عێراق و سووریا »دا دەکرد، ستراتیژێکی خراپی جەنگیان، دژی هەرێمی « باشوور » پێڕەودەکرد، تا، هێزەکانیان توانایان نەما و داگیرکەرانیش، لە نێوچەکەدا دەسەڵاتیان کۆتاییهات. ئەم کارەش، هێندە لە مێژ نییە، تا لە بیرچووبێتەوە، یا، کارێکی هێندە نهێنیی نییە، کەس ئاگای لێ نەبێ و من بمەوێ، بۆ ڕۆڵەکانی کوردی ئاشکراکەم!

یا، ئەو هاوکاریی و چاوساغییەی، سەرانی « یەکێتیی »، ساڵی « 1996 »، لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی داگیرکەری « ئێران »دا، دژی هێزەکانی « دێمۆکرات » کردیان، لە نزیک شارۆچکەی « کۆیە »، بنکەکانیان تۆپباران کردن، هەروا کارێکی مێژوویی ئاسایی و ئاسان نییە، بە سەریدا بازدەین و پشتگوێیخەین!

3. کاتێ، یەکێ لە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان »، لەگەڵ لایەنێکی دیکەدا تێکچووە، ناکۆکیی لە نێوانیاندا پەیدابووە، پاشان، کار بەوە گەیشتووە، پەلاماری یەکدی بدەن، هیچ کاتێ، هیچ سەرکردە، پارت و کەلێکیان، لە کوردە نۆکەرە دڵسۆزە بە پەرۆش و ئازاکەیان، باشتر دەس نەکەوتووە، تا، وەک تووله و تانجی ڕستیانکەن و ڕاوە کەروێشکی ئامانجەکانی خۆیانیانی پێ بکەن. لەبەرئەوە، لە هەموو جەنگەکاندا، هەر

هێزەکانی کورد، چەکی بۆ هەڵگرتوون. ئەوانیش، پێش خۆیان داون، خاکی وڵاتانی دیکەیان پێ داگیر و وێرانکردوون. لە لایەکەوە توانیویانە، بە کوشتیانبدەن و لە کۆڵ خۆیانیان بکەنەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، بە سەر دوژمنە سەرسەخت و دڕەکانیاندا سەرکەوتوون.
ئەوەتە، « ئەمین زەکی بەگ »، لەو بارەیەوە نووسیویێتی: (لە سەردەمێکی کۆنەوە تا ئیمڕۆ، نەتەوەی کورد، لە ڕاژە و یارمەتیی فرمانڕەوایانی باش و بە وێژدانی خۆی دریغیی نەکردووە. هەر میللەتێکی فرمانڕەوا، کە بایەخی بە مافەکانی دابێ و بە دادپەروەرانە و مرۆڤایەتیی، لەگەڵی هاتبێتە پێشەوە، هەمیشە خێری لێ دیوە و لە توانا و ئازایەتیی جەنگی، کەڵکێکی زۆری وەرگرتووە و شەر نەتەوەیەکی فرمانڕەوا کە ویستبێتی، جەور و ستەمی بەرانبەر بکا و لە ماف و ئابڕووی لابدا، بە پێچەوانەوە، زیانێکی زۆری لێ دیوە.)«237،6» *1
بەم چەن ڕستەیەدا، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ:
1. کورد هەمیشە، پیاوی فرمانڕەوا دەسڕۆشتووەکانی نەتەوە سەردەستەکانی « کوردستان » بووە. ئەوانیش، بۆ کاری سەربازیی و جەنگ، پێش خۆیان داوە و کەڵکیان لێ وەرگرتووە.
2. ئەو هەموو هێز و توانایەی هەبووە، هێندە ئازابووە، کەچیی، ڕۆژێ لە ڕۆژان، بیری لەوە نەکردۆتەوە، گەر هەر خۆشی بەکوشتدەدا، با، لە پێناوی وڵاتەکەی خۆیدا بمرێ و دەوڵەتێکی کوردیی دامەزرێنێ. نەک، هەمیشە کوڕی خۆی، بە قووربانی کچی خەڵکی دیکە بکا!
نموونەی هەرە زەق و لەبەرچاوی ئەو بیانییپەرستیی و خۆ بەهیچ نەزانینەش، لە ڕیزی چەن کەڵەپیاوێکی ناوداری کوردی وەک: « ئەبو موسلیمی خۆراسانیی، سەلاحەددینی ئەیوبیی، کەریم خانی زەند، مەلا ئیدریسی بەدلیسیی، دەروێش مەحمودی کەڵەجیریی، ئەبو بەکری کوڕی سەدەقە، میر حوسێنی کوڕی سەیفەدین، مەلا محەمەدی خەتێ، مەلا یەحیای مزووریی... » زۆر بە ڕوونیی دەردەکەوێ. چونکە، هەر یەکێ لەو پیاوە گەورانە دەیانتوانی، ڕاژەیەکی گەورەی کورد بکەن، میرنشین یا دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ، لە سەر خاکی « کوردستان » دامەزرێنن. بەڵام، چونکە هەستی نەتەوەییان لاوازبووە، خۆیان لە ئاستی بیانییدا، بە پچووک و کەمتر زانیوە، ئەوەی هەشبووە، نەیانهێشتووە و تێکیانداوە!
لە مێژووی کۆنماندا، هەموو ئەو جەنگە خوێناوییانەی، بە ناوی ئایینەوە، لە نێوان عەرەب و فارسەکەندا ڕوویانداوە، هەموو ئەو جەنگە چەپەڵانەی، لە سەر

نێوچەی دەسەڵات، کەڵەڕەقیی سوڵتانەکانی توورک و شاکانی فارس، لە نێوان هەر دوو ئیمپراتۆریای « عوسمانیی » و « سەفەویی »دا بەرپابوون، هەموو ئەو جەنگە گەورە و گرانانەی، لە نێوان هێزەکانی « سەلاح ئەلدینی ئەیوبیی » و خاچهەڵگرەکاندا هەڵگیرساون، پاشان، هەموو ئەو جەنگانەی، لە نێوان ئیمپراتۆریای « عوسمانیی » و دەوڵەتەکانی جیهاندا کراون، گەر زۆربەیان، لە سەر خاکی « کوردستان » نەبووبن و وڵاتەکەیان وێران نەکرد بێ، ئەوا، ڕۆڵەکانی کوردیان خڕکردۆتەوە، چەکداریانکردوون، بەرەو بەرەکانی جەنگ ڕەوانەیانکردوون. لە جەنگەکانیشدا، تا توانیویانە، پێش خۆیان داون، بە کوشتیانداون، ئەوان سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە و کوردیش، تەنیا هەر، دڕکوداڵی ماڵوێرانیی و ژێردەستیی درووەتەوە!
لە مێژووی نوێشماندا، داگیرکەران هێندێ جار، بە ناوی ئایینی ئیسلام و هێندێ جاری دیکەش، بە ناوی برایەتیی، یەکێتیی وڵات و کۆماری هاوبەشەوە، تا توانیویانە، کوردیان فریوداوە و لە خشتەیانبردووە. تەنیا هەر هێندە بەسە، بڵێم: « سوارەی حەمدیی »یە لە « باکووری کوردستان »، بە یەکێ لەو نموونە پڕ لە شەرم و ناشیرینانەی، مێژووی هاوبەشی نێوان توورک و کورد، دژی گەلی « ئەرمەن » دادەنرێ! تەنانەت، ئەو نۆکەرییەی سەرانی کورد، بۆ سوڵتانەکانی توورکە « عوسمانیی »یەکانیان کردووە، بە شێوەیە بووە، یەکێ لە سوڵتانەکان، کاتێ لە جەنگی نێوان خۆیان و « ڕووسیا » گەڕاوەتەوە، بە دایکی گوتووە: « ترست نەبێ، لە نێوان ڕووسیا و ئیمپراتۆریای عوسمانییدا، دیوارێکی قایم، لە کەللەسەر درووستکردووە. » ئەو دیوارەش، مەبەستی لە کورد بووە! 2*
لە دوای یەکەمین جەنگی جیهانیشەوە، ڕۆڵەکانی گەلی کورد لە « باکووری کوردستان »، دەستێکی باڵایان، لە جەنگی نێوان توورک و گەلی « گریک »دا هەبووە و تێکیانشکاندوون. دەسەڵاتی جێنشینیان لەقاندووە و ڕووخاندوویانە. پاشان، « کەمال ئەتا توورک »یان بە باوک و برا گەورەی خۆیان داناوە! لەو جەنگانەشدا، هێندە کوردیان بەکوشتداوە، تەنانەت لەو بوارەدا، توورکەکان خۆشیان، نکوولیی لە ڕۆڵی گرنگی کورد ناکەن. بۆیە، شالیاری جەنگی « توورکیا »، کاتێ لە سەر گۆڕی سەربازی گومناو قسەیکردووە، گوتوویەتی: (زۆر پێدەچێ، ئەم سەربازە، کوردبێ!)«240،1»
لە « خۆرهەلاتی کوردستان »، ڕۆڵە هەڵخەڵەتاوەکانی گەلی کورد، دەستێکی باڵایان، لە هەموو جەنگەکاندا هەبووە. تەنانەت، لەم شۆڕشەی دوایی ساڵی « 1979 »شدا، گەلێ قوربانیی مەزنیان داوە، لە پێناوی ڕووخاندنی ڕژێمی

داگیرکەری کۆنەپەرستی « پەهلەویی » و دامەزراندنی ڕژێمی کۆماری ئیسلامیی « ئێران »دا، دریغییان نەکردووە. کەچیی، کورد بۆ خۆی، نە ئازابووە و نە هیچیشی بە هیچ کردووە!
لە « باشووری کوردستان »یشدا، « شێخ مەحموودی حەفید »، لەشکرێکی زۆر و گەورەی کۆکردۆتەوە، بە هانای برا عەرەبە موسوڵمانەکانی خوارووی « عێراق »یەوە چووە و تا « شوعێبە » نەوەستاوە، داکۆکیی لێ کردوون و دژی « بریتانیا »، پتر لە هەزار ڕۆڵەی کوردی بەکوشتداوە. ئەوانیش، لە پاداشتی ئەوەدا، بە مردووییش وازیان لێ نەهێناوە و تەرمەکەیان گوللەباران کردووە! کەچیی، ئەوڕۆ عێراقچیییەکانی کورد و عەرەب، شانازیی بەو خوێنە بە نارەوا ڕژاوەوە دەکەن، بە بەردی بنچینەی برایەتی کوردی ژێردەس و عەرەبی سەردەستی دادەنێن! ئەو برایانەی، لەبری چاکە و ئەمەکداریی، بە کیمیابارانی گوند و شارۆچکەکانی « کوردستان »، ئەنفالکردنی سەر و ماڵی کورد وەڵامیاندانەوە و تۆڵەیان بۆ کردینەوە! 3*
ئەوڕۆش، سەرانی پارتەکان، لە هەموو ڕۆژێ پتر، « عێراقچێتیی » خۆیان دەکەن، لەبری ئەوەی، هەلەکە بقۆزنەوە، هەوڵ بۆ دامەزراندی دەوڵەتێکی سەربەخۆی « کوردستانیی » بدەن، سەربەخۆیی بۆ کورد و سەروەریی، بۆ « باشووری کوردستان » دابینکەن، بە هەموو شێوەیە هەوڵدەدەن، سەربەخۆیی و سەروەریی، بۆ دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » بگێڕنەوە، ئەو دەوڵەتەی، تا ئێستەش بە تەواویی، دانی بە هەموو مافە ڕەواکانی گەلی کوردی « باشوور »دا نەناوە!
لە « خۆراوای کوردستان »یش، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، لەگەڵ ڕۆڵەی عەرەبەکانی « سووریا »، لە پێناوی سەربەخۆیی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرەدا و دژی هێزەکانی سوپای « فەرەنسە »، کەمی خەبات نەکردووە و کەمیشی خوێن نەڕشتووە!
بە ڕاستیی، گەر لەم بارە خراپەی ڕیالیزمی نەتەوەی کورد نەگەین، هێندەی دیکە، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان سەرکوێر و سەرگەردان دەبن. ئەو ڕووبارە سوورە خوڕەش، هێندەی دیکە و پتریش، خوێنی گەشی کوردی لەبەردەڕوا، بە خۆڕایی، خاکی ئازادکراو بۆ داگیرکەران، خاکی وێرانکراویش بۆ کورد پاراو و تێرخوێن دەکا!

* * *

**پـــــەراوێزەكان:**

* لێرەدا، هەر بۆ نموونە دەڵێم: شتێكی سەیر نییە، گەر دوكتۆر « بەرهەم ساڵح »، ئەندامی سەركردایەتی « یەكێتی نیشتمانیی كوردستان » و جێگری سەرۆك شالیارانی كاتیی دەوڵەتی « عــێــراق »، ڕۆژی « 2002. 06. 15 »، لە شاری « ستۆكهۆڵم »، دەربارەی ڕەوشی ڕامیاریی « باشووری كوردستان » كۆڕێكی گرت. لە نێوان قسەكانیدا، توانجی لەو كوردانە گرت، كە دەڵێن: سنووری كوردستان، تا تەنگەی « هورمز » لە سەر كەنداوی « فارس » درێژدەبێتەوە.

بە ڕاستیی، زۆرم هەوڵدا، وەڵامیبدەمەوە، گوتیان كات نەماوە! بەڵام، دەنگم بەرزكردەوە و گوتم: ئەو سنوورە ڕاستە. كەچیی، وەڵامیدایەوە و گوتی: كێ بۆم ڕزگاردەكا، من سوپاسیدەكەم! لە ڕاستیدا، كێشەكە ئەوە نییە، ڕزگاریكەین یا نەكەین. بەڵكوو، ئێمە باسی دەگومێتی سنوورێكی مێژوویی دەكەین. بۆ نموونە:

1. عەرەبەكان خۆشیان دەزانن، تازە « ئەندەلووس »یان لەكیسچووە. بەڵام، ئێستەش هەر دەڵێن، بەشێبوو، لە نیشتمانی عەرەب!

2. جوودەكان، ساڵی حەفتای زایین توانیان، شاری « ئۆرشەلیم ـ قوودس » داگیركەن. پاشان، عەرەبەكان لێیان سەندنەوە. بۆ جاری دووەم، لە ساڵی « 1967 »دا ڕزگاریانكردەوە. واتە: « 1897 » ساڵ، بە سەر داگیركردنی ئەو شارەدا تێپەڕیبووە، ئینجا، هەر ڕزگاریانكردۆتەوە! بەڵام، ڕۆژێ لە ڕۆژان، ئێستە و ئەو ساش، جوودەكان، دانیان بەوەدا نەناوە، شارێكی عەرەبیی بووبێ. هەروەها، عەرەبەكانیش داوایدەكەنەوە و ئەوانیش، دان بەوەدا نانێن، شـــــارێكی « ئیسرایل » بێ، بەڵكوو، هەر بە هی خۆیانی دەزانن!

3. شاری « ئەسكەندەروونە »، كە شارێكی « باكووری كوردستان »e، « توركیا » داگیریكردووە. عەرەبەكانی « سووریا »، ئێستەش هەر دلوای دەكەنەوە.

4. داگیركەری « سپان »، چەندین سەدە دەبێ، شارەكانی « سەبت و میلیریا » و دوورگەكانی « جەعفەریی »یەی « مەغریب »ی داگیركردووە، تا ئێستەش، گەلی « مەغریب »، هەر وازیان لێ نەهێناوە و داوایدەكەنەوە!

5. هەروەها، كێشەی « چین »، لە لایەكەوە لەگەڵ « هۆنگكۆنگ »، لە لایەكی دیكەشەوە، لەگەڵ « تایوان »، نموونەیەكی دیكەی ئەو ڕاستییەمان پیشاندەدا.

ئاشكرایە، دوورگەی « هۆنگكۆنگ »، تا ساڵی « 1841 » لە بندەسی « چین »دا بوو. دوای ئەو مێژووەش، هێزەكانی ئیمپریالیزمی « بریتانیا » داگیریانكرد. ئەم داگیركردنە، تـــــا « 1997. 07. 01 » هەر بەردەوامــبوو. واتە: « 156 » ســاڵی ڕێك، لە ژێردەسی ئینگلیزەكاندا بوو. بەڵام، ڕۆژێ لە ڕۆژان، گەلی « چین » وازی لێ نەهێناوە و هەمیشە هەر داوایكردۆتەوە. ئەوەتە، ئێستەش هەر داوای « تایوان » دەكاتەوە، هەرچەندە، دەوڵەتێكی سەربەخۆشە و « ئەمێریكا » دەیپارێزێ. بەڵام، پێم وایە: ڕۆژێ لە ڕۆژان، ئەو بەشەش هەر دەبێ، بۆ نێو باوەشی پڕ سۆزی نیشتمانی دایك بگەڕێتەوە، جا، ئەوە درەنگ و زوو كەوتووە!

1* دەقەكانی سەرچاوەی « محەمەد ئەمین زەكی بەگ »م، بە كوردییەكی پەتیی نووسیوەتەوە. چونكە، بە ڕاستیی ئەوە نە زمانی كوردیی و نە عەرەبییە، بەڵكوو، زمانێكی تێكەڵاوی كەلێ ناخۆشە، كە لەو سەردەمەدا باوبووە!

2* بە داخەوە، سەرچاوەکەم لە بەر دەسدا نەبوو، تا، دەقەکە خۆی چۆن نووسراوە، وەک خۆی بیگوێزمەوە. بەڵام، وا بزانم، سوڵتان « سولەیاتی قانوونیی » بوو، کە لە نێوان ساڵانی « 1520 - 1566 »دا، فرمانڕەوایی ئیمپراتۆریای « عوسمانیی » کردووە.

3* یەکێ لەو کوردانەی بە ئاشکرا، شانازیی بەو جەنگە و بە « عێراقچێتیی »یەوە دەکا، دوکتۆر « کەمال مەزهەر »ە. تەنانەت، تا ئێستە، چەن جارێ، دژی سەربەخۆیی و جیابوونەوەی کورد لە « عێراق » قسەیکردووە و چاوپێکەوتنی لەگەڵ کراوە!

**سەرچاوەکان:**


1. جلال الطالبانی، کردستان و الحرکە القوکیە الکردیە، بیروت، 1969.
2. جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی، سوید، 1985.
3. حوسێن محەمەد عەزیز، کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، چاپی2، سولەیمانیی، 2000.
4. شەرەفخان بەدلیسیی، شەرەفنامە، چاپی دووەم، تاران، 1981.
5. صبح الاعشی، ب 4، لە « شەرەفنامە،132»وە وەرگیراوە.
6. محمد امین زکی، کورد و کوردستان، جلد 1، 2، 3، بغداد،1931.
7. دوکتۆر میخایل س. لازەریف، کورد و کێشەی کورد، گۆڤاری ئاسیا و ئەفریکای ئەوڕۆ، ژمارە12، مۆسکۆ، 1983. « بە زمانی رووسیی »
8. نبیل الملحم، سبعە ایام مع القائد ابو، 1996.

# ئاغا
# و
# نۆکەر

وەک چۆن، هەموو سەردەمێ، مێژووی سەربەرزیی و سەرفرازیی تایبەتیی خۆی هەیە، وەک چۆن، هەموو سەردەمێ، کەڵەپیاوی گەورەی ناسراوی سەربەستی خۆی هەیە، هەر بەو چەشنەش، هەموو سەردەمێ، مێژووی سەرشۆڕیی و ملکەچیی خۆی هەیە، هەموو سەردەمێ، پیاوی گچکەی نەناسراوی نۆکەری خۆی هەیە. لە هەموو سەردەمێکیشدا، گەر پیاوی گەورەی تێدا هەڵکەوێ، پیاوی گچکەشی تێدا هەڵدەکەوێ!

جا، گەر بە ناخی مێژووی کۆمەڵگە جیاجیاکاندا شۆڕ نەبینەوە، گەر زۆر دوور نەڕۆین و تەنیا هەر، باسی کۆمەڵی کورد بکەین، هەڵبەتە، هەر لە کۆنەوە، هەموو ئاغاکانی کورد، کۆمەڵێ نۆکەری تایبەتیی خۆیان هەبووە. ئەم نۆکەرانە، مەرج نییە، خەڵکی هەمان گوند بووبن. بەڵکوو، گەر لە گوندەکەی خۆیاندا، جێیان نەبووبێتەوە، ئەوا، پەنایان بۆ بەر ئاغای، گوندێکی دیکە بردووە و ئەڵقە لە گوێی ئەو بوون!

خەسڵەتی هەرە لەبەرچاوی ئەم نۆکەرانە، لەوەدا خۆی بینیوە، لە لایەکەوە، وەک سیخوڕێکی خۆبەخش وابوون، هەموو دەنگوباسێکیان، بۆ ئاغاکانیان گێڕاوەتەوە. جاری وا هەبووە، گەر هەر هیچ نەبووبێ، باسێکی ئەوتۆیان نەبووبێ، شایانی باسکردن بووبێ و بە دیاریی، پێشکەش بە ئاغاکانی خۆیانی بکەن، ئەوا خۆیان، گەلێ شتیان ڕێکخستووە و کارگەی درۆی بەرژەوەندییەکانی خۆیانیان پێ بەگەڕخستووە. یا، شتێکی زۆر پچکۆلەیان، هێندە گەورە کردووە، تا، بازاڕی نۆکەریی و چڵکاوخۆرییان گەرمتربێ!

له لایەکی دیکەوە، ئەوەی ئاغا ویستوویەتی، دژی کۆمەلانی خەڵک و نەیارەکانی خۆی بیکا، ئەوا، بە نۆکەرەکانی خۆی ئەنجامداوە. خوا هەڵ ناگرێ، ئەوانیش، زۆر بە ئەمەکبوون و ناپاکییان، لە ئاغاکانی خۆیان نەکردووە، بەڵکوو، بە خراپترین شێوە و زۆر بە دڵسۆزییەوە، ئەرکەکانی سەر شانیان جێبەجێکردووە!

له لایەکی دیکەشەوە، بەرماوەخۆری ئاغاکان بوون، هەر کاتێ، سینیی لە دیوەخانی ئاغا گەڕابێتەوە، هەر چییەکی لە سەر بووبێ، قوزەڵقورتیان کردووە. واتە: بەو بەرماوانە ژیاون!

سەیر ئەوەیە، هێندێ لەو نۆکەرانە، هێندە گەورەبوون و دەستەلاتیان پەیدا کردووە، هێندێ جار، بێ ئەوەی، بۆ بڕیاری ئاغاکانیان بگەڕێنەوە، بە ناوی ئەوانەوە و دژی کۆمەلانی خەڵک، هێندێ کاریان ئەنجامداوە، ئەو کارانەش، تەنیا هەر، لە بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیاندا بووە! بۆیە، هەر وەک چۆن ئاغاکان، کۆمەڵێ نۆکەری تایبەتییان هەبووە، هەروەها، ئەو جۆرە نۆکەرانەش، کۆمەڵێ نۆکەری وردیلەیان ڕاگرتووە، تا، لە لایەکەوە، خۆیان کەمێ پشوویدەن، لە بەر چاوی خەڵکیی وونبن و لە زمانیان دووربکەونەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، دەنگوباسیان بۆ کۆکەنەوە، لە هەموو ڕووداو و بەسەرهاتێکی گرنگ، ئاگاداریانکەنەوە! واتە: دوو جۆرە نۆکەری گەورە و گچکە هەبووە.

دیارە، لە هەموو بار و دۆخێکدا، هەمیشە، خەڵکی بێ دەرەتانی هەژارانی گوندەکان، لە دەس نۆکەرەکانی ئاغا، داد و بێدادیان بووە. واتە: نۆکەرەکانی ئاغا، لە خودی ئاغاکان، گەلێ بێ ڕەوشت، بێ ویژدان، بێ بەزەیی و توند و تیژتربوون. چونکە، ئاغا وەک تولە و تانجی ڕستیکردوون و ڕاوە دوژمنی پێ کردوون. بۆیە هەرگیز، هیچ نۆکەرێ نەبووە، لە گوندێ، یا، لە نێوچەیەکی دیارییکراودا خۆشەویستبووبێ! بە کورتیی: نۆکەرە گچکەکان، لاسایی نۆکەرە گەورەکانیان کردوتەوە. نۆکەرە گەورەکانیش، لاسایی ئاغاکانی خۆیان کردۆتەوە. بەلام، هێشتا ئاغاکان، لە چاو نۆکەرەکانیاندا، بە هەزار ئاو شۆراونەتەوە. چونکە نۆکەرەکان، لە سەگ هارتربوون و لاقی هەموو کەسێکیان گرتووە!

ئەوەتەی دەوڵەتی « عێراق » دامەزراوە، هەمیشە، چەندین جۆر، ئاغا و نۆکەری تێدا هەبووە. بەلام، هیچ سەردەمێ، هێندەی سەردەمی « بەعس 1968 - 2003 »، ئاغا و نۆکەر لە « عێراق » بە گشتیی و لە « کوردستان » بە تایبەتیی، زۆر نەبووە! چونکە، ئاوی دەردی گوولیی ئاغا و نۆکەریی، لە نێو

گەلانی « عێراق »دا، سەرکردەکانی « بەعس » بە گشتیی و « سەددام » بە تایبەتیی ڕشتیان. ئاخر، ئەوەی ڕژێمی « بەعس »، بە کۆمەڵانی خەڵکی بێ دەرەتانی « عێراق »ی کرد، هیچ ڕژێمێکی دیکەی ڕامیاریی و سەربازیی دیکتاتۆر لە جیهاندا، بە ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆیانیان نەکردووە. جا ڕەنگە جیاوازییەکەیان، لە جۆری نۆکەر گرتنەکەدا بووبێ! چونکە، لێپرسراو و کاربەدەسەکانی « بەعس »، شێوازی جیاجیان بەکاردەهێنا، تا، ڕاوەنۆکەری پێ بکەن. سەرەتا، لە ڕێی « بیر، فەلسەفە، ئایدۆلۆژیا، ڕێباز و کاری پارتایەتیی »یەوە، کۆمەڵانی خەڵکیان هەڵدەخەڵەتاند. بە « بیری نەتەوەیی، نیشتمانپەروەریی، کێشەی فلەستین، یەکێتی عەرەب، پێشکەوتنخوازیی، ئازادیی و سۆسیالیزم » لەخشتەیاندەبردن. هەڵبەتە، ئەو دروشمە بریقەدارانەش، پیرۆزیی خۆیان هەیە، لە هەمووشتێکیش پتر و باشتر، کەللەی کۆمەڵانی خەڵک سڕدەکەن، بە تایبەتیی ئایدۆلۆژیا، دانێکی باشە، بۆ کۆمەڵانی خەڵک ڕۆدەکرێ، تا دەسەمۆیانکەن!
بەڵام، کاتێ دەسەڵاتیان وەرگرت، وردەوردە بەهێزبوون، ئیدی، گێڕیان گۆڕی، پەنایان بۆ کڕینی ڕاستەوخۆ برد. ئینجا، یا دەمیان چەوردەکردن، بە پلەوپایە و پارە دەیانکڕین. یا، هەڕەشەیان لێ دەکردن و دەمیان تۆقاندن، تا، واز لە بیر و باوەڕی خۆیان بێنن و سەر بۆ « بەعس » شۆڕکەن. خۆ هەمووشمان باش دەزانین، چەن کەسی خاوەن باوەڕیان، لە هەموو لایەنەکان کڕی، ناو و ناوبانگیشیان، بە تەواویی زڕاندن!
هەرچی چۆنێبێ، بە هەر شێوەیە کاریانکردبێ و خەڵکیان کڕیبێ، هیچ لە باسەکە ناگۆڕێ. چونکە، هەرچەندە شێواز و ئامرازەکانیان جیاوازبووە، بەڵام، مەبەست و ئامانجەکانیان یەکبووە، لە سەر ڕێبازی « ماکیافیلليی » ڕۆیشتوون!
ئاشکرایە، پلانی گەورە و گرنگی گڵاوی « بەعسیی »یەکان ئەوەبوو، هەموو کۆمەڵگەی « عێراق »، بە هەموو گەل و کەمینە جیاجیاکانییەوە، بە هەموو ئایین و ئایینزاکانییەوە، سووک، چرووک، ڕیسوا و سەرشۆڕکەن، وەک نۆکەرێکی سەرشۆڕی بنەماڵەی « سەددام » بیانکرن و گوێڕایەڵبن!
دیارە، « سەددام » خۆی، لە هەموو « عێراق »دا، یەکەمین ئاغا بووە. ئینجا، کوڕ، برا، برازا، ئامۆزا و کەسەکانی دیکەی هاتوون. گەر ئەندامانی سەرکردایەتی « بەعس »یش، بە دەستەی یەکەمی نۆکەرەکانی دا نەنێین و بە ئاغای پلە سێیان دانێین، ئەوا، هەرچی لە خوار ئەوانەوە هاتووە، لە خولگەی دەستەی جیاجیای نۆکەرانی بنەماڵەی ئاغای گەورەدا خولاونەتەوە!

هەڵبەتە، ئەم کارەشیان زۆر بە ئاسانیی بۆ کراوە و سەریشیگرتووە. چونکە، دەسەڵاتێکی بێ ئەندازە و پارەیەکی زۆریشیان هەبووە. ئاخر، چۆن پارەیان نەبێ؟!! چونکە، لەو ڕۆژەوە « بەعس »، دووەمین کۆدەتای خوێناویی خۆی ئەنجامداوە، دەزگەی « ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش » بڕیاریداوە، ساڵانە، لە « 5٪ »ی دەسکەوتی نەوتی « عێراق »، بۆ پارتەکەیان تەرخانکەن و پاشەکەوتیکەن. بۆیە، ساڵی « **1999** »، بڕی ئەو پارەیەی کۆیانکردبۆوە، نزیکەی « **31** » میلیار دۆلار بوو! ئەوە جگە لەو پارە زۆرەی، لە بەر دەس دەزگەکانی پارت و دەوڵەتدا بووە، بەشێکی زۆریان، هەر بۆ ئەو مەبەستە گڵاوانە بەکارهێناوە. جا ئیدی، پارتێکی گەورەی فرمانڕەوای دەوڵەمەندی دەسەڵاتداری وەک « بەعس »، چۆن ناتوانێ، لە ماوەی « **35** » ساڵی دەسەڵاتی خۆیدا، بە هەزاران نۆکەری نەخوێندەوار و خوێندەوار بکڕێ، لە دەوری خۆی کۆیانکاتەوە و مەبەستە چەپەڵەکانی خۆیان پێ جێبەجێکا؟!!

سەیر ئەوەیە، سەرکردایەتی « بەعس » بە نۆکەرەکانی نێوخۆ تێریان نەدەخوارد، پەلیان بۆ هەموو دەوڵەتەکانی نێوچەکە و جیهانیش ڕاکێشابوو، بە هەموو شێوەیە، نۆکەریان دەکڕی، تا لە لایەکەوە، بە شان و بازووی سەرۆکی فرماندە « سەددام »، پارتی پێشڕەو « بەعس » و دەوڵەتی بەهێزی « عێراق »دا هەڵدەن. لە لایەکی دیکەشەوە، دژی دوژمنەکانیان کاربکەن و پیلانیان دژ بگێڕن! لێرەدا، هەر بۆ نموونە دەڵێم: لە « ئۆروودوون »، پڕۆژەی شارێکی وێژەیی و ڕاگەیاندنیان کردبۆوە، لە هەموو وڵاتانی عەرەبەوە، کۆمەڵێ نووسەر و ڕۆژنامەنووسی، لە خۆی کۆکردبۆوە، تا، کاری وێژەیی و ڕۆژنامەنووسیی بکەن، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و زانستانە، دەزگەکانی ڕاگەیاندنی عەرەبیی پێشترخەن. « سەددام »، ئەم هەلەی قۆستبۆوە، ساڵی « **1986** »، بە هەموو شێوەیە، پارەتییدەدان و پتر لە « **200** » کادێری پیشەیی زیرەکی ڕۆژنامەنووسی بەخێودەکرد و مووچەی دەدانێ. ئەوە جگە لەو هەموو فێستیڤاڵانەی، ساڵانە، بۆ نووسەر و هونەرانی عەرەبی ساز دەکرد، کۆمەکی پێ دەکردن و دیاریی بە سەردا دەبەخشینەوە. ئیدی، چۆن داکۆکیی لێ ناکەن؟!!

ئاخر، « سەددام » هەر بەوەشەوە نەوەستابوو، بە دەیان کەسایەتی خوێندەوار، ڕووناکبیر، نووسەر، هونەر، ڕۆژنامەنووسی عەرەب و بیانیی بکڕێ، بەڵکوو، بە دەیان ڕامیار، سەرۆکی پارت، سەرمایەدار و خاوەن کارگەشی کڕی بوو، هێندێ میر و سەرۆکی دەوڵەتەکانیشی ڕستکردبوو. بۆیە، بە هەموو شێوەیە، داکۆکییان لە خۆی و ڕژێمەکەی دەکرد. ئەویش، لە

سەر حسێبی بژێویی کۆمەڵانی خەڵک، لە سەر پارەی نەوتی گەلانی بێ چارەی « عێراق »، بە هەر دوو دەس، پارە و نەوتی دەبەخشییەوە، خەڵاتی بە سەر نۆکەرەکانی خۆیدا دابەشدەکرد. بەڵێ، جگە لە پــــارە و دیاریی گران، « کۆپۆنی نەوت »یشی دانابوو، بە سەر هێندێ بەکرێتگیراوی وەک سەرۆک، رامیار، رۆژنامەنووس، پارت، کۆمەڵ و رێتخکراوی نێوچە جیاوازەکانی جیهاندا دابەشیدەکرد، لە کاتێکدا، منداڵانی « عێراق »، لە برساندا رەق هەڵاتبوون، نەخۆشخانەکان دەرمانیان تێدا نەمابوو، تا، چارەسەری نەخۆشیی پێ بکەن. بێ کاریی، هەژاریی و برسێتییش بڵاوبووبۆوە!
شتێکی سەیر نییە، گەر رژێمی « بەعس »، رۆژانە، « 3 » میلیۆن بەرمیل نەوتی فرۆشتبێ. لەو برە نەوتەش، « 2318 » بەرمیل نەوتی لادابێ و بە سەر بەکرێتگیراوەکانی خۆیدا دابەشیکردبێ!. بەڵێ، « 48 » دەوڵەتی دەوڵەمەند و هەژار، گەورە و گچکە، لە هەموو جیهاندا، لە پلووسکی پڕ بە پیت و فەڕی نەوتی « عێراق »، بەرمیلیان پڕدەکرد و لە سەر حسێبی گەلانی « عێراق »، لەو پەڕی خۆشیدا دەژیان! تەنانەت، هێندێ لە فرمانبەر و کاربەدەسانی، دەزگەی « کۆمەڵەی نەتەوە یەککگرتووەکان »یشی کڕیبوو، لە « بەرنامەی نەوت بەرانبەر بە خۆراک »، پێکەوە دزیاندەکرد و دابەشیاندەکرد. چونکە، زۆربەیان خەڵکی وولاتە هەژارەکانی « سۆدان » و « سۆماڵ » بوون، لە پێناوی پارەدا، ویژدان، بیر و هۆشی خۆیان فرۆشتبوو!
لە هەمووشی سەیرتر ئەوەیە، لە نێو دەوڵەتە گەورە و گچکەکانی جیهاندا، کۆمەڵێ نۆکەری بەکرێتگیراوی گەورەی، لە نێو دەزگەی هێندێ دەوڵەتی وەک: « رووسیای فیدراڵ، فرەنسە، چین، سووریا، توورکیا، مالیزیا، میسر، سویسرا، ئیتالیا، هیندستان، یەکێتی میرنشینەکانی عەرەب، بریتانیا، یۆگۆسلافیا، ئۆکرانیا، لیبیا ... »دا کڕیبوو، هەر دەوڵەتەی، بەپێی پارەتیی خۆی و بەگوێرەی بایەخی تایبەتیی خۆی، « کۆپۆن »ی نەوتی بە سەردا دابەشدەکردن. ئاخر بۆیە، ئەو هەموو دەنگە بەکرێتگیراوانە، دژی جەنگ بەرز دەبوونەوە، دژی « ئەمێریکا » هاواریاندەکرد و داکۆکییان لە رژێمە فاشستەکەی « بەعس » دەکرد! بۆ نموونە: هەر سێ دەوڵەت « رووسیا، فرەنسە و چین » بە ڕیز، یەکی نزیکەی « 702، 162، 152» میلیۆن بەرمیلیان بەردەکەوت. ئیدی چۆن، داکۆکیی لە « سەددام » و رژێمەکەی ناکەن؟!!
لە بواری نەتەوایەتیی و کاری رامیارییشدا، سەرانی هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەی « کوردستان »، هەمیشە، خۆیان بە « ئاغا » و کوردیشیان، بە « نۆکەر » داناوە. وەنەبێ، ئەمەشیان شاردبێتەوە، بەڵکوو، زۆر بە ڕاشکاویی

ڕایانگەیاندووە! بۆ نموونە: توورکەکان، هەر لە کۆنەوە گوتوویانە: (ئەوەی لەم وولاتەدا، لە ڕەگەزی پاکی توورک نەبێ، تەنیا یەک مافی دەکەوێ، مافی خزمەتکاریی و کۆیلەیەتیی.)«104،1»
هەروەها، عەرەب و فارسەکانیش، هیچ کاتێ، لە توورکەکانیان باشتر نەگوتووە و بە چاوێکی باشتریش، لە کورد و کێشەکەیان نەڕوانیوە. لەبەرئەوە، گەر بە نۆکەریشیان نەزانیبێ، ئەوا هەمیشە، کوردیان بە میوان داناوە. بۆ نموونە: « پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست »، لە خاڵی «11»ی دەستوورەکەیاندا نووسیویانە: (ئەوەی باسی کۆمەڵە ڕەگەزێکی دیکەی جیاواز بکا، یا، دژی عەرەب کاری تێدا بکا، یا، بۆ مەبەستێکی داگیرکەرانە هاتبێتە نیشتمانی عەرەب، لە وولاتی عەرەب بەدەردەنرێ.)«8،2»
ئەوڕۆش، لە « باشـــووری کوردستان »، سەرکردەی پارتەکان بە گشتیی، « بارزانیی » و « تاڵەبانیی » بە تایبەتیی، زۆر بە زیادەوە، جێی ئاغاکانی پێشوویان گرتۆتەوە. هێندێ لە ئەندامانی ئەو پارتانەش، شوێنی نۆکەرەکانیان کوێر نەکردۆتەوە! جگە لەوەی، هێندێ خوێندەوار، ڕووناکبیر، نووسەر، هونەر، ئەکادیمیک و پیاوی ئایینییش، بە شێوەیە لە شێوەکان، ڕۆڵی نۆکەری سەرکردەی پارتەکان دەبینن! چونکە، سەردەمەکە گۆڕاوە و ژیانی کۆمەڵایەتیی وا پێویستدەکا.
هەروەها، هەموو ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتەکانیش، کۆمەڵێ نۆکەری تایبەتیی خۆیان هەیە. جگە لەوەی، هەر دەزگەیەکی « نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئایینیی، کۆمەڵایەتیی، کەلتووریی ... هتد»ش، کۆمەڵێ نۆکەریان لێ کۆبۆتەوە. سەرۆکی ئەو دەزگایانەش، وەک ئاغا ڕەفتاردەکەن، چەن نۆکەرێکیان لە دەور ئالاوە، چییان بوێ، ئەوەیان پێ دەکەن!
لەبەرئەوە دەبینین: کاتێ نووسەرێکی نیشتمانپەروەری بێلایەن، ڕەخنە لە سەرکردەی پارتێکی دیارییکراو دەگرێ، چەن ئەندامێکی نۆکەر، یا، چەن نووسەرێکی بیر و پێنووسفرۆش، لەبری ئەوان، وەڵامی نووسەرە ڕەخنەگرەکە دەدەنەوە، بە جـاری پەلامـاریدەدەن، وەک تولە و تانجی ڕستکراو، ڕاوە کەروێشکی پێنووسی سرک و سەرکێشی نووسەرە نیشتمانپەروەرە بێلایەنەکان دەکەن، بە ناوی داکۆکییکردن لە سەرۆک و پارتەکانیانەوە، ئەوەی ناشیرینبێ، بەو جۆرە نووسەرانەی دەکەن، تا، سەرۆکە ئاغاکانیان لێیان ڕازییبن. بۆیە هەمیشە، مەترسیی ئەو جۆرە ئەندام و نووسەرانە، لە هەموو سەردەمێکدا، لە مەترسیی سەرکردەکانیان، بۆ سەر کۆمەڵانی خەڵک و نووسەرە خاوەن هەڵوێستەکان پتربووە.

ئاخر دەبووایە، ئاغاسەرۆکێکی وەک « مەسعوود بارزانیی »، زۆر لەوە گەورەتربووایە، لە ڕۆژی « 2004. 08. 16 »دا و بە بۆنەی دامەزراندنی پارتەکەیەوە، هەڕەشە لە نووسەرانی ڕەخنەگری بێلایەن بکا! بە ڕاستیی، هەق نەبوو، لەو ئاستەدابێ، ئەو جۆرە زاراوانە بەکاربێنێ، ڕەخنەی نووسەرانی کورد، بە ژار بچوێنێ و بە بوختانهەڵبەستن تاوانباریانکا! چونکە، ئەو نووسەرانە، تەنیا هەر ئەوڕۆ، ڕەخنەیان نەگرتووە، بەڵکوو، لە گەرمەی جەنگی چەپەڵی نێوخۆشدا، دەنگ و ڕەنگیان هەبووە، لە کاتێکدا، هەر هەڵەیەکیشیان کردبێ، هەر ڕەخنەی خۆیان گرتووە! ئاخر، « مەسعوود بارزانیی »، ئەو هەموو نۆکەر و پێنووسفرۆشانەی لە بەر دەستدایە، چ پێویستی بەوە دەکرد، خۆی سەغڵەتکا و پەنا بۆ بەر هەڕەشەکردن بەرێ؟!!
جا گەر جاران، ناکۆکیی و دووبەرەکییەکی گچکە، لە نێوان دوو ئاغا دێدا درووستبووایە، پاشان، بە دانیشتن و دانوستان چارەسەرکرایە، یا، بە شەڕەتفەنگ کۆتاییبهاتایە، ئەوا نۆکەرەکان، پێش هەموو پیاوەکانی دیکەی ئاغا هەوڵیاندەدا، بارەکە ئاڵۆزترکەن، دووبەرەکیی و ناکۆکییەکە قووڵتر کەنەوە، شەڕ و هەراکە گەرمترکەن، تا، تێکەیە نانی چەوورتریان دەسکەوێ!
ئەوڕۆش، سەرکردایەتیی ئەو دوو پارتە دەسەڵاتدارەی « باشوور »، هەر هەمان گرفتیان هەیە و نۆکەرەکانیشیان، هەر هەمان ڕۆڵ دەبینن. چونکە، جگە لەوەی، ناکۆکیی و دووبەرەکییەکی گەورە و مێژوویی دووردرێژ، لە نێوان ئەو دوو پارتەدا هەیە، خوێنێکی زۆریش، لە نێوانیاندا ڕژاوە و دوژمنایەتییەکەش، تا سەر ئێسک ڕۆشتووە! ئەندامە نۆکەرەکانیش، بە هەموو شێوەیە هەوڵدەدەن، ناکۆکیی و دووبەرەکییەکە قووڵترکەنەوە، برینەکان پتر بکولێننەوە، تا، لای ئاغاکانیان خۆشەویستربن، جێ و ڕێی باشتریشیان دەسکەوێ! ئاخر، گەر وا نەبێ، چۆن « مەسعوود بارزانیی »، پاکانەی بۆ خۆی و « تاڵەبانیی » دەکرد و دەیگوت: من و « مام جەلال »، لە هەڵگیرساندنی جەنگی نێوخۆدا، بێ تاوان بووین! دە دیارە، « بارزانیی » باشتری دەزانێ، کێ ئەو جەنگە چەپەڵەی هەڵگیرساند و کێش تاوانباری ڕاستەقینەبووە؟!! جا گەر واشبێ، ئەدی لە پای چی، چاوپۆشیی، لە تاوانباران دەکرێ؟!! ئەمەیە دەڵێ: عوزر لە قەباحەت خراپتر!
جا گەر ئەوڕۆ، سووکە ڕێککەوتنێ، لە نێوان سەرکردایەتیی ئەو دوو پارتەدا هەبێ، بە ئاشکرا، پەلاماری یەکدی نەدەن، دەزگەی ڕاگەیاندنەکانیان، جار و بار، ڕەخنەی سووک لە یەکدی بگرن و گلەیی بێ دان لە یەکدی بکەن، ئەوا، هەر دوو لایان لە بنەوە، نۆکەرەکانی خۆیان هاندەدەن، ئەوەی خۆیان لەم

قۆناغەدا، بۆیان نالوێ، بیڵێن و بینووسن، ئەوا ئەوان، بە خراپترین شێوە دەیڵێن و دەینووسن!

بەڵام، سەگوەڕی نۆکەرەکانی ئاغاکانی دوێنێ، چۆن بە مانگەشەوی کوردەواریی دەوەڕین، نۆکەرەکانی ئاغاکانی ئەوڕۆش، هەر بە هەمان شێوە، بە تریفەی زیوینی مانگەشەوی، دەسوپەنجە و پێنووسی ڕەنگینی، نووسەرانی بێلایەنی ڕەخنەگری، نیشتمانپەروەری ڕاستەقینە دەوەڕن. هەڵبەتە، زەریاش بە دەمی سەگ پیس نابێ، هەرچەندە، سەگێکی زۆر گەورەش بێ! بەڵام، خۆزگە، ڕۆڵە بە جەرگە دڵسۆز و نیشتمانپەروەرەکانی کورد، لە سەر هیچ ئاست و لە هیچ بوارێکدا، وەک « هێمن » گوتوویەتی: ئاغایان بە نۆکەر ڕا نەدەگرت!

* * *

---

بۆ نووسینی ئەم گوتارە، کەڵک لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

1. جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی، وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە کوردۆ عەلی، بنکەی چاپەمەنی ئازاد، چاپی1، سوید، 1985.
2. حزب البعث العربی الاشتراکی، دستور حزب البعث العربی، مطبعه الاعتدال، دمشق، 1947.
3. الدکتور بیوار خنسی، کوبونات النفط تمول الاعمال الارهابیه فی عراقنا الجدید، Kdp.Info، 18. 10. 2004.

ئاشکرایە، دوو جۆر بەڵا هەیە: بەڵای گچکە و گەورە. بەڵای گچکە، کۆمەڵانی خەڵک زۆر ناهەژێنێ و بە هۆش خۆیان ناهێنێتەوە، چونکە، زیانێکی کەم دەگەیەنێ و ماوەیەکی کورت دەخایەنێ. بەڵام، بەڵای گەورە، کۆمەڵگەی مرۆ، لە ناخەوە دەهەژێنێ و لە خەوی بێداریی ڕایدەپەڕێنێ، چونکە، زیانێکی گەلێ گەورەی لێ دەکەوێتەوە، ماڵی مرۆ، یا، نیشتمانی گەلێکی دیارییکراو وێراندەکا و ماوەیەکی زۆرتریش دەخایەنێ! بۆیە، کاتێ هەر کوردێ، تووشی بەڵایەکی گچکە بووە، سوپاسی خوای کردووە و گوتوویەتی: خوایە! بەڵای لەوە گەورەتر نەدەی.

هەڵبەتە، بە هیچ شێوەیە نابێ، هیچ مرۆڤێ، هیچ جۆرە بەڵایە پشتگوێخا، هەرچەندە، گچکە یا گەورەش بێ. بەڵکوو دەبێ، زۆر بە وردیی، لە هۆکانی بکۆڵێتەوە، بە هەموو شێوەیە هەوڵبدا، بەری پێ بگرێ، تا، لەوە پتر نەتەنێتەوە. ئەگینا، گەر لە بەڵای گچکەوە، فێری هێندێ پەندی گرنگ نەبین و وانەی پڕ بایەخی لێ وەر نەگرین، ئەوا، جگە لەوەی، بە شێوەیەکی بەردەوام، دووبارە و چەن بارەدەبێتەوە، تووشی بەڵای گەورەتریش دەبین!

بەڵا هەیە، جا، چ گچکە و چ گەورە بێ، بە شێوەیەکی سروشتیی ڕوودەدا، هیچ کەس و لایەنێ، دەسەڵاتیان نییە، بەری پێ بگرن. بۆ نموونە: گەر گڕکانێ بتەقێتەوە، بە جارێ، نێوچەیەک دەسووتێنێ. گەر لافاوێکی گەورە هەستێ، هەرێمێکی زۆر دەگرێتەوە، زیانێکی زۆری گیانیی و مەتیریاڵی دەگەیەنێ.* گەر بەفرێکی زۆر بباری، نێوچەیەکی دیارییکراو دادەپۆشێ، خەڵکەکەی لە سەرماندا ڕەقدەبنەوە و لە برساندا دەمرن. گەر چەن ساڵێ لە سەر یەک، لە وڵاتێکی دیارییکراو باران نەبارێ، هیچ شتێ لەو وڵاتەدا

سەوز نابێ. لەبەرئەوە، بێ کاریی، هەژاریی، گرانیی، برسێتیی، نەخۆشیی و مردنی بە کۆمەڵ بڵاودەبێتەوە، هەر وەک لە هێندێ وولاتی « ئەفریکا »دا دەبینرێ. تەنانەت، گەر ساڵێ، چەن جانەوەرێکی وەک: « سن » و « کولله »، لە وولاتێ پەیدابن، لە بەرووبوومی کێڵگە، سەوزە و میوەکەی بدەن، زیانێکی زۆر گەورە، لە سامانی کشتوکاڵی ئەو وولاتە دەدەن و برسێتییش، تەنگ بە دانیشتووانەکەی هەڵدەچنێ!

هەروەها، جەنگیش بە هەموو جۆرەکانییەوە، چ جەنگی نێوخۆ، چ جەنگی نێوان دوو دەوڵەت، چ جەنگی نێوان چەن دەوڵەتێ لە نێوچەیەکی جوگرافیایی دیارییکراودا، چ جەنگی نێوان دەوڵەتەکان لە کێشوەرێکی تایبەتیی و چ جەنگی جیهانیی بێ، بە یەکێ لەو بەڵا گەورانە دەژمێررێ، کە بەرۆکی رۆڵەکانی گەل و نەتەوە جیاوازەکانی، سەر رووی زەوی دەگرێ. چونکە، جگە لەوەی، خەڵکێکی زۆری گەورە و گچکە، چەکدار و بێ چەک، تاوانبار و بێ تاوانی تێدا دەکوژرێ، جگە لەوەی، بێ کاریی، هەژاریی، گرانیی، برسێتیی، تینوێتیی، نەخۆشیی، ترس و لەرز بڵاودەبێتەوە، جگە لەوەی، پارەیەکی زۆری دەوێ و ئابووریی دەوڵەتەکانی جیهان هەڵدەتەکێنێ، هەموو ئەو نێوچانەی، جەنگەکەشی تێدا روودەدا و تێیدا دەتەنێتەوە، کاول و وێران دەبن! هەر بۆ نموونە: ئێستەش، ئەنجامی کارەساتی جەرگبڕی هەموو ئەو جۆرە جەنگانە، لە بیرەوەریی کۆمەڵانی خەڵکدا دەژین و لە لاپەڕەکانی مێژوودا هەر زیندوون، بە تایبەتیی، هەر دوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهان، خوێنێکی زۆر و ماڵوێرانییەکی زۆریان ویست!

بەڵام، هێندێ بەڵای دیکەش هەیە، ڕۆژانە روودەدا، زۆر پێوەندیی بە کاری سروشتەوە نییە، بەڵکوو، مرۆ خۆی بە دەسی خۆی، بۆ خۆی دروستدەکا.

جا، گەر مرۆڤێ ژیربێ، زوو هەستیپێبکا، توانای بیرکردنەوەی هەبێ و چارەوری بگرێ، ئەوا، بە ئاسانیی دەتوانێ، کۆنترۆڵیکا و نەیەڵێ، زۆر بتەنێتەوە و زیانێکی گەورەش بگەیەنێ. بەڵام، گەر مرۆڤێ گەمژەبێ، زۆر بایەخ بە شت نەدا، هەست بە قەبارەی ئەو بەڵایە نەکا، ئەوا ناتوانێ، لە زیانە ڕاستەقینەکانی بگا، تا، هەر زوو هەوڵبدا، کۆنترۆڵیکا، بەڵکوو دەتەنێتەوە و زیانێکی زۆریشی پێ دەگەیەنێ!

ڕەنگە، گەر بڵێم: یەکێ لە هۆ هەرە سەرەکییەکانی هەموو ئەو جۆرە بەڵایانە، بۆ خەسڵەتە خراپەکانی مرۆ بە گشتیی، سەرکردە و لێپرسراوانی پارت و دەوڵەتەکان بە تایبەتیی دەگەڕێتەوە، لە ڕاستیی لام نەدابێ! چونکە، گەر کەمێ، لە مێژووی کۆمەڵگەی مرۆ وردبینەوە، زۆربەی ئەو جەنگانەی، لە مێژووی نوێی جیهاندا روویانداوە، تەنیا هەر، تاکە سەرکردەیەکی دیکتاتۆر

و خوێنرێژ هەڵیانگیرساندوون. هەر بۆ نموونە: « هیتلەر، مۆسۆلۆنیی، ستالین، فرانکۆ، سەددام حوسێن ... »، چەن پاڵەوانێکی نازیی، فاشیی و ڕەگەزپەرست بوون، سەراسەری جیهانیان، لە خوێن و فرمێسکدا نقوم کردووە!
جگە لەوەی، خەسڵەتی مرۆ وا دروستبووە، کەم کەس هەیە، زۆر بە باشیی، خۆی بناسێ و بزانێ، بایی چەندە؟!! بە کەڵکی چی دێ و چی پێ دەکرێ؟!!
کەم کەس هەیە، دان بە هەڵە و تاوانەکانی خۆیدا بنێ. کەم کەس هەیە، ڕێز لە بەرانبەرەکەی خۆی بگرێ و بە مرۆیەکی لە خۆی خوێندەوارتر، ڕووناکبیرتر، هونەرمەندتر و دەسڕەنگینتری بزانێ. لە هەمان کاتیشدا، زۆربەی خەڵکیی، خۆیان بە بیریار، فەیلەسوف و زانا دەزانن و « ئەرستۆ » بە شاگرد ڕاناگرن! لەبەرئەوە، گەر تەنیا هەر، باسی کۆمەڵگەی کورد بکەین، زۆر بە ڕوونیی دەبینین: ماکی زۆربەی کارەسات و ناسۆرەکانی ژیانی کۆمەڵگەکەمان، پتر بۆ ئەو جۆرە هۆ و خەسڵەتانە دەگەڕێنەوە!
لەگەڵ ئەوەشدا، زۆر کەس هەن، لە ژیاندا، لەگەڵ ڕەوشی گەلەکەیاندا ناگونجێن، زۆر توندوتیژ و توندڕەون، نەرم و نیان نین، لێبووردنیان زۆر کەمە، یا، هەر نییانە، هەمیشە، دژی خەڵکیی دەدوێن و دەوەستن، وا دەزانن، لە ژیاندا، خوا کەسی دیکەی درووست نەکردووە، تەنیا هەر خۆیان نەبێ. بۆیە، زۆر زوو لە خۆیان بایی‌دەبن، زۆر بە فیز و لووتبەرزن.
هێندێکی دیکە هەن، گەر خۆشیان هیچ نەبن و جێیەنجەیان، لە نێو ڕیزەکانی کۆمەڵدا دیار نەبێ، ئەوا، خۆیان بە پشت و بنەماڵەکانیانەوە بادەدەن و پێیانەوە دەنازن، لە کاتێکدا، خۆیان هیچ نین، هیچ کارێکی مەزن و باشیان پێ ناکرێ، کەڵکیان بۆ خۆیان و کۆمەڵگەکەشیان نییە، هەر وەک « مەحویی » هۆنەریش فەرموویەتی:
فەضیلەی ئەصڵ و فەصڵ، ئینسانی پێ نابێ بە صاحیب فەضڵ
کە تۆ کۆسەی، بە تۆ چی مامە، ڕیشی باب و باپیرت
هێندێکی دیکەش هەن، پارە و پلەوپایەی کۆمەڵایەتیی، سەری لێ شێواندوون، تا، تووشی نەخۆشییەکی سەخت، یا، بەڵایەکی گەورە دەبن، ئەو کاتە، لە خەونی بێداریی خەبەریاندەبێتەوە و هۆشێکیان بە بەر خۆیاندا دێتەوە. تەنیا هەر ئەو کاتەش، لە زۆر شت تێدەگەن، لە زۆر شتیش پاشگەزدەبنەوە و پەنجەی پەشیمانی خۆیان دەگەزن. بەڵام، کە کار لە کار ترازا و تێپەڕی، لەبری تەشت، گەر بە بەرمیلیش، قوڕی پەشیمانیی بپێون. هیچ کەڵکێکی نابێ!

ئاخر پەشیمانیی، تەنیا هەر یەک کەڵکی گرنگی هەیە، ئەویش ئەوەیە: گەر مرۆ بە تەواویی پەشیمابێتەوە و بۆ سەر کردەوە خراپەکانی خۆی نەگەڕێتەوە، ئەوا، لە لووتکەی ئەو بەڵایەدا دەوەستێ، پەندی لێ وەردەگرێ و بیر لەوە ناکاتەوە، جارێکی دیکە، کار و کردەوەی لەو چەشنانە بکاتەوە!
ئیدی، ئەو مرۆ کەللەڕەقە توندڕەوە، وا نەرمدەبێ، هەر شتێکی باشی پێ بڵێن و لە بەرژەوەندیی گەلەکەیدا بێ، ڕەتی ناکاتەوە، دەمەتەقێی بێ کەڵکی لە سەر ناکا، دید و بۆچوونەکانی خۆی، بە سەر بەرانبەرەکانیدا ناسەپێنێ.
هەڵبەتە، گەر ئەم بۆچوونە، بۆ تاکە مرۆڤێ، یا، چەن کەسێ ڕاستبێ، ئەوا، بۆ خێزان، بنەماڵە، خێڵ، پارت و گەلێکی دیارییکراویش، هەر ڕاستە.
چونکە، بنچینەی سەرەکیی هەموو کارێ، پێوەندیی بە پەروەردەکردنەوە هەیە. جا با بزانین، لە بەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستییەدا، باری کۆمەڵی کوردەواریی چۆنە؟ پێوەندیی نێوان ڕۆڵەکانی گەل و پارتەکانی، لە چ ئاستێک دایە؟ ئایا تا ئێستە، پارتە ڕامیارییەکانی « کوردستان » بە گشتیی، پارتەکانی « باشوور » بە تایبەتیی، گوێیان بۆ هیچ کەس و لایەنێکی کوردیی ڕاگرتووە؟ بۆچی ڕۆژێ لە ڕۆژان، سەرکردەی پارتەکان، ڕێزیان لە ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆیان گرتووە، تا گوێیان بۆ ڕادێرن؟!! ئایا، لە دیارییکردنی مافی چارەنووسی نەتەوەی کورددا، پرسیان بە هیچ کوردێ کردووە؟! ئاخر بۆیە، ڕۆژی کوردیان، بەو ڕۆژەڕەشە گەیاندووە، چونکە تەنیا هەر، گوێیان لە دەنگی دڵ و دەروونی خۆیان گرتووە. واتە: بە دەنگی بەرز بیریانکردۆتەوە و لە دڵی خۆشیاندا بڕیاریانداوە!
ئاخر، بۆ دەبێ، پرس و ڕا، بە یەکدی نەکەین و لە یەکدی نەگەین؟!! ئایا هەمیشە، دوو کەللەسەر لە کەللەسەرێ، سێ کەللەسەر لە دووکەللەسەر باشتر نەبووە و باشتریش نییە؟!! ئایا هەمیشە، کۆمەڵێ لە تاکێ، باشتر بیریان نەکردۆتەوە و باشتریش بیر ناکەنەوە؟!! تۆ بڵێی، مێشکی یەکێ لەو دوو سەرکردەیەی « پارتیی » و « یەکێتیی »، لە « زێڕ » و مێشکی ئەوی دیکەشیان، لە « پەتاتە » درووستکرابێ، وا لە یەکدی ناگەن، گوێ بۆ یەکدی و ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆیان ڕاناگرن؟!!!
تەنانەت، بەرژەوەندیی تەسکی پارتایەتیی، هەڵپەی پارە و کورسیی، خەسڵەتی لووتبەرزیی و لەخۆباییبوونی سەرکردە و ئەندامانی سەرکردایەتی پارتەکان، بارێکی نەتەوەیی و ڕامیاریی وا ئاڵۆزی، لە نێو کورددا ئەفراندووە، ڕەوشێکی دەروونیی وا گرێوگۆڵاویی درووستکردووە، کارێکی وا خراپی، لە دید و بۆچوونی ڕۆڵەکانی کورد کردووە، بێ ئەوەی، هیچ جۆرە هۆیەکی گرنگ

ههبێ، تا، پهلاماری یهکدی بدهن، جهنگێکی چهپهڵی نێوخۆیان، دژی یهکدی بهرپاکردووه، وهک کهوی خۆخۆر، له گیانی یهکدی بهربوون و خوێنێکی زۆریشیان ڕشتووه. بهڵام، کاتێ تووشی بهڵایهکی گهورهتر بوون، له توانا و هێزی خۆیان گهورهتربوو، نهیانتوانی، به تهنیا بهرهنگارییبنهوه و به سهریدا سهرکهون، کهمێ کهللهیان نهرمبوو، وردهورده، وازیان له دیکتاتۆریی و خۆخۆریی هێنا، له بهرانبهر ئهو بهڵا گهورهیهدا، دانیان به پچووکیی، بێ هێزیی و بێ دهسهڵاتیی خۆیاندا نا! تهنیا ههر ئهو کاتهش، له ناچارییدا، دهسی برایهتی نهتهوهییان، له نێو دهسی یهکدی نا، به تایبهتیی، دوای ئهوهی، داگیرکهری دهوڵهتی « عێراق »، چهکی کیمیاویی، له نێوچه جیاجیاکانی « باشووری کوردستان »، دژی ڕۆڵهکانی گهلی کورد بهکارهێنا، نزیکهی « 250 » ههزار کوردی بێ تاوانی، به « ئهنفال »، له بهرهکانی جهنگ و له نێو گرتووخانه تاریک و سامناکهکانیدا لهنێوبرد، تهنیا ههر ئهو کاته، « بهرهی کوردستانیی »یان دامهزراند، پێکهوه و پێکرا، دهسیان به خاباتکردن کردهوه، تا کۆتایی به ڕاپهڕینه مهزنهکهی بههاری « 1991 » هات! بهڵام، چونکه سهرکردهی ئهو دوو پارته: « بارزانیی » و « تاڵهبانیی »، به تهواویی، له کردهوه خراپهکانی خۆیان پهشیمان نهبووبوونهوه، ئهو کارهیان، له ناچاریی و له ژێر گوشاری دوژمندا کردبوو، وهک دوو « حهلیمه »ی کوردیی، بۆ سهر کردهوه کۆنهکانی خۆیان گهڕانهوه، له کاتی ئاشتیی، سهربهخۆیی و سهربهستیی گهلی کورددا، جارێکی دیکه، پهلاماری یهکدیان دایهوه و چوار دانه ساڵی ڕهبهق، کوڕی کوردیان بهکوشتدا، ئهوهی پیاوکوژهکانی « بهعس »ی داگیرکهر نهیتوانی، لهو ماوهیهدا بهئهنجامیبگهیهنن و تهواویکهن، ئهوا ئهوان، به زیادهوه بۆیان تهواوکرد و سڵاویشیاندایهوه!

ئاخر، سهیر ئهوهیه، ئهو ههموو جهنگه چهپهڵانهی نێوخۆ، له نێوان ههموو لایهنهکاندا ڕوویاندا، به ههزاران کوڕی کوردیان تێدا کوژرا، جگه لهوهی، کهس نهیزانی، بۆ بهرپابوون؟!! چۆن کڵپهیانسهند؟!! کێ ههڵیگیرساندن؟!! کێ تاوانباری ڕاستهقینهبوو؟!! کهچیی، لهگهڵ ئهوهشدا، سهرانی پارتهکان، وهک بهرزهکی باتان بۆی دهرچوون و لێی پهڕینهوه، ڕۆژێ له ڕۆژانیش، داوای لێبوردنیان، له کهسوکاری شههیدان و ڕۆڵهکانی گهلهکهی خۆیان نهکرد. بهڵکوو به پێچهوانهوه، ههرگیز، خۆیان به تاوانبار نهزانیوه و زۆر به ڕاشکاوییش، داکۆکییان له خۆیان کردووه! بۆیه « مهسعوود بارزانیی »، له گوتارێکیدا گوتی: من و « مام جهلال »، له ههڵگیرساندنی جهنگی نێوخۆدا، بێ تاوان بووین!

جا گەر ئەم گوتەیە، خۆی لە خۆیدا، بەڵایەکی گەورە نەبێ، ئیدی دەبێ، بەڵا لەوە گەورەتر، چی دیکە بێ؟!! چونکە، گەر هەر یەکێ، هەڵەیە یا تاوانێکی گەورە بکا، لە ئەنجامدا پەشیمان نەبێتەوە و دان بە هەڵە، یا تاوانەکەی خۆیدا نەنێ، ئەوا، بەڵا لەوە بەلاتر دروست نابێ، تا، یەخەی ئەو کەسە بگرێ. چونکە هەمیشە، لە سەر هەڵە و تاوانەکانی خۆی بەردەوامدەبێ و کاری خراپتریش ئەنجامدەدا! ئاخر، ئەوەی بڕبڕەی پشتی کوردی شکاندووە، هەر ناکۆکیی، دووبەرەکیی، خۆخۆریی، ناپاکیی و جەنگی نێوخۆ نییە؟!! ئیدی دەبێ، هیچ بەڵایە هەبێ، لەو بەڵایە گەورەتربێ، تا، لە دەرگەی چانسی ڕەشی کورد بدا؟!!

لەگەڵ ئەوەشدا، تەنیا هەر ئەو سەرکردانە تاوانبار نین، بەڵکوو، ڕۆڵەکانی گەلی کوردیش تاوانبارن. چونکە، لە بەرانبەر ئەو هەموو هەڵە، تاوان، ناپاکیی و بەڵا گەورانەدا، دەنگیان لێوە نەهاتووە، ڕا نەپەڕیون و پەلاماریان نەداون. بەڵام، گەر ئەو سەرکردە و پارتانە، هێزێکی ئەوتۆیان نەبووایە، ڕۆڵەکانی کورد، پشتیان تێ بکردنایە، ڕووە گرژ و تاڵەکەی خۆیانیان پیشان بدانایە، ئینجا، ئەو کاتە دەمانزانی، چۆن گێریان دەگۆڕی و پەشیمان دەبوونەوە، نەک هەر پەنجەیەک، بەڵکوو، هەر دە پەنجەی خۆشیان دەگەزی! بەڵام، گەر کەسێ نەبێ، بەرانبەریان بوەستێ، لێیان بپرسێتەوە و بۆ بەردەم دادگەی گەل ڕاپێچیانکا، ئەوا، گۆڕەپانەکەیان بۆ چۆڵدەبێ و بە ئارەزووی دڵی ڕەشی خۆیان، تەراتێنی تێدا دەکەن، ئەوەی دەشیانەوێ، دەیکەن، بێ ئەوەی، کەسێ هەبێ، یا بوێرێ، پێیان بڵێ: پشتی چاوتان برۆیە!

لە کۆتاییدا دەڵێم: تۆ بڵێی، ڕۆژێ لە ڕۆژان، « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، دڵ و دەروونیان، بە ئاوی خاوێنی کوردایەتیی ڕاستەقینە بشۆنەوە، دەستنوێژی برایەتیی و تەبایی ڕیزەکانی کورد بگرن، نوێژی دڵسۆزیی و ڕاستگۆیی، بۆ خاکی پیرۆزی « کوردستان » بکەن، واز لە خۆپەرستیی بێنن، ڕوو لە ڕووگەی کوردپەروەریی و نیشتمانپەروەریی ڕاستەقینە بکەن، نوێژ بۆ خوا، نزا بۆ خۆیان و خەبات بۆ گەلە چەوساوە بندەستەکەیان بکەن، جارێکی دیکە، چ خۆیان و چ کورد، تووشی بەڵایەکی دیکەی جەنگی پۆخڵی نێوخۆ نەکەنەوە!!! ئاخر، ناهەقم نییە، نیگەرانبم، چونکە، هەموو جارێ، تەنیا هەر، ئەو دوو سەرکردە جوامێرە، تەونی جاڵجاڵۆکەی سەر ڕێی یەکێتیی، تەبایی و برایەتیی « کورد ــ کورد »یان پچڕاندووە و تێکداوە!

هەرچەندە گوتوویانە: تۆبەی گوورگ مەرگە. بەڵام، هیوایەکی زۆرم، بە ڕۆڵە نیشتمانپەروەرە دڵسۆزەکانی کورد هەیە، لە ئاییندەدا، بە هەموو شێوەیە

هەوڵبدەن، تەبایی، یەکێتیی، برایەتیی، ئاسایش، ئاشتیی و ئاشتبوونەوەی نەتەوەیی، لە نێوان ڕیزەکانی گەلدا بچەسپێنن، جارێکی دیکە، بە هیچ شێوەیە نەیەڵن، ئەو دوو سەرکردە تاوانبارە، بە خۆڕایی، خوێنیان بڕێژن، هاوئاهەنگیی نەتەوەیی، لە هەموو « کوردستان » بە گشتیی و لە « باشوور » بە تایبەتیی، لە نێوان باڵەکانی بزووتنەوەی کوردیدا، باڵ بە سەر کار و کردەوەکانیاندا بکێشێ، تا نەتەوەی کورد، لە نێو ڕیزی نەتەوەکانی جیهاندا، چی دیکە لەوە پتر، سووک و ڕیسوا نەبێ!

* * *

---

تێبینیی:

* دەبێ، بەڵا لەوە گەورەتر چی بێ، لە ماوەیەکی کەمدا، لە ئەنجامی « تسونامی »، لە ئەنجامی ئەو تۆفانە گەورەیەدا، « 232.000 » کەس گیانیان لەدەستدایێ و « 732 » کەسی دیکەش، تا ئێستە دیار نەبن!

# لووتکەی بێ ڕەوشتیی

شتێکی زۆر سەیر نییە، گەر بڵێم، هەموو سیستێمە دیکتاتۆرییە میلیتارییە فاشییە خوێناوییەکان، بۆ ئەوەی بەردەوامبن و بمێننەوە، بە هەموو شێوەیە هەوڵدەدەن، هەموو هێزە دژەکانی خۆیان لەنێوبەرن. چ بە شێوەی تاک و چ بە شێوەی کۆمەڵ بێ، پاکتاویاندەکەن. ڕاویاندەنێن، دەیانگرن، لە گرتووخانە تاریکەکانی خۆیاندا تووندیاندەکەن، بە هەموو جۆرێ، ئازار و ئەشکەنجەیان دەدەن. تەنانەت، دەس بە سەر ماڵ و موڵکەکانیشیاندا دەگرن، زۆر جاریش، دەس بۆ ئابڕووی ژنان و پیاوانیشیان درێژدەکەن، تا، لە ڕووی دەروونیی و مەراڵەوە، بیانشکێنن و چاو بەرەو ژێریانکەن.

ئەم ڕەوشتە دڕندانە و فاشستانانەیە وەنەبێ، تەنیا هەر لە لایەن ڕژێمێکی دیارییکراوەوە پێڕەوکرابێ و ڕوویدابێ، بەڵکوو، زۆر ڕووی جیاوازی هەبووە و هەیە، لە چەن بارێکی جیاجیاشدا، خۆی نواندووە و ڕوویداوە:

1. ڕژێمێکی دیکتاتۆری کۆنەپەرست، فەناتیک، نەتەوەیی، یا کۆمۆنیست، سووکایەتیی بە ئەندامانی گەلەکەی خۆی دەکا و بە خراپترین شێوە دەیان چەوسێنێتەوە. هەر وەک لە هەموو دەوڵەتە پۆلیسیی و دیکتاتۆرییەکانی جیهاندا ڕوویداوە!

2. لە کاتی جەنگی نێوخۆی نێوان دوولایەنی گەلێکی دیارییکراودا، هێندێ کرداری نامرۆیانە دەکرێ، هیچی لە کردار و ڕەفتاری ڕژێمە داگیرکەرە بیانییە دیکتاتۆرەکان کەمتر نییە. بۆ نموونە: جەنگی نێوخۆی نێوان هەر دوو خێڵی دواکەوتووی « تووتسیی » و « هووتوو » لە « ڕواندە »، جگە لەوەی، پتر لە نیو میلیۆنیان لە یەکدی کوشت، کار بەوە گەیشت، مردووەکانیش، لە دەس لایەنە نەیارەکان ڕزگاریان نەبێ! یا، جەنگی نێوخۆی نێوان « پارتیی » و « یەکێتیی »، هەر دوولایان، ئەوەی « بەعس »ی داگیرکەر فریا نەکەوت، لە « باشووری کوردستان »دا بیکا، ئەوان ئەنجامیاندا!

3. له کاتی جەنگی ڕزگاریخوازانەی نێوان گەلانی بندەس و گەلە سەردەسەکاندا، دوژمنی بیانیی داگیرکەر هەوڵدەدا، بە هەموو شێوەیە، توانا و وورەی شۆڕشگێڕانەی ڕۆڵەکانی گەلە بندەسەکە بڕوخێنێ، لە خەباتی ڕەوا، دادپەروەرانە، شۆڕشگێڕانە و دیموکراسییانە ساردیانکاتەوە، تا، واز لە ئامانجە پیرۆزەکانیان بێنن. هەڵبەتە، داگیرکەران بەوەشەوە ناوەستن، شۆڕشگێڕان خۆیان لەنێوبەرن، بەڵکوو، پەلاماری کەسەکانیشیان دەدەن و بە هەموو شێوەیەکیش، سووکایەتییان پێ دەکەن. هەر وەک داگیرکەرانی « توورک، فارس و عەرەب »، لە « کوردستان »دا، بە کوردیان کردووە!

4. جەنگی نێوان دوو دەوڵەت، یا، جەنگی نێوان چەن دەوڵەتێ لە نێوچەیەکی دیاریکراودا، یا، جەنگێکی سەرتاسەریی جیهانیی، گەلێ کاری ناڕەوا، بێ ڕەوشتانە و بێ ویژدانانەی تێدا ڕوودەدا، تا کۆمەڵگەی مرۆش مابێ، شوێنەوارە دەروونییەکانی، کەلێن و قووژبنە مەراڵییەکانی پڕ نابنەوە، زامەکانی سارێژ نابنەوە، دەرد و ئازارەکانی بیر ناچنەوە! هەر وەک لە چەندین جەنگی نێوان « عێراق ـ ئێران، عێراق ـ کوێت، سربستان ـ بۆسنە، سربستان ـ کۆسۆڤۆ، ڕوسیا ـ چیچینستان ... »، هەر دوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیی، چەندین کرداری دڕندانە و کێویلانە ڕوویانداوە، پێنووس لە ئاستیاندا، شەرمەزاردەبێ، گەر هەموویان باسکا!

خۆ گەر، باسی ڕژێمە داگیرکەرەکانی « کوردستان » بە گشتیی و ڕژێمی داگیرکەری « بەعس » بە تایبەتیی بکەین، ئەوا دەتوانین، چەندین نموونەی زیندوو و وێنەی ڕاستەقینەی کردارەکانی، ئەو ڕژێمە دڕندە کێویلانە بێنینەوە، کە هەرگیز لە یادناچن.

ئاخر، ڕژێمی « بەعس »، هەر بەوەوە نەدەوەستا، نەیارە کورد و عەرەبەکانی خۆی پاکتاوکا، بەڵکوو، بە خراپترین شێوەش پەلاماریدەدان، هەرچی لە فەرهەنگی ڕەوشت و ویژدانیشدا جێی نابێتەوە، ئەوەی پێ دەکردن. ئەو ڕژێمە گۆڕپەگۆڕکراوە، تیپی پیاوکوژ و بێ ڕەوشتیی تایبەتیی خۆی هەبوو، تەنیا بۆ ئازاردان، دەسدرێژییکردنە سەر ئابڕووی ژنان و پیاوان، لە گرتووخانە نهێنیی و تاریکەکانیدا، سواری هەزاران ژن و پیاو دەبوون. جگە لەوەی، حەزیان لە هەر کچ و ژنێ بکردایە، بە هی خۆیانیان دەزانێ و بە ئاشکرا، پەلاماریاندەدان، کاری خراپیان لەگەڵ دەکردن و داگیریاندەکردن، بە تایبەتیی، سەرۆکی فرماندە، کوڕ و پیاوەکانی دەوروبەری، ئەندامانی سەرکردایەتیی و پارێزگەکان، تەنانەت، سیخوڕێکی ئاساییش، هیچ جۆرە سانسۆڕێکیان لە سەر نەبوو. هەر کوردێ، کەمێ ڕەوشت و ویژدانی هەبێ،

هەرگیز، ئەو ڕۆژەڕەشانەی لە یادناچێ، هەرگیز، کار و کردەوە چەپەڵەکانی سەربازە پۆستاڵڕەش، سیخوورە خوێڕیی و لێپرسراوە خوێنڕێژەکانی لە بیر ناچێتەوە. ئاخر، لە گرتووخانەکانی « ئەمن » و « ئیستخبارات »ی شارەکاندا، تا توانیویانە، لاقەی چەندین منداڵ و کیژی کوردیان کردووە، لە هۆردووگا زۆرەملییەکاندا، لە بەر چاوی کەسەکانیان، هەر ڕۆژەی، پەلاماری ژن و کیژێکی کوردیان داوە، بە تایبەتیی، لە هۆردووگای « قوشتەپە »، شەو نەبووە، پەلاماری ژن و کیژێکی ئابڕوومەندی هۆزی « بارزانیی » نەدەن و ئابڕووی کورد نەتکێنن!

جا ئاخۆ دەبێ، ئەو « 182 » هەزار کوردەی ئەنفالکران، پێش ئەوەی لەنێویان بردبن، چەن کیژ و ژنیان لێ گلدابنەوە، دەسیان بۆ ئابڕوویان بردبێ و چەندیشیان، بە سەر بار و گازینۆکانی وولاتانی عەرەبدا، دابەشکردبێ و فرۆشتبیانن، تا، ئابڕووی نەتەوەی کوردی پێ بەرن!

ئاخر، سەرۆکی فرماندە « سەددام »، کە خۆی بە کوڕەزای « عەلی کوڕی ئەبو تالیب » دەزانی، ئایینی ئیسلامی، وەک نێوجامەیەک بەکاردەهێنا، هەر بەوەشەوە نەدەوەستا، پەلاماری گەلێکی بێ دەرەتانی بێ پشتوپەنای وەک کورد بدا، بەڵکوو، پەلاماری دوژمنە دەسەڵاتدارە بەهێزەکانی خۆشی دەدا و سووکایەتیی پێ دەکردن. تەنانەت، ئابڕووی میوانەکانیشی، لە قووڕولیتاوی بێ ڕەوشتیی وەردەدا. بۆنموونە: ئەوەی ڕۆژنامەنووس « سەمیر عوبێد » نووسیوێتی و دەیگێڕێتەوە، یەکێ لەو کردارە نامرۆیانەی سەرۆکی نەتەوەیی عەرەب « سەددام » بووە! جا ئێستە، با بزانین، « سەددام » چی کردووە و ئەویش، چیمان بۆ دەگێڕێتەوە؟!!

لە سەرەتای ساڵەکانی نەوەدی سەدەی پێشوودا، کۆنگرەی لووتکەی عەرەب، لە « بەغدا » گیرا. لە دەمەدەمی تەواوبوونی کۆنگرەکەدا بوو، ناکۆکیی و دەمەتەقێیەکی زۆر، لە نێوان « سەددام » و هێندێ لە سەرکردەکانی دەوڵەتە عەرەبییەکاندا دروستبوو. چونکە، هێندێ لەو سەرکردانە، دژی دید و بۆچوونەکانی « سەددام » بوون و پشتگیریی دەوڵەی « کوێت »یان دەکرد. یەکێ لەو دەوڵەتە عەرەبییانە، دژی بۆچوونەکانی « سەددام » بوو، کە سوپای « عێراق »، پەلاماری دەوڵەتی « کوێت » بدا و داگیریکا.

لەبەرئەوە، ئەو دەوڵەتە لەگەڵ « کوێت »دا ڕێکبوو، لە هەمان کاتیشدا، وەک سەرچاوەیەکی هەڕەشەکردن لە « سەددام » و ئامانجە شەڕانگێزانەکانی وابوو، وەک شانەیەکی نێو دەزگەی « زانکۆی دەوڵەتە عەرەبیی »یەکانیش، دژی بۆچوونەکانی « سەددام » بوو و توورەیکردبوو.

دوای ئەوەی، جـەنگی نێوان « عـێـراق ـ ئێـران » تەواوبوو، هێندێ دوڵەتی دیکەی کـەنداو، ژێربەژێر، پشـتـی « کـوێت »یان دەگـرت، یەکێ لەو گـاڵتـە پێکردنـانە، نرخـی نەوت بـوو، بەوەی، داوای ئەو قــەرزانەیان لە « عـێـراق » دەکردەوە، کە لە جەنگی یەکەمی کەنداودا، « عێراق » لێی وەرگرتبوون. بەڵام، « سـەددام » ڕەتیکردەوە، « 10 » ملیـار دۆلارەکـەی « کوێت » و ئـەو دەوڵەتە بداتەوە. چونکە « سـەددام » دەیگوت: لەشکری « عـێـراق » توانیـویێتی، دژی سـوپای داگـیـرکـەری « ئێـران » بوەسـتـێ و لەبری هەمـوو نەتەوەی عـەرەب بجـەنگێ. ئەگـینا، نەک هەر ئەو دوو دەوڵەتە، بەڵکوو، هەمـوو دەوڵەتـەکـانی دیکەی « کەنداو »یشی ڕادەدا. لەبەرئەوە دەبێ، سەرانە بدەن.
جگە لەوەی، « بەعس » لەو باوەڕەدا بوو، « دەزگەی ڕاگەیاندنی عەرەبیی »ش، بە شێوەیەکی بەردەوام ڕایدەگەیاند، شەو و ڕۆژیش دووبارەیدەکردەوە، گوایە ئەوان، « پاسـەوانی دەروازەی ڕۆژهەڵاتی نیـشـتـمـانی عـەرەب » بوون، لە لێشاوی دەسدرێژیی « خومێنیی » پاراستوونی!
لەبەرئەوە، هەڵوێسـتـەکـان جـیـاوازبوون، بە شـێـوەیە، ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، گـوتارەکـان توندوتیـژتردەبوون. پێوەندییـەکان دەپچڕان. بۆیە، عـەرەبەکان بڕیاریاندا، لە سەرەتای ساڵانی نەوەدەکانی سـەدەی پێشوودا، کۆنگرەی « لووتکەی عـەرەب » لە شـاری « بەغدا » بگرن. لە ئەنجـامدا، کـۆنگرە چەن کۆمیتەیەکی ئاشتبوونەوە و لە یەکدی گەیشتنی درووستکرد.
« سەددام »، ئەم هەلەی لەدەس خۆی نەدا، سەرۆکی ئەو دەوڵەتە عەرەبییەی، بۆ مـاوەی دوو ڕۆژ، بۆ « باکـووری عێراق » داوەتکرد، تا لە لایەکەوە، پێکەوە قسە و دانوسـتـان بکەن. لە لایەکی دیکەشەوە، دەرد و خەمی ڕامیاریی خۆیان لەبیـرچێـتـەوە. ئەو سـەرکـردە بەڕێزەش قـایلبـوو، داوەتەکـەی « سـەددام » قەبووڵکا. ئیدی، ئەوەی ڕوویدا، ڕوویدا!
بەڵێ، سـەرۆکی مـیـوانیـان، لە سـەر جێـی نووسـتنەکـەی خـۆی بەسـتـبـۆوە، پاسـەوانە تایبـەتیـی و بێ ڕەوشـتـەکانی « سـەددام »یش، یەکـەیەکـە، سـواری بووبوون. « سـەددام » خۆشی، لە ژوورەکەی دراوسـێی دانیشـتـبوو، چرووتی کێشابوو، بە تێلێفیزیۆن تەمـاشای ئەو شـانۆکەرییە پڕ لە بێ ڕەوشتییەی کردبوو و بە هەموو دەنگە ناقۆلاکەی خۆشیەوە، قاقای لێ دابوو!
ئەم کارە چەپەڵەشیان، بە ڤیدیۆ تۆمارکردبوو، سەرۆکی میوانیش، لە تاو ئەو کـارە نەیدەزانـێ، چی بکا و چی بڵـێ؟!! هـەر هێندەی پێکرابوو، بڵێ: « یەبە شـیسـالفە ؟؟؟» پاشـان، ڤیلمـەکەیان بۆ لێدابوو، هەڕەشـەیان لێ کردووە، گەر واز لە کەللەڕەقیی خۆی نەهێنێ و لەو هەڵوێستانەی خۆی پەشیمان نەبێتەوە،

هەر لە سەر پشتگیرییکردنی « کوێت » بەردەوامبێ، ئەوا ئەو کاسێتە، بە سەر هەموو میر، شا و سەرۆکەکانی عەرەبدا دابەشدەکەن! ئیدی، سەرۆکی لێقەوماو، دەمی وەک تەڵەی تەقیوی لێهاتبوو، بە هەر دوو دەس، بۆی واژوو کردبوون، تا، هیچ نەڵێ و قرووقەپی لێ بکا! بەڵێ، « سەددام » بەو کارەی توانی، بەرنامەی رامیاریی ئەو دەوڵەتە، لە « 80٪ » بگۆڕێ، لە هەڕەشە و دوژمنایەتییکردنەوە، بۆ بێ دەنگیی و دۆستایەتییکردن هەڵیگێڕێتەوە. ئەوەش بەوەی، هەڕەشەی بڵاوکردنەوەی کاسێتەکەیان لێ دەکرد!
تەنانەت « سەددام » بڕیاریدابوو، میری « ........ ش بەو دەردەبەرێ، کاتێ لە « باکووری عێراق »، سەری لێ دابوو، ویستبووی، لە نێوان « عێراق » و « کوێت »دا ناوبژیبکا. بەڵام، کەسە نزیکەکانی « سەددام »، ئامۆژگارییان کردبوو، واز لەو بیرە بێنێ. لەبەرئەوەی ئەو پیاوە، لە لایەکەوە، هیچ گوناهێکی نییە. لە لایەکی دیکەشەوە، کێشەیەکی گەورە دروستدەکا، بە دوژمنایەتیی، تۆڵەسەندنەوەی تاکەکەسیی و خێڵەکیی کۆتاییدێ. چونکە، دەوڵەتەکەی ئەو میرە گەورەیە، پێوەندیی نێو دەوڵەتیی باشبووە. جگە لەوەی، دەوڵەتێ بوو، سنووری بە سنووری « عێراق »ەوە بوو. لەبەرئەوە، لەگەڵ دەوڵەتی سەرۆکی لێقەوماودا جیاوازیی هەبوو! بۆیە، میرەکە لە دەسدرێژییکردنە سەر ئابروو و وێنەگرتن بە کامێرای ڤیدیۆ قووتارییبوو. بەڵام، دوایی « سەددام » پەشیمانبووبۆوە، کاتێ، دەوڵەتەکەی ئەو میرە، ساڵی « 1991 »، شانبەشانی هێزەکانی « ئەمێریکا »، دژی « عێراق » جەنگابوو!
باشە، ئێستە ئەم پیاوە ناوبنێن چی؟!! تۆ بڵێیی، لە هەموو مێژووی مرۆڤایەتییدا، درندەیەکی نەخۆشی بێ ڕەوشتی وای تێدا هەڵکەوتبێ؟!! ئاخر ئێستە، هەرچەندە بیری لێ دەکەمەوە، کورد خۆی، بەو هەموو گرفتە گەورانەی هەیبووە، تووشی کێ بووبوو؟!! لەگەڵ کێدا، زۆرانبازیی مەرگی کردووە؟!!

* * *

---

**تێبینیی:**
زۆربەی خەڵک، لەو باوەڕەدان، ئەو سەرکردە لێقەوماوە، سەرۆکی کۆماری « یەمەن ـ عەلی عەبدوڵڵا سالح » و میرەکەش، شالیاری دەرەوەی « سعوودیە ـ سعوود ئەلفەیسەڵ » بوون!

**سەرچاوە:**
سمیر عبید، صدام حسین .. اغتصب رئیسا عربیا!!!!، خاص بعرب تایمز، 3 صفحات، www.arabtimes.com .2004. 08. 29

# شۆڕش و دەسەڵات

پێش هەموو شتێ دەبێ، ئەوە باش بزانین، شۆڕش چەن جۆرێکی هەیە، وەک شۆڕشی « نەتەوەیی، ڕامیاریی، کۆمەڵایەتیی، ئایینیی، کەلتووریی، هونەریی، وێژەیی، تەکنۆلۆژیی و زانستیی ». بەلام، گرنگترین جۆری شۆڕش، بە شۆڕشی کۆمەڵایەتیی دادەنرێ. چونکە، پێوەندیی بە گۆڕینی سروشت و خەسڵەتەکانی مرۆڤەوە هەیە، شۆڕشگێڕان هەوڵدەدەن، سەرلەبەری ژیانی کۆمەڵایەتیی ڕۆڵەکانی گەل بگۆڕن، گەورەترین گۆڕانکاریی چۆنایەتیی، لە کۆمەڵگەیەکی فرەچیندا ئەنجامبدەن، زۆرداریی کۆمەڵایەتیی و چینایەتیی لەنێوبەرن. ئامانجی ئەو شۆڕشەش، بە پلەی یەکەم ئەوەیە، دەس بە سەر دەسەڵاتی ڕامیارییدا بگرێ، تا، بەرنامەکانی خۆی جێبەجێکا. لەبەرئەوە، کارێکی زۆر و سەختی دەوێ.

نموونەی شۆڕشی کۆمەڵایەتیی، لە مێژووی کۆمەڵگەی مرۆدا زۆرن. بەلام، ڕەنگە هەرە گرنگەکانیان، لە چەن شۆڕشێکی گرنگ تێپەڕ نەکا. بۆ نموونە: چەن شۆڕشێکی کۆمەڵایەتیی گرنگ، لە چەرخی شــــازدەدا، لە خۆراوای « ئەورووپا » ڕوویداوە، وەک جەنگی نێوان جووتیاران دژی دەرەبەگەکان، ساڵی « 1525 » لە « ئەلمانیا » بەرپابوو، نێوەرۆکێکی چینایەتیی هەبوو. بەلام، سەرکەوتوو نەبوو، چونکە نەیانتوانی، دەس بە سەر دەسەڵاتدا بگرن.

هەروەها، لە سەدەی حەڤدەشدا، شۆڕشی جووتیارە چەوســــاوەکانی گەلی « ئینگلیز »، دژی دەرەبەگە زۆردارەکان بەرپابوو، هەرچەندە، لە ژێر پەردەی ئایینیدا بوو، بەلام، ئەنجامێکی باشی هەبوو، گورز و تەکانێکی زۆریشی، بە سیستێمی سەرمایەداریی دا و کەشەی پێ کرد.

وا بزانم، پێویست بەوە ناکا، پێناسەی هەر یەکێ، لە شۆڕش و دەسەڵات بکەم. چونکە، ئەو جۆرە زاراوە ڕامیارییانە، گەر بە شێوەیەکی زانستانەش نەبێ، زۆربەی زۆری خەڵک بیستوویانە و دەیزانن! جگە لەوەی، ڕۆژانە، بە دەیان جار، لە کەناڵەکانی تێلێفیزیۆن و وێژگەی ڕادیۆکانەوە، گوێیان لە هەر دوو زاراوەی شـۆڕش و دەســەڵات دەبێ، بە دەیان سـەرکـردە، ئەندامـانی

سەرکردایەتیی پارت و دەوڵەتە جیاجیاکانی جیهانیش دەبینن، باسی بەسەرهاتەکانی شۆڕش و گرفتەکانی دەسەڵات دەکەن. یا، گوێیان لە گوتاری سەرکردەکان دەبێ و بە چاوی خۆشیان کردەوەکانیان دەبینن! لەگەڵ ئەوەشدا، سەرکردە و ئەندامانی سەرکردایەتیی ئەو پارتانە، کردار و ڕەفتاریان هەرچی چۆنێبێ، ڕەنگە، لای زۆربەی خەڵکی نەخوێندەوار و تێنەگەیشتوو، هەر وەک یەک وابێ و هیچ لە باسەکە نەگۆڕێ!

بەلام، لێرەدا هەر هێندە دەڵێم: گەر واتای ڕاستەقینەی زاراوەی شۆڕش ئەوەبێ، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، گۆڕانێکی بنەڕەتیی ڕوویدا، با بزانین، ئەو گۆڕانە، لە کۆمەڵگە جیاوازەکانی مرۆدا، چۆن کراوە و چۆن بووە؟!! ئایا، ڕەوشەکە بەرەو باشتر چووە، یا خراپتربووە؟!!

هەرچەندە، سەرکردە و شۆڕشگێڕەکان، ڕەوشتی خراپیشیان هەبێ و کاری دزێویش بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا، ئامانجە ستراتیژییەکانی هەموو جۆرە شۆڕشێکی « نەتەوەیی، کۆمەلایەتیی، کەلتووریی ... » گەلێ پیرۆزن. بەلام، ئەوەی بۆ کۆمەلانی خەڵک ڕوونبۆتەوە، ئەوەیە: سەرکردایەتیی پارت، شۆڕش و گەلێکی دیارییکراو، لە کاتی شۆڕش و دوای شۆڕش، جیاوازییەکی زۆریان هەیە. چونکە، سەرکردەکان لە کاتی شۆڕشدا، خۆیان زۆر ماندوو دەکەن، هەمیشە هەوڵدەدەن، خۆیان بە نیشتمانپەروەر و خاوێن پیشاندەن، یا، وا لە کۆمەلانی خەڵک بگەیەنن، کە زۆر دڵسۆزی کێشەی ڕەوای گەلەکەی خۆیانن، تا، باوەڕیان پێ بکەن و دوایانکەون!

بەلام، دوای ئەوەی، دەسەلاتی ڕامیاریی وەردەگرن و دەس بە سەر دەزگەکانی دەوڵەتدا دەگرن، ئەو کاتە، زۆر بە لایانەوە گرنگ نییە، گەر دڵی جەماوەر ڕاگرن و گەواهیی پیاوچاکیی، نیشتمانپەروەریی، دڵسۆزیی و خاوێنییشیان بۆ نەدەن، بەڵکوو، هێندەی بیر لە پاشەڕۆژ و بەرژەوەندیی تایبەتیی تاکەکەسیی خۆیان دەکەنەوە، هێندە، بیر لە بەرژەوەندیی گشتیی گەلەکەیان ناکەنەوە. بۆیە، بە هەموو شێوەیە دەگۆڕێن، بە هەموو لایەکدا هەڵپەدەکەن، پتر خەریکی پارەکۆکردنەوە، دزیکردن، داوێنپیسیی و ڕابواردن دەبن، کۆمەڵێ خەڵکی خراپ و هەلپەرست، لە دەوری خۆیان کۆدەکەنەوە، وەک داشی دامە بەکاریاندێنن، ئامانجە سەرەکیی و پیرۆزەکانی شۆڕشیشیان بیردەچێتەوە.

وەنەبێ، ئەمەش تەنیا هەر، لە وولاتێکی دیارییکراوی ئەم جیهانەدا ڕووی دابێ، یا تەنیا هەر، لە سەرکردە و ئەندامانی سەرکردایەتیی پارت و شۆڕشێکی تایبەتیی دەرکەوتبێ. بەڵکوو، لە زۆربەی هەرە زۆری، ئەو

وولاتانەی ژێردەستبوون و بە قۆناغی شۆڕشی ڕزگاریخوازی نیشتمانییدا تێپەڕبوون، یا شۆڕشێکی کۆمەڵایەتییان بەرپاکردووە، یا، لە زۆربەی ئەو وولاتانەی دیمۆکراسیی تێدا نەبووە، سیستێمێکی دیکتاتۆریی فرمانڕەوایی گەلی کردووە، ڕوویداوە. سەرکردە و ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتەکان، لە کاتی شۆڕشدا، بە شێوەیە خۆیان نواندووە و لە کاتی دەسەڵاتیشدا، بە شێوەکی دیکە بوون. جا بیر و فەلسەفە، ڕێباز و ئایدۆلۆژیا، ڕێکخراو و پارتەکان، هەرچی چۆنێ بووبن، گرنگ نییە!
پێش ئەوەی، باز بە سەر بابەتەکەدا بدەم و چەن نموونەیە بێنمەوە، با ئەوەش بڵێم: کاتێ، نموونە لە سەر هەڵسوکەوتی سەرکردە، سەرکردایەتیی پارت و دەوڵەتەکانی جیهان دێنمەوە، وەنەبێ، تەنیا هەر مەبەستم ئەوەبێ، ئەو کەموکووڕیی و خراپەکارییانەی، لە سەردەمە جیاوازەکانی شۆڕش و دەسەڵاتدا ڕوودەدەن، بۆ خودی بیر و فەلسەفە جیاوازەکانی بگەڕێنمەوە. یا تەنیا هەر، ئەنجامێکی سروشتیی دەسەڵات بێ و مرۆکان خۆیان بگۆڕێن. بەڵکوو پێم وایە، جگە لەوەی لە نێو ڕیزی هەموو بیر و فەلسەفە جیاجیاکاندا، مرۆی باش و خراپ هەن، هێندێ جار، کەموکووڕیی لە دەقەکانی ئەو بیر و فەلسەفانەشدا هەیە. هێندێ جاری دیکەش، کادێر و سەرکردەکان خۆیان دەگۆڕێن و بەرەو خراپەکاریی هەنگاودەنێن! واتە: گۆڕانەکە بنچینەیەکی هەیە، گەر نەشیبێ، بۆی دادەتاشرێ، تا، لەگەڵ خەسڵەتی مرۆکاندا بگونجێنرێ. بەڵام، زۆربەی کات، هەڵەکە لە مرۆکانەوە دەسپێدەکا، کەمتر لە دەقەکانی ئەو بیر و فەلسەفانەدا تێبینیدەکرێ!
لێرەدا هەوڵدەدەم، چەن نموونەیەکی زیندوو، لە سەر ڕەوشت و خەسڵەتی سەرکردە و ئەندامانی سەرکردایەتیی، هێندێ لە جولانەوە و دەسەڵاتی گەلانی جیاواز بێنمەوە. بەڵام، لە نێو هەموو ئەو نموونانەدا، پتر بایەخ بە ئەزموونی سەرکردەی پارت و دەوڵەتە خاوەن فەلسەفە و ئایدۆلۆژیاکان دەدەم، تا بزانین، ئەو پیاوە کەورە و شۆڕشگێڕانە، لە سەردەمی تێکۆشانی ڕامیاریی و خەباتی چەکدارییدا، لە سەردەمی ڕۆژانی ناخۆشیی و پڕ لە مەترسییدا، چۆن هەڵسوکەوتیانکردووە؟!! لە کاتی خەباتی دیمۆکراسیی و وەرگرتنی دەسەڵاتیشدا چۆن بوون؟!! لەبەرئەوە، لە جیهانی کۆندا، نموونەی ئیمپراتۆریای ئیسلامیی، لە جیهانی سۆسیالیستدا، نموونەی « یەکێتی سۆڤێت » و لە وولاتانی جیهانی سێیەمیشدا، تەنیا دوو نموونەی کورت، لە سەر « میسر » و « عێراق » دێنمەوە. لە کۆتاییشدا، کورتە باسێ، لە سەر « باشووری کوردستان » پێشکەشدەکەم.

## 1 دەوڵەتی ئیسلامیی:

باوەڕ ناکەم، هیچ بیر و بزووتنەوەیەک لە جیهاندا، هێندەی بزووتنەوەی ئایینیی کۆنبێ. کەچیی، تەنانەت لەو بزووتنەوە ئایینییانەشدا، دوای ئەوەی، پەیامبەرەکانیان مردوون، جێنشینەکانیان، لە سەر ڕێوشوێنی ئەوان نەڕۆیشتوون. جا، گەر زۆر دوور نەڕۆم و هەر لە کۆنەوە، چەن نموونەیە، لە سەر ئایینە جیاجیاکان نەهێنمەوە، ئەوا، وا بزانم، ئایینی ئیسلام، وەک دوا ئایین، بە باشترین نموونە دادەنرێ، گەر، هێندەی بۆ ئەم گوتارە دەسبدا، کەڵکی لێ وەرگرم. لەبەرئەوە، لێرەدا تەنیا هەر، باسی ڕەوشت و خەسڵەتی، پیاوە ناودارەکانی ئایینی ئیسلام دەکەم. چونکە، وەک کورد فەرموویەتی: مشتێ نموونەی خەروارێکە!

ڕەنگە، زۆربەی زۆرمان، ئاگامان لە مێژووی سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام هەبێ. جا ئەز لێرەدا، هیچ کارێکم بە سەر ئەوەوە نییە، کێ باوەڕی بە ئایین و خواپەرستیی هەیە، یا، باوەڕی پێی نییە. چونکە، مەبەستی باسەکەم ئەوە نییە. بەڵکوو، تەنیا هەر نموونەیەکی بچکۆلانە، لە سەر شۆڕش و دەسەڵات دێنمەوە.

لە سەرەتای دەرکەوتنی ئایینی ئیسلامدا، نەک هەر پەیامبەرەکە، بەڵکوو، زۆربەی هەرە زۆری، موسوڵمانە خوێندەوار و نەخوێندەوارەکانیش، بە شێوەیەکی زۆر ڕێکوپێک خۆیان دەنواند، ڕەفتار و کرداریان چوونیەکبوو، هێندە لە پەروەردەکاری مەزن دەترسان، تەنانەت، هێندێ موسوڵمانی ساویلکە هەبوون، لەو باوەڕەدا بوون، گەر خوا ئاگای لە هەموو شتێ بێ و گوێی لە ترپەی پێی مێرووش بێ، ئەوا، کاتێ لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا جووتدەبن، ئەو دەیانبینێ!

لەبەرئەوە، شەرمیاندەکرد و خۆیان دادەپۆشی، نەبا خوا چاوی لێیان بێ! پاشان، پتر بیریان لە گرفتەکانی ژیان و ئەو باسانە کردەوە، لە کۆتاییدا، بەو ئەنجامە گەیشتن و گوتیان: گەر خوا ئاگای لە بچووکترین شت بێ، کەواتە، ئاگای لە کاری ژێر لێفەش هەیە، ئیدی، تە خۆداپۆشینی دەوێ و نە پێویستیش دەکا، شەرمبکەین.

بەڵێ، زۆربەی موسوڵمانەکان، بەو شێوەیە بیریان لە خواپەرستیی و دیسیپلینی ئایینەکەیان دەکردەوە. بەڵام، هەر هێندەی وردەوردە، ژمارەیان زۆربوو، دەسەڵاتیان پەیداکرد، ئیدی، گرفتی ڕاستەقینەی ڕەوشت و ویژدان، لە نێوانیاندا پەیدابوو. چونکە، جەنگ و وڵات داگیرکردن، کوشتن و برین، کاولکردن و تاڵانکردن، پارە و دەسەڵات، کیژ و ژنی جوان، سەمای نێوقەد

باریکان و مەیخواردنەوە، خۆشیی ژیان و ڕابواردنی نێو کۆشکەکان، ڕەوشت و خەسڵەتی، زۆربەی هەرە زۆریانی گۆڕی، « حەرام » و « حەلاڵ »یان تێکەڵاوکرد، بە دەیان پۆزشی نابەجێ و « حیلە شەرعیی »یان دەهێنایەوە، تا، کردەوە خراپەکانی خۆیانی پێ پینەکەن! لەبەرئەوە، زۆر بیریان لە دادپەروەریی و جێبەجێکردنی دەقە پیرۆزەکانی ئایینەکەیان نەدەکردەوە، بە شێوەیەکی پڕ لە سەیر و سەمەرەش گۆڕان. بۆیە، هێندێ لە شارەزایان و خوێندەوارە موسوڵمانەکان، لە سەر داواکاریی جێنشینەکانی دەوڵەتی ئیسلامیی، دەسیان بە لێکدانەوە و چارەسەر دۆزینەوە کرد، تا هێندێ جار، هێندێ ڕەوشتی خراپ، بە چاک دابنێن و هێندە بە قورسیی، کارەکە بەڕێوەنەچێ، نەک کۆمەلانی خەڵکی موسوڵمان بەرگەی نەگرن.
خۆ کاتێ، پەیامبەری ئیسلامیش، مالاوایی لە ژیان کرد و مرد، ئیدی، بارەکە بە جارێ گۆڕا. ئاخر موسوڵمانەکان، لە سەردەمی ئەودا، بەو شێوەیە ڕەفتاریاندەکرد، دەبێ، دوای ئەو چییان کردبێ؟!!
ئەوەمان لە بیر نەچێ، پەیامبەر فەرموویەتی: دوای من، پەیامبەری دیکە نییە! «1» کەچیی، ئینجا لە پێناوی پارە و دەسەلاتدا، هێندێ موسوڵمانی زیرەک و خوێندەوار، لە جێنشینەکەی هەڵگەڕانەوە، لە ئایینەکەی وەرگەڕان و بانگەشەی پەیامبەرێتیشیان دەکرد! ئاخر، هێندەی لە پێناوی لەنێوبردن و پاکتاوکردنی ئەو پەیامبەرە درۆزنانەدا، خوێن ڕژێنرا، هێندە لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی ئایینەکە خۆیدا، خوێن نەڕژا!
کاتێ پەیامبەر مرد، دوای خۆی، هیچ کەسێکی دەسنیشان نەکرد، دەسەلات بە دەسەوە بگرێ و فەرمانڕەوایی دەوڵەتی ئیسلامیی بکا! بەڵکوو، موسوڵمانەکان لە نێو خۆیاندا ڕێککەوتن، چوار جێنشینەکە هەڵبژێرن و باوەڕیان پێ بێنن. کەچیی، سەرەڕای ئەوەش، لە دوای « ئەبو بەکری سدیق »، ناکۆکیی، دووبەرەکیی و ململانێ ڕاستەقینە داپۆشراوەکەی نێوانیان، لە سەر دەسەلات دەرکەوت. بۆیە، بە کوشتنی هەر سێ جێنشین : « عومەری کوڕی خەتاب، عوسمانی کوڕی عەفان و عەلی کوڕی ئەبو تالیب » کۆتاییهات. ئەو ناکۆکیی و ململانێیەش، زەریایە خوێن و فرمێسکی ویست!
کاتێ دەوڵەتی « ئەمەویی »ش دامەزرا، هەر لە سەرەتاوە، زۆربەی شتەکانیان گۆڕی و لەگەڵ بەرژەوەندیی بنەماڵەکەی خۆیاندا گونجاندیان. تەنانەت، دەسەلاتی فەرمانڕەواییشیان گۆڕی و سیستێمی فەرمانڕەوایی پشتاوپشتیان دانا، بۆ ئەوەی، هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەی خۆیان، تا ماون، لە تەڕ بخۆن و لە ووشک لێی بخەون!

لەبەرئەوە، لە هەموو مێژووی ئیسلامدا، جگە لە پەیامبەر، گەر بە دوای پیاوێکی خواناسی ڕاستەقینەدا بگەڕێین، ئەوا بە دەگمەن، چەن پیاوێکی حواپەرستی ڕاستەقینە، دادپەروەر، دەسپاک، بێوەی، دڵسۆز، دڵ و دەروون خاوێنی وەک جێنشین « عومەری کوڕی عەبدولعەزیز »مان دەسدەکەوێ!

بە کورتیی: موسوڵمانەکان، هەر ئەو گاورانەی دوێنێ بوون، کە بتیان لە بەرد و دار دادەتاشی و دەیانپەرست. پاشان، پەیامبەر هاتووە و ڕێی ڕاستی پیشانداون، ئەوانیش، موسوڵمان بوون و خوای تاکوتەنیایان پەرستووە. کەچیی، لەگەڵ ئەوەشدا، هێندێ لە ڕەوشتە کۆنەکانی سەردەمی نەزانینی خۆیان، هەر لە بیر نەچووبووە و وازیان لێ نەهێنابوو.

کاتێ پەیامبەریش کۆچیدواییکردووە، لە سەر پارە و دەسەڵات، ناکۆکیی و دووبەرەکییەکی گەورە، لە نێوان سەرکردە موسوڵمانە ناودار و دەسڕۆشتووەکاندا درووستبووە. پاشان، ئەو ناکۆکیی و ململانێیە، لە ئیمپراتۆریاکانی « ئەمەویی، عەبباسیی و عوسمانیی »شدا، جێنشینەکانی ئیسلام، لە لووتکەیان تێپەڕاندووە. جا، گەر چاوێ بە مێژووی دەسەڵاتی هەر چوار جێنشینەکە بە تایبەتیی، جێنشینەکانی دیکەی هەر سێ ئیمپراتۆریا ئیسلامییەکە بە گشتیی بخشێنین، ئەوا، زۆر بە ئاشکرا، بۆمان ڕوون دەبێتەوە، ئەو جێنشینانە، تا چ ئەندازەیەک، موسوڵمانی ڕاستەقینەبوون؟!!

لە سەر پارە و دەسەڵات، چییان بە یەکدی کردووە و چیشیان، بە سەر نەتەوەی موسوڵمان هێناوە؟!! تەنانەت، کار بەوە گەیشتووە، باوک لەگەڵ کوڕ، برا لەگەڵ برا، مام لەگەڵ برازا، ئامۆزا و پورزاش، لەگەڵ یەکدیدا نەگونجاون. لەبەرئەوە، موسوڵمانەکانیش، ئەو موسوڵمانانە نەبوون، کە پەیامبەر لە فەرموودەکانیدا، باسی نیشانەکانی کردوون و لە قورئانیشدا، خەسڵەتەکانیان دەسنیشانکراوە. چونکە، ئایینەکەیان پشتگوێخستووە، لە سەر پارە و دەسەڵات، یەکدیان سەربڕیوە. هەموو ئامانجێکیان، تەنیا هەر ئەوەبووە، دەس بە سەر دەسەڵات و فرمانڕەواییدا بگرن، پارە، زێڕ و زیوێکی زۆر کۆکەنەوە، چەن ژنێکی جوانیش بێنن. چونکە، ئایینەکە خۆی، ڕێی ئەوەی پێ داون، لەبری ژنێ، چەن ژنێ بێنن، هەر وەک پەیامبەرەکە خۆشی، بیست « 20 » ژنی هێناوە! جگە لە ژنهێنانی فەرمییش، چەندین کەنیزەکی جوان و ناسکیان، لە وڵاتانی جیهانەوە، بە دیاریی بۆ هاتووە، یا، وەک دەسکەوتێکی جەنگ، پێیان براوە!

ئەوڕۆ، پتر لە « 1425 » ساڵ دەبێ، پرشنگی خۆری ئەو ئایینە دەرکەوتووە و بە هەموو کونوقوژبنێکی سەر زەویشدا بڵاوبۆتەوە. ڕاستە، ئایینەکە هەر

ماوه و تا ئێستە لەنێو نەچووە. بەڵام، زۆر دەسکارییکراوە و گۆڕاوە، ئەو گۆڕانە بە شێوەیەکە، لە سەداسەد، ئەو ئایینە نییە، کە لە سەردەمی پەیامبەردا هەبووە!
هەروەها، بە هۆی هێندێ ڕەوشت و خەسڵەتی خراپی موسوڵمانانیشەوە، زۆر بە ئاشکرا دەبینین، نەتەوەی موسوڵمان چی بەسەرهاتووە؟ باری موسوڵمانان چۆن گۆڕاوە؟ لە نێو خۆدا، چەن ناکۆک و ناتەبان؟ بەڵێ، بارێکیان هەیە، دوژمنەکانیان ئیرەییان پێ نابەن! چونکە، هەر دەستە و گرووپێ هەڵدەستێ، بە ناوی ئیسلامەوە کاردەکا و لە ئاوازێکی جیاواز دەخوێنێ. چەندین ئایینزا و ڕێبازی جیاوازی ئایینییش سەریهەڵداوە، لەبری ئەوەی، کاری ئایینەکە ئاسانتر و باشتربکەن، هێندەی دیکە، گرفتیان لە نێوان موسوڵماناندا دروستکردووە، هێندەی دیکە، دەلاقەی ئەو ناکۆکیی و دووبەرەکییەی لە نێوانیاندا هەبوو، فراوانتربووە! چونکە، ئایین و بەرژەوەندیی تایبەتیی، ئایین و کاری رامیاریی، بە دەسی ئانقەست تێکەڵاوکراون! نە ڕەوشتی بەرز و نە ویژدانی زیندووش، لە نێو بیر و هۆش، لە نێو دڵ و دەروونی ڕۆڵەکانی نەتەوەی موسوڵماندا تەماون. ئاخر، گەر ڕەوشت و ویژدان، لە نێو ڕیزی ڕۆڵەکانی نەتەوەیەکی دیارییکراودا باریکرد و ڕۆی، گرفتێکی گەلێ گەورەی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیی سەرهەڵدەدا. جا گەر ئەو دوو خەسڵەتە گرنگە هەبوونایە، ئیدی کۆمەلانی خەڵک، چ پێویستیان بەوە هەبوو، کۆنتراکت لە نێوانیاندا هەبێ؟!!

## 2. فڕەنسە:

لە کۆندا، ئیمپراتۆریای « فڕەنسە »، خاوەنی سیستێمێکی پاشایی و تساریی بوو. دەرەبەگە گەورەکان، دەسەڵاتێکی زۆر گەورەیان هەبوو. زۆربەی زۆری، ڕۆڵەکانی گەلیان دەچەوساندەوە و گرتووخانە تاریکەکانی « باستیل » پڕکرابوون، یاسای ملبەڕاندن پێڕەودەکرا و بە هەزاران کەسیان، بەو شێوەیە کوشتووە. هەڵبەتە، لە ڕەوشێکی ڕامیاریی وا ئاڵۆز و خراپدا، لە بارێکی کۆمەڵایەتیی وا سەخت و گراندا، هەموو مەرجەکانی ڕاپەڕین و شۆڕشی کۆمەلانی خەڵک پێدەگەن. بۆیە، مانگی « مای 1789 »، شۆڕش دەسپێکرد و لە « نۆڤەمبەری 1799 »دا تەواوبوو. واتە: دە ساڵی ڕێکی خایاند.
شۆڕشی گەورەی « فڕەنسە »، وەک شۆڕشێکی کلاسیکیی، دژی زۆرداریی و چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتیی و چینایەتیی بوو. لە پێناوی دادپەروەریی و یەکسانیی ڕاستەقینەدا هەڵگیرسا. سەرکردەکانی شۆڕش توانییان،

سیستێمی پاشایەتیی و دەرەبەگیی، لە ڕەگوڕیشەوە هەڵکێشن و لەنێوببەرن، سیستێمێکی نوێی کۆماریی دامەزرێنن و بیچەسپێنن. لە نێو شۆڕشگێڕەکاندا، « یەعقووبیی »یەکان، نوێنەری چینی بۆرژوا بوون. بەڵام، لە هەموو توێژ و چینەکانی دیکە شۆڕشگێڕتربوون، بە تایبەتیی، لە ماوەی پێنج ساڵدا « 1789 - 1794 »، کارێکی زۆریان، لە پێوەندیی نێوان چینەکانی کۆمەڵ کرد، پرۆسەی ئازادیی و باوەڕی دیمۆکراسییش، بە شێوەیەکی باش، لە « فەرەنسە » گەشەیکرد.

هەرچەندە، شۆڕشەکە ئەو ئامانجە پیرۆزانەی هەبوو، ڕۆڵەکانی گەلی، بە خەونی سەوز و سوورەوە خەریککردبوو، بەڵام، هەموو ئەو خەونانە بەدی نەهاتن، بەڵکوو، شۆڕشگێڕەکان خۆشیان، هێندێ کاری خراپیان ئەنجامدا، لە سەردەمی پاشاکان خراپتربوون! ئاخر، لەو ماوەیەدا، شۆڕشگێڕەکان، کەمیان کاری خراپ نەکرد! کەمیان خەڵک، لە قوژبنی زیندانەکاندا توند نەکرد! کەمیان خەڵک نەکوشت! بە کورتیی: تا بار و دۆخەکە، بە تەواویی هێمنبۆوە، بنچینە سەرەکییەکانی سیستێمی کۆماریی، بە یەکجاریی چەسپی، خوێنێکی زۆری ویست!

هەرچەندە، شۆڕشگێڕەکان، ڕەخنەیان لە ڕەوشت و خەسڵەتی خراپی پاشا و کاربەدەسانی دەوڵەت دەگرت، کەچیی خۆشیان، لە هێندێ بواردا، هەمان هەڵەی ئەوانیان دووپارەکردەوە، بۆ ئامانجە پیرۆزەکانی شۆڕش، زۆر بە ئەمەک نەبوون! بە تایبەتیی، سەرکردەیەکی ڕادیکاڵی ناسراوی وەک: « Robespierre Maximilien 1758 - 1794 »، بە ناوی شۆڕشەوە، دژی کۆمەڵانی خەڵک، گەلێ کاری خراپی کرد. ئەوەبوو، لە ئەنجامدا گیرا و لە مانگی « یولی 1794 »دا لەسێدارەدرا!

### 3. ڕووسیا و یەکێتی سۆڤێت:

ئیمپراتۆریای « ڕووسیا »، لە سەردەمی تسارەکاندا، بە پلەی یەکەم، کۆمەڵگەیەکی دەرەبەگیی و بە پلەی دووەم، کۆمەڵگەیەکی پیشەسازیی بوو. بنەماڵەی « ڕۆمانۆڤ »، پتر لە سێ سەدە « 1613 - 1917 »، فەرمانڕەوایی « ڕووسیا »یان کرد. بەپێی ئەو مێژووەی، کۆمۆنیستەکان نووسیویانەتەوە و پاشان، ساڵی « 1990 » تووڕدرا! تسارەکان، نیشتمانپەروەر نەبوون، بە هەموو شێوەیە، کۆمەڵانی خەڵکیان چەوساندۆتەوە، سەرانسەری نیشتمانەکەیان، بە جەنگ و ئاژاوەوە خەریککردووە. بێ کاریی، هەژاریی، برسێتیی، نەخۆشیی، نەزانین، دزیی، جەردەیی، بەرتیل، بێ ڕەوشتیی و

خراپەکاریی، تەنگی بە زۆربەی هەرە زۆری، دانیشتووانی ئیمپراتۆریاکە هەڵچنیوە! لەبەرئەوە، سەرکردایەتیی پارتی کۆمۆنیست « بەلشەفیک » بڕیاریاندا، شۆڕشێکی ڕامیاریی و کۆمەلایەتیی بەرپاکەن، تسار و دەسوپێوەندەکانی لەنێوبەرن.
ئەوەبوو، لە مانگی « ئەکتۆبەری **1917** »دا، شۆڕشی کرێکار، جووتیار و سەربازەکان، بە سەرکردایەتیی « لینین » بەرپابوو، لە ماوەیەکی کورتدا، هەموو نێوچەکانی ئیمپراتۆریاکەی گرتەوە، جەنگ لە نێوان شۆڕشگێران و دوژمنەکانی شۆڕشدا دەسپێیکرد. پاشان کۆمۆنیستەکان، بە ناوی گەل، دژی کۆنترا و پاراستنی دەسکەوتەکانی شۆڕشەوە، خەڵکێکی زۆریان کوشت. تەنانەت، کاتێ تەقەیان لە « لینین » کرد، لە تۆڵەی ئەوەدا، « **700** » کەسیان لە هۆردوگایەکدا گوللەبارانکرد. بە ناوی سۆسیالیزم و یەکسانیی لە نێوان ڕۆڵەکانی گەلدا، دەسیان بە سەر هەموو ماڵ و موڵکی دەرەبەگ، سەرمایەدار و دەوڵەمەندەکانی وولاتەکەدا گرت. کاریان لە دەسڕەنگینەکان سەندەوە، بە کادێرە کۆمۆنیستە نەزان و کەللەڕەقەکانی خۆیانیان سپارد. دەسیان لە هەموو کارێکی ژیانی « ڕامیاریی، کۆمەلایەتیی، ئایینیی، پیشەسازیی، بازرگانیی، کشتوکاڵیی، زانستیی، کەلتووریی، هونەریی، وێژەیی ... » وەردا، وولاتەکەیان هێندەی دیکە، بەرەو دواوە برد. ئەو کەمە ئازادیی و دێمۆکراسییەی، لە سەردەمی تسارەکاندا هەبوو، بە یەکجاریی نەیانهێشت، تەنانەت، ڕەخنەگرتن و خۆپیشاندانیشیان، لە کۆمەلانی خەڵک قەدەغەکرد. چونکە، ئەو شتانەیان، بە ئازادیی و دیمۆکراسیی « بۆرژوا » دەزانی، لە جێی ئەوەش، دێمۆکراسیی « پرۆلیتاریا »یان دانا! واتە: بە هەموو شێوەیە، وزەیان لە کۆمەلانی خەڵک بڕی. ئینجا، هەر لە سەرەتاشەوە، دەسیان بە تیرۆرکردن، پاکتاوکردنی نەیار و دوژمنەکانی خۆیان کرد.
هەرچەندە، سەرکردەیەکی وەک « لینین »، ماوەی دەسەلاتی فرمانڕەوایی، تەنیا هەر حەوت ساڵ « **1917 - 1924** » بوو، بەلام، تیرۆری سوور، هەر لە سەردەمی ئەوەوە دەسپێیکرد. لەگەڵ ئەوەشدا، شاگردە دڵسۆزە بە ئەمەکەکەی « ستالین »، لە ماوەی دەسەلاتی خۆیدا « **1924 - 1953** »، چەندین میلیۆن مرۆڤی، لە گرووپە ئێتنیکە جیاوازەکانی « یەکێتی سۆڤێت » لەنێوبرد، بە هەموو شێوەیە دەیویست، کەمینە و گەلە بچووکەکان، لە بۆتەی نەتەوە گەورەکاندا بتوێنێتەوە.
بە کورتیی: ئەوەی لە سەردەمی کۆمۆنیستەکان بە گشتیی و سەردەمی « ستالین »دا بە تایبەتیی ڕوویدا، بە گوتارێکی سەرپێیی باس ناکرێ و

ناگێرڕێتەوە. بەڵام، کۆمەڵانی خەڵکی سەر بە گرووپە ئیتنیکە جیاجیاکان، هەزاران جار، ئاواتیان بە سەردەمی تسارەکان دەخواست و پەنجەی پەشیمانیی خۆیان دەگەست!
ڕاستە کۆمۆنیستەکان، ڕژێمی تساریان ڕوخاند و بۆ تاهەتایە، بە گۆڕستانی مێژوویان سپارد. هەروەها، چینی دەرەبەگ و بۆرژوایان لەنێوبرد، کۆمەڵگەیەکی جوتیاریی و کرێکارییشیان دامەزراند. بەڵام، کێ دەڵێ، خۆیان لەوان باشتربوون؟!! بە قسەی کێ، بنەماڵەی تسارەکان، هێندە خراپبوون، سەگ بێزی نەهاتووە، بۆنیان پێوە بکا؟!! جا گەر وا بووایە، وەک ئەوان نووسیویانە، هەڵبەتە دەبووایە، دوای حەفتا ساڵ، کۆمەڵانی خەڵک، بە پەرۆشەوە، بە دوای گۆڕی بە کۆمەڵی تسار خۆی و خێزانەکەیدا نەگەڕانایە، ئێسک و پرووسکەکانیان دەر نەهێنایەتەوە و کۆیان نەکردایەتەوە، لە کەنیسەیەکی شاری « پیترۆگراد »یش، لە تەنیشت گۆڕی باب و باپیرەکانی خۆیانەوە، بە خاکیان نەسپاردنایە، کۆمەڵێکی زۆریش لە خەڵکی ئەو شارە، ئامادەی ناشتنیان نەبوونایە!
ئاخر، ئەو کۆمۆنیستە دیکتاتۆر، فاشیست، تاوانبار و دڕندانە، خۆیان چینێکی تایبەتیی نوێیان درووستکردبوو، جێی هەموو تسار، دەرەبەگ و بۆرژواکانی پێشوویان گرتبۆوە و لە ئەوانیش، گەلێ خراپتربوون! بە ڕاستیی، هەرگیز باوەڕ ناکەم، لە سەردەمی هەموو تسارەکاندا، بە درێژایی مێژووی فرمانڕەوایی خۆیان، چەن هەزار مرۆڤێ کوژرابێ. کەچیی، تەنیا هەر لە سەردەمی « ستالین »ی سەرکردەی پارتی کرێکار و جووتیاران خۆیدا، ئەو کۆمۆنیستە زۆر مرۆپەروەرانە، چل میلیۆن مرۆڤی بێ تاوانیان قڕکردووە. «3»
ئەمە، تەنیا هەر ئەوە دەگەیەنێ، کۆمۆنیستەکانی سەردەمی شۆڕش، لەگەڵ کۆمۆنیستەکانی دوای شۆڕش، واتە: سەردەمی دەسەڵاتی ڕامیاریی و دەوڵەت، جیاوازییەکی زۆریان هەبووە. چونکە، ئەزموونەکانی ژیان و دەسەڵات، زۆر بە ئاشکرا بۆی سەلماندین، لە هەموو دەوڵەتە سۆسیالیستەکانی وەک: « یەکێتیی سۆڤێت، چیکۆسلۆڤاکیا، یۆگۆسلاڤیا، ڕۆمانیا، هەنگاریا، بولگاریا، ئەڵمانیای خۆرهەڵات، چین، کوبا، کەمبۆدیا، ڤێتنام ... »، هەمان ئەو سەرکردە و کادیرە کۆمۆنیستانەی، سەردەمی شۆڕش و دوای شۆڕش، وەک یەک نەبوون و زۆر گۆڕابوون. گەلێ کاری خراپیشیان کردووە، کە تا کۆمەڵگەی مرۆش مابێ، لاپەڕەکانی مێژوو، زۆر بە قێز و بێزەوە باسیاندەکا!

ئاخر، کاتێ کچەکەی « برێژنێف » شوویکرد، لە شاری « لێنینگراد »ی ئەو کاتە و لە « ئەرمیتاژ »، «4» ئاهەنگی شووکردنەکەی سازکرا، کە لە سەردەمی تسارەکانیشدا، شتی وا ڕووی نەداوە! ئاخر « برێژنێف »، هەژدە ساڵ فرمانڕەواییکردووە « 1964 - 1982 »، دەبێ، لەو ماوە درێژەدا، چی کرد بێ؟!! چونکە، پێش ئەوەی دەسەڵات وەرگرێ، سکرتێری کۆمیتەی نێوەندیی پارتی کۆمۆنیستی « مەڵدۆڤە » بوو، ئەوەی کۆمەڵانی خەڵک، لەویان دەگێڕایەوە، مەگەر هەر دوو داوێنپیسی وەک « ڕاسپۆتین » و « ڕۆفایل » کردبێتیان! ئیدی، چۆن دەبێ، تسارەکان ئەهریمەن بووبن، سەرکردە کۆمۆنیستەکانیش، فریشتەی ئاسمان بووبن، یا بە ناو، باوکی چینی کرێکار و جووتیارانیش بووبن؟!!

هەرچەندە، شۆڕشی « ئەکتۆبەر »، بە یەکەمین شۆڕشی گەورەی سۆسیالیستی پرۆلیتاریا دەژمێررێ. بەو پێیە دەبووایە، شۆڕشەکە و ئەندامانی سەرکردایەتیی شۆڕش، لە ڕاژەکردنی چینە چەوساوەکانی کۆمەڵگەی « سۆڤێت »دا بوونایە. کەچیی، لە ڕاستییدا وا دەر نەچوو. بەڵکوو، پتر لە ڕاژەکردنی ئەندامانی پارتی کۆمۆنیست و سیخوڕەکانی دەزگەی نهێنیی « KGB »دا بوو! لەبەرئەوە، گەر شتێ، دەربارەی خەسڵەتەکانی شۆڕشی سۆسیالیستیی، سەرکردەکانی چینی چەوساوە و پارتی کۆمۆنیست، لە بیرەوەریی ڕۆڵەکانی گەلانی « یەکێتی سۆڤێت »دا مابێ، ڕەنگە، تەنیا هەر هەژاریی، دواکەوتوویی، توندڕەویی، پەرگیریی، دیکتاتۆریی، ڕاونان، گرتن، ئازار، ئەشکەنجەدان، کوشتن و بڕین بێ و لە هەموو خەسڵەتەکانی دیکەش پتر، باڵی بە سەر بیرەوەرییەکانیاندا کێشابێ! باوەڕ ناکەم، هیچ خەسڵەتێکی دیکەیان بیرمابێ، چونکە، زۆریان خراپە دیوە و گەلێ زۆردارییان بەرانبەر کراوە، ئیدی چییان بیربمێنێ؟!!

ئاخر، کۆمۆنیستەکان دەیانویست، سیستێمی سۆسیالیستیی و کۆمۆنیستیی، بە زۆر و بە زەبری گوللە، بە سەر گەلانی « سۆڤێت »دا بسەپێنن! ئەوەتە، « لینین » خۆی نووسیوێتی: (مارکس دەستی خۆی و دەستی پیاوانی شۆڕشی سۆسیالیستیی داهاتووی نەبەستووە، سەبارەت بەوەی، پێوەندیی بە شێوەی کۆدەتا و شێواز و ڕێگاکانییەوە هەیە.)«1،304»

لەبەرئەوە، چ « مارکس » و چ « لینین »، باوەڕێکی تەواویان، بە بەکارهێنانی توندوتیژیی هەبووە، تەنانەت، لە پێناوی سەرکەوتنی شۆڕشی سۆسیالیستییشدا، گەر لایەکی کۆمەڵگەکەیان قڕکردایە، بە ڕەوایان دەزانی! چونکە، « لینین » خۆی باوەڕی پێی هەبووە و خۆشی نووسیوێتی: کێشەی

سەردکیی لە ئەموو شۆڕشێکدا، خۆی لە دەسەڵاتی ڕامیارییدا دەنوێنێ. ئاخر، لای ئەوانەی، باوەڕیان بە دیمۆکراسیی نییە، دەسەڵاتی ڕامیاریی، بە خوێن نەبێ، بەدی نایە!

**4. میسر:**

شۆڕشگێڕەکانی « میسر »، دوای ئەوەی، شۆڕشی « 1952 .07 .23 »یان بە سەرکەوتوویی ئەنجامدا، سیستێمی پاشایەتیی و ڕژێمە دیکتاتۆرەکەیان لەنێوبرد، شا « فاروق »یان نەکوشت، بەڵام، لە « میسر » دەریانکرد. کەچیی، ئەندامانی سەرکردایەتیی شۆڕش و « ئیتیحادی ئیشتراکیی » خۆیان، گەلێ لەوان خراپتر دەرچوون. هەرچەندە، سەرکردەکانی شۆڕش دژی خۆسەپاندن، دیکتاتۆریی، چەوساندنەوەی مرۆ، ئازاردان، کوشتن و بڕین بوون، لە سەر کاغەزیش، گەلێ یاسای نوێیان دەرکرد. بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، دوای ئەوەی، بە تەواویی دەسەڵاتیان وەرگرت و جێ پێی خۆیان قایمکرد، یەک لە دوای یەکی نەیارەکانی خۆیان پاکتاوکرد، گرتووخانەکانیان، لە ڕۆڵەکانی گەلی « میسر » پڕکرد، وزەیان لە کۆمەڵانی خەڵکیی بڕی. تەنانەت، سیخوڕ و چاوساغیشیان، بە سەر خەڵکەوە دانا و دوایاندەکەوتن، تا بزانن، بۆ کوێ دەچن، لەگەڵ کێ قسەدەکەن و باسی چی دەکەن!
لە ڕووی ڕەوشتی کۆمەڵایەتییشەوە، مەگەر هەر سەرکردەیەکی وەک « جەمال عەبدولناسر »، بە خاوێنیی خۆی مابووبێتەوە، خەریکی سامان کۆکردنەوە و داوێنپیسیی نەبووبێ. ئەگینا، زۆربەی ئەندامەکانی دیکەی سەرکردایەتیی شۆڕش، ئەوەی پێش شۆڕش لەکیسیانچووبوو، بە زیادەوە دەسیانکەوتەوە. جگە لە پارەپەیداکردن، خۆ دەوڵەمەندکردن، زەوی و کۆشک داگیرکردن، لە ڕووی داوێنپیسییشەوە، لە شا « فاروق »یان تێپەڕاندبوو! بۆیە، کۆمەڵانی خەڵک، جگە لە « ناسر »، ئەوانی دیکەیان خۆش نەدەویست و ئاواتیان، بە سەردەمی پاشایەتیی دەخواست!

**5. عێراق:**

دەربارەی « عـێـراق »، هـەر هێندە دەڵێم: ئایا، سەردەمی پاشایەتیی و کۆماریی، جیاوازیی نەبوو؟ گەر جیاوازیی هەبوو، لە چ بوارێکدا بوو؟ ئایا، گەلانی « عێراق » بە گشتیی و گەلی کورد بە تایبەتیی، لە کام سەردەمدا، باشتر دەژیان؟!! ئاخر، ئەو کودەتاچییانە، هەر لە یەکەمین ڕۆژی کودەتاکەیانەوە، زۆر بێ بەزەییانە و بێ ویژدانانە، دەسیان بە خوێنڕشتن

کرد، بنەماڵەی شا « فەیسەڵ »یان لەتێوبرد و دەسیان بە سەر هەموو شتێکیاندا گرت، ڕۆڵەکانی گەلانی « عێراق »یشیان، فێری پیاوکوشتن کرد.
جا، گەر سەرکردەکانی کۆدەتای « 14 .07 .1958 »، ڕەخنەیان لە سیستێمی پاشایەتیی هەبووبێ، بە پیاوی بیانیی و نۆکەری « بریتانیای گەورە »، تاوانباریانکردبێ، ئەدی خۆیان، چۆن وەڵامی ڕۆڵەکانی گەلانی « عێراق » دەدەنەوە؟!! ئایا، زۆربەی هەرە زۆری سەرکردەکانی کۆماری « عێراق »، نۆکەری بیانیی نەبوون؟!!
ئەوە جگە لەوەی، ئەوەتەی سیستێمی کۆماریی لە « عێراق » دامەزراوە، هەرا و ئاژاوەیەکی زۆر پەیدابووە. ئازادیی و دیمۆکراسیی قەدەغەکراوە. ڕۆڵەکانی گەل، بە خراپترین شێوە دەچەوسێنرێنەوە و بە سزای مەرگ دەگەیەنرێن.
ئاخر، بە درێژایی مێژووی فرمانڕەوایی بنەماڵەی شا « فەیسەڵ »، ڕەنگە، هەمووی پەنجا کەس لە « عێراق »دا لە سێدارە نەدرابێ، کەچیی، هەر لە ساڵی « 1958 »ەوە تا ئەوڕۆ، نزیکەی دوو میلیۆن کەس کوژراوە! ئاخر، گەر شا « فەیسەڵ » و بنەماڵەکەی دزبووبن، ئەدی سەرۆک « سەددام »، چی بووە، « 31 » میلیار دۆلاری، لە بانکەکانی جیهاندا هەیە؟!!

## 6. باشووری کوردستان:

ڕەنگە « باشووری کوردستان »، لە سەردەمی شاخ و شاردا، لە سەردەمی شۆڕش و دەسەلاتدا، لە سەردەمی بندەسیی و سەربەستییدا، جگە لەوەی، هێزی داگیرکەری دەوڵەتی « عێراق »، لە « کوردستان » نەماوە، جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبێ. چونکە، لە هەر دوو سەردەمەکەی دەسەلاتی خۆماڵییدا، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، بە دەس سەرکردەی شۆڕش و ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتەکانەوە، گیریانخواردووە!
سەیر ئەوەیە، ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتەکانی « باشووری کوردستان »، سەرەڕای ئەوەی، هەموو کاتێ، مەترسیی کوشتن و مەرگیان لە سەر بووە، لەو چیا و چۆڵە، لە کونەکوورکێکی قوڕینی بچکۆلانەدا ژیاون، بەرگەی سەرماوسۆڵەی زستان، گەرماوگوڕەی هاوین، نەبوونیی و نەداریی، نەخۆشیی و ناخۆشیی، برسێتیی و تینوێتییان گرتووە، دوور لە ژووری گەرم و نێو جێی نەرم، لە خواردنی هەمەجۆرەی چەور و گەرم، لە گەرماو و خۆشتن، لە تێلێفیزیۆن و سینەما، لە ترۆمبێل و گەڕان، لە گەشت و سەیران، لە پیاسەی شەقامەکانی شار، بە جووتێ کالەی لاستیک و دەستێ جلی کوردیی چلکنەوە، بە تفەنگێک و دەمانچەیەکەوە، بە چەن یەدەکێکی کلاشینکۆف و

قومبلەیەکەوە، بە هەر شێوەیە بووبێ، گوزەرانداووینە، قوربانییان، بە دایک و باوک، خوشک و برا، ژن و ماڵ، کوڕ و کچ داوە. کەچیی، کاتێ سەرکەوتوون و بەرەو شارەکان گەڕاونەتەوە، کاتێ پۆستێکی ڕامیارییان وەرگرتووە، هەوای دەسەڵات لە کەللەی داون. کاتێ خێر و خۆشیی ژیان، زۆر بە توندیی، لە دەرگەی داون، زۆربەی زۆریان، هەموو ئەو خەبات و ماندووبوونەیان، لە بیر خۆیان بردۆتەوە، ناو و ناوبانگی خۆیان زڕاندووە، ڕابردووی خۆیان لەکەدارکردووە. چونکە، هەر خەریکی هەڵپەی ژیان، پارە پەیداکردن، چڵپەی دەم، ڕاوەژن و سامان پێکەوەنان بوون. هاوڕێی ژیانی تێکۆشان و ڕۆژی تەنگانەی شاخی خۆشیان بیرچۆتەوە، سەر و یەک دوو هاوسەری نوێیان، بۆ خۆیان هەڵبژاردووە. ئەوە جگە لەوەی، ماڵی نهێنیی زۆریان هەبووە، شەوانە، لەوێ خواردوویانەتەوە، قوماریانکردووە و لەگەڵ نازدارێکیشدا، تا بەیانیی، دەس لە ملان بوون! بە داخەوە، هێندێ لەو سەرکردە و کادێرە پێشکەوتووانە، وایان لێهاتووە، بە هیچ شتێ، تێر ناخۆن! چەندین کاری ڕەوا و ناڕەوا دەکەن، لە لاشەوە، لەگەڵ هێندێ بازرگان و دەوڵەمەندەکانی شاردا، هاوبەشن و پارەیان لێ دەکێشنەوە!
هەر بۆ نموونە دەڵێم: دوای ئەوەی، شۆڕشی نوێی گەلەکەمان، تووشی هەرەس بووبوو، پێشمەرگە، تاکوتەرا نەبێ، بە شاخەوە نەمابوو، ڕۆڵەکانی کورد، هیوابڕاوبووبوون. یەکێ لەو قارەمانانە، ساڵی « 1990 »، لە شاری « ستۆکهۆڵم »، زۆر بە ڕاشکاویی پێی گوتم: هەموو ژیانم، بە خۆڕایی ڕۆی. هەر لە لاوێتیمەوە، خەریکی کاری ڕامیاریی و کوردایەتیی بووم. ماوەیەکی زۆر، لە گرتووخانە توندکراوم. ئەوەی دیکەشی، لە چیا پێشمەرگە بووم. تەماشاکە، ئەو خەڵکە چۆن دەژین و منیش، چۆن ژیاوم؟!!
ئاخر، ئەو پیاوە، لەبری ئەوەی، شانازیی بەو خەباتە پیرۆز و ڕابردووە پرشنگدارەی خۆیەوە بکا، کەچیی، لە هەموو تێکۆشانی ڕابردووی خۆی پەشیمانبوو! بۆیە، هەر ڕاپەڕین ڕوویدا و گەڕایەوە، یەکسەر ژنێکی نوێی هێنا، چەندین دوکان و بازاڕی قووتکردەوە، چەندین خانووی دروستکرد و فرۆشتی!
کەواتە: کوردی چیاو چۆڵ، لەگەڵ کوردی شار و شۆڕ، چۆن جیاوازیی نییە؟!! ئاخر، هەمیشە لە خەباتی شۆڕشی چەکدارییدا، نەتەوەی کورد سەرکەوتووبووە، کەچیی، لە خەباتی ڕامیاریی و دیپلۆماسییدا، لە کاتی ئاشتیی و گفتوگۆدا، هەمیشە دۆڕاندوویەتی! بۆ؟ چونکە، سەرکردەکانی کورد، زۆر وریا و بلیمەت نەبوون، شارەزای کاری ڕامیاریی، هونەری

دیپلۆماسیی، ژیانی ئاشتیی و کەمەی گفتوگۆ نەبوون. لەبەرئەوە، لە لایەکەوە، دوژمنی داگیرکەر، خەسڵەتی سەرەکیی ئەو سەرکردە و کادیرانەی سەرکردایەتیی پارتەکانی باش ناسیوە. لە لایەکی دیکەشەوە، هەر زۆر زوو، هەموو ئەو ژان و ئازارانەیان بیرچۆتەوە، کە چەندین ساڵ، خەباتیان بۆ کردووە و ئازاریان پێوە چێشتووە. بۆیە، لە ئامانجە پیرۆزەکانی شۆڕش لایانداوە، کورد بە هیچ نەبووە، هیچی بە هیچ نەکردووە و لە یەکدیش بوون! جا بۆ ئەوەی، ئامانجەکانی خۆیان جێبەجێکەن، بە دەیان نۆکەری ڕژێمی کۆنیان، وەک توولە و تانجی ڕستکردووە و لە دەوری خۆیان کۆیان کردوونەتەوە!

بە ڕاستیی، گەر یەکێ کەمێ ویژدانی هەبێ، بیر لەوە دەکاتەوە، ئەندامانی « یەکێتیی »، لە ڕۆژەڕەشەکانی گەلی کورددا، ئەو هەموو قوربانییەیانداوە، کەچیی ئەوڕۆ، ئەندامانی سەرکردایەتیی و کادیرەکانی، بەو شێوەیە خۆیان دەنوێنن! ئاخر، ئەندامانی هەموو پارتە پچووکەکانی « باشووری کوردستان » کۆکەینەوە، هێندەی ژمارەی شەهیدەکانی شار و شاخی « یەکێتیی » نابن! ئیدی بۆچی دەبێ، بە گوتاری ناشیرن و کردەوەی خراپ، ئەو هەموو مێژووە پڕ لە سەروەریی، گیانبازیی و خوێناوییە، بە قسەی هەڵەقومەلەقی هێندێ ئەندامانی سەرکردایەتیی پیسکەن، یا بیسڕنەوە؟!! بە ڕاستیی، ئەو یاداشتەی « نەوشیروان مستەفا، کۆسرەت ڕەسووڵ و عومەری سەیید عەلی » دەرەنگبوو، دەبووایە، زۆر زووتر بنووسرایە و دەس بەو کارە پیرۆزە بکرایە، هەرچەندە، دەردی « ڕووس »یش دەڵێ: هەرگیز درەنگ نییە!

## کۆتاییی:

بە ڕاستیی، ئەو مرۆڤانەی، لە بەردەم پارە و دەسەڵاتدا، خۆیان بۆ ناگیرێ، زۆر شتی گرنگ، لە ژیانی خۆیاندا وندەکەن، لە پێستی مرۆیی خۆیان دەردەچن و کەوڵێکی دیکە دەپۆشن. ئاخر، مرۆ جگە لەوەی، بیر لەو هەموو خەبات، ژان و چەرمەسەرییەی خۆی ناکاتەوە، جگە لەوەی، قووربانیی بە ناو و ناوبانگی خۆی دەدا، هەرگیز، بیریش لەوە ناکاتەوە، ئەو کورسیی و دەسەڵاتە، تا سەر بۆ هیچ کەسێ بەردەوام نەبووە و تا سەریش، بۆ هیچ کەسێ نابێ. چونکە، هەر وەک عەرەب گوتوویەتی: گەر بۆ کەسانێکی دیکە بەردەوامبووایە، بە تۆ نەدەگەیی !«4»

ئەو لادان و خراپەکارییانەش، هەمیشە، لە دەوڵەتە دیکتاتۆریی و پارتە خاوەن ئایدۆلۆژیا توندڕەوەکاندا ڕوویانداوە و ڕوودەدەن. بەڵام، لە دەوڵەتە

دیموکراسیی و لیبراڵەکاندا، ئەو کارانە، بە دەگمەن روودەدەن. چونکە، هەر چەن ساڵ جارێ، لێپرسراوانی پارت و دەستەی فرمانرەوایانی دەوڵەت دەگۆڕێن. جگە لەوەی، دەسەڵاتی چوارەم و چاوی زیتی رۆڵەکانی گەل، رۆژانە، وەک چاودێرێکی وریا، بە ویژدان، دڵسۆز و نەنووستوو وان، هەر هەڵە و تاوانێ ببینن، قەبووڵی ناکەن و یەکسەر، لەقاویاندەدەن و بە سزای رەوای خۆیان دەگەیەنن!

* * *

---

تێبینیی:
1. لا نبی بعدی.
2. گەر هەر خوێندەوارێ، تەماشایەکی ئەو رۆژنامە و گۆڤارانە بکا، کە لە سەردەمی « گلاسنۆست » و « پێریسترۆیکە »دا دەرچوون، بە تایبەتیی « ئەرگۆمێنت و فاکت »، ئەوا، تەنیا هەر ئەو کاتە، بە تەواویی بۆی روونددەبێتەوە، کۆمۆنیستەکان بە گشتیی و « ستالین » بە تایبەتیی، بەرانبەر کۆمەڵگەی گەلانی « سۆڤێت » چەن تاوانبارن.
بە داخەوە، ئێستەش کۆمۆنیستی نەزانی وا هەن، داکۆکیی لەو تاوانانە دەکەن، لە بۆنە نەتەوەیی و چینایەتییەکانیشدا، وێنەی چەن تاوانبارێکی وەک « ستالین » بەرزدەکەنەوە! یا، هێندێ جار، گوێم لە هێندێ کۆمۆنیستی کوردی سەرلێشێواو بووە، زۆر بە راشکاویی گوتوویانە: « میخایل گەربەچۆڤ »، ناپاکیی لە بیری کۆمۆنیستیی کردووە و بەکرێگیراوی « ئەمێریکا » بووە! ئاخر، ئەو جۆرە کەسانە، لە هەموو باوەڕێکی مرۆیانە شۆراونەتەوە، دژی ئازادیی و دیموکراسیی کاردەکەن، ئێستەش دەیانەوێ، کۆمەڵانی خەڵک و گەلانی پێشووی « سۆڤێت »، هەر وەک کەر و گا بژین، تەنیا هەر بخۆن و بنون، ئاگایان لە هیچی دیکە نەبێ. لە کاتێکدا، گەلانی ئازادی جیهان، زۆر بە خۆشیی، بەختەوەریی، تێروتەسەلیی دەژین! مەگەر هەر خوا بۆ خۆشی بزانێ، شوێنەواری خراپی کردەوەی کۆمۆنیستەکان، لە هەموو رووەکانی پێشکەوتنی ژیانی کۆمەڵایەتیی و زانستەوە، کەی پڕدەبێتەوە؟!!
3. ئێرمیتاژ، کۆشکێکی گەلێ گەورەیە و لە سەردەمی تسارەکاندا دروستکراوە. دوای شۆڕشی « ئەکتۆبەر »، بۆ پێشانگە تەرخانکراوە، گەلێ پەیکەر و تابلۆی رازاوەی جوانی تێدا هەیە. لە هەموو جیهانەوە، توریست دەچن و تەماشایدەکەن.
4. لو دامت لغیرک، لما وصلت الیک.

سەرچاوە:

1. لینین، المولفات الکامله، المجلد 36.
2. الشیوعیه العلمیه، معجم، دار التقدم، موسکو، 1985.
3. BONNIERS LILLA UPPSLAGSBOK, 1989

# ناوبانگ
# و
# دەسەڵات

دیارە، نەک تەنیا هەر، ڕێکخراو و پارتە رامیارییە جیاجیاکان هەوڵدەدەن، دەس بە سەر دەزگەکانی دەسەڵاتدا بگرن، بەڵکوو، کەم مرۆڤیش هەیە، لە ژیانی خۆیدا، دڵی بۆ کورسیی دەسەڵات لێ نەدا و خەونیشی پێوە نەبینێ! چونکە، لە لایەکەوە، بە هۆی دەسەڵاتەوە دەتوانن، زۆر لە ئامانجەکانی خۆیان جێبەجێکەن. لە لایەکی دیکەشەوە، دەسەڵات گەلێ کاری گرنگ، یەکلایی دەکاتەوە. هەر وەک « لینین »یش، زۆر بە ڕاشکاوییش گوتوویەتی: ئامانجی سەرەکیی هەموو شۆڕشێ، خۆی لە بەدەسهێنانی دەسەڵاتی رامیارییدا دەنوێنێ. ئەم بۆچوونەش، تا ئەندازەیەکی زۆر، ڕاستە.
ئاشکرایە، دەسەڵات جۆری هەیە و لە بواری جیاجیادا خۆی دەنوێنێ. بۆ نموونە: هەڵپەی دەسەڵات، لە باوک و برای گەورە لە نێو خێزاندا، سەرگەورەی بنەماڵە، سەرۆک تیرە، هۆز، خێڵ، پارت و لێپرسراوانی دەزگە جیاجیاکانی دەوڵەتەوە دەسپێدەکا، تا بە دەسەڵاتی میر، شا و سەرۆک کۆمارەکان کۆتاییدێ. بەڵام، ئەز لێرەدا، مەبەستم لە دەسەڵاتی ڕامیاریی پارت و دەوڵەتەکانە. ئەگینا، لە کۆمەڵگە خێڵەکیی و دواکەوتووەکاندا، سەرۆک تیرە و هۆزەکان، دەسەڵاتێکی زۆریان هەیە، ئەندامانی تیرە و هۆزەکان، گوێیان لێ دەگرن و ئەوانیش، بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان، بە هەموو جۆرێ هەڵیاندەسووڕێنن و بەکاریاندێنن!

لێرەدا، گرنگ ئەوەیە، لە خۆمان بپرسین: ئایا دەسەڵات، بە چ شێوازێ دابین دەکرێ؟ بۆ چ مەبەستێ بەکاردێنرێ؟ چۆن دەپارێزرێ؟ ئەم پرسیارانە هەموویان، جێی مشتومڕن و دەمەتەقێی تێروتەسەل هەڵدەگرن. لە وەڵامدا دەتوانم، بڵێم: بە شێوەیەکی گشتیی، دەسەڵات بە سێ شێواز دابیندەکرێ:
1. هێز بەکار نایێنرێ.
2. هێز بەکاردێنرێ.
3. لە ڕێی پێوەندیی خزمایەتیی و خوێنەوە، پشتاوپشت دەگۆڕێ.
هەڵبەتە، لە وڵاتە ئازاد و دیمۆکراسییەکاندا، هەر چەن ساڵ جارێ، هەڵبژاردن بۆ پەرلەمان دەکرێ و ئەو لایەنەی دەردەچێ، پۆستی شالیارگەکان دابەشدەکا و کابینەی میریی خۆی دادەمەزرێنێ. واتە: دەسەڵات، لە نێوان ڕۆڵەکانی گەل و پارتەکاندا، بە شێوەیەکی بەردەوام، ئاڵوگۆڕی پێ دەکرێ، بێ ئەوەی، یەک دڵۆپ خوێنی لە پێناودا بڕێژرێ.
بەڵام، لەو وڵاتانەی ئازادیی و دیمۆکراسیی تێدا نییە، بە تایبەتیی، لە جیهانی سێیەمدا، لەبەرئەوەی، لە زۆربەی هەرە زۆری دەوڵەتەکاندا، دەسەڵاتی دەوڵەت، لە قووڵی مشتی تاکەکەسێکی وەک میر، شا و سەرۆک کۆمارە دیکتاتۆرەکاندا کۆدەبێتەوە، یا، پارتێکی ڕامیاریی خاوەن ئایدۆلۆژیایەکی فاشیی، نازیی، ڕەگەزپەرست و دیکتاتۆر، دەسەڵات کۆنترۆڵدەکا، هەمیشە، لە ڕێی پیلانگێڕان، کودەتا و جەنگی نێوخۆوە، دەسەڵات دەگۆڕێ، لە لایەن هێزەکانی سوپا و پارتەکانەوە، دەسی بە سەردا دەگیرێ.
ئەوە جگە لەو دەوڵەتانەی، سیستێمی فەرمانڕەوایی، لە بەر ڕۆشنایی پێوەندیی خزمایەتیی و خوێن بەڕێوەدەچێ، واتە: پشتاوپشت، دەسەڵات لە « باوکەوە بۆ کوڕ، یا لە براوە بۆ برا ... » دەگوێزرێتەوە، ئینجا، هێندێ جاریش، هەرا و ئاژاوە دروستدەبێ و خوێنی تێدا دەڕێژرێ! وەک لە مێژووی کۆنی نەتەوەکانی نێوچەکە بە گشتیی و نەتەوەی کورددا بە تایبەتیی، گەلێ جار و لە گەلێ میرنشیندا ڕوویانداوە. یا، لە مێژووی هاوچەرخماندا، چەندین جار، لە سەر دەسەڵاتی ڕامیاریی و پاوەنخوازیی، جەنگێکی خوێناویی چەپەڵی نێوخۆ، لە نێوان هێزە ڕامیارییەکانی سەر گۆڕەپانی « کوردستان » بەرپابووە.
بەپێی پێناسەی « مارکسیزم ـ لینینزم » بێ، دەسەڵاتی دەوڵەت، خۆی لە دەسەڵاتی چینێکی دیاریکراودا دەبینێ. بۆ ئەم بۆچوونەش، نموونەی چەن دەوڵەتێکیان لە مێژوودا هێناوەتەوە، وەک دەوڵەتی « کۆیلەداریی،

دەرەبەگایەتیی، سەرمایەداریی و سۆسیالیستیی »، کە لە چەن سەردەمێکی جیاجیادا دامەزراون و لە لایەن چەن چینێکی کۆمەلایەتیی جیاوازەوە، فەرمانڕەواییکراون. بەڵام، ئەز پێم وایە و دەتوانین، دەوڵەت لە ڕوانگەیەکی دیکەوە تەماشاکەین، بۆ ئەوەی، لە پێکهاتەی چینایەتیی دەسەڵاتدارەکانی وردبینەوە، ئەویش ئەوەیە، ئایا دەسەڵاتدارانی دەوڵەتەکە، تا چەن، باوەڕیان بە پرۆسەی دیمۆکراسیی هەیە؟!! کەواتە: بەپێی ئەم بۆچوونە بێ، دوو جۆرە دەسەلات و شێوازی فەرمانڕەوایی هەیە: « دیمۆکراسیی و دیکتاتۆریی ».
بۆیە، هەموو ئەو سەرکردانەی دەسەلات وەردەگرن و دەیانەوێ، ئامانجەکانی خۆیان بەدیبێنن، گەر یەکەمین شێواز پیادەکەن، ئەوا، گومانی تێدا نییە، خۆیان بە دیمۆکراسییخواز و ڕژێمەکەشیان، بە دیمۆکراسیی ناودەبرێن. بەلام، گەر دووەمین شێواز پێڕەوکەن، ئەوا، خۆیان بە دیکتاتۆر و ڕژێمەکەشیان، بە دیکتاتۆریی نێوزەددەکرێن!
جا، هەر دوو سیستێمە فەرمانڕەوایی و دەسەلاتەکە، ئایا پاشایەتیی یا کۆماریی بێ، چەن خەسلەتێکی تایبەتیی خۆیان هەیە. بەلام، گرنگ ئەوەیە، ئەو فەرمانڕەوا و دەسەلاتدارانە، بە چ شێوەیە، دەسەلاتەکە بەڕێوەدەبەن؟ ئایا، بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان، یا، بۆ ڕاژەکردنی گەل و نەتەوەکەیان بەکاریدێنن؟!!
لە ڕاستییدا، دەسەلات بۆ ئەوە هاتووە، ئامانجێکی دیارییکراوی توێژال و چینە کۆمەلایەتییەکانی کۆمەلگەیەکی دیارییکراوی پێ بەدیبێنرێ، ڕاژەی کۆمەلانی خەلکی پێ بکرێ، نیشتمانی پێ ئاوەدانکرێتەوە، داکۆکیی لە ڕۆلەکانی نەتەوە و خاکی نیشتمان بکا، نەک دەسەلاتداران، بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان، بەکارییێنن و نوزە لە ڕۆلەکانی گەل ببڕن.
سەیر ئەوەیە، هەموو سەرکردە دیمۆکراسییخواز و دیکتاتۆرەکان، هەر وەک یەک، لە باخچەی مێژووی نەتەوەکان و کۆمەلگەی مرۆدا، جێی خۆیان دەکەنەوە. بەلام، بە شێوازی جیاواز، ناو و نیشانیان دەنووسرێ. بۆ نموونە: دوو پیاوی وەک « بسمارک » و « هیتللەر »، هەر دووکیان، ناویان لە لاپەڕەکانی مێژووی نەتەوەی « ئەلمان »دا تۆمارکراوە. بەلام، یەکەمیان وەک پالەوانێکی نەتەوەیی و دووەمیشیان، وەک دیکتاتۆرێکی خوێنڕێژ، لێیان دەڕوانرێ!
شاراوەش نییە، دەتوانرێ، ناوبانگ بێ دەسەلاتیش بەدیبێنرێ. ئەویش تەنیا هەر، بە شەونخوونیی، خۆماندووکردن، هەولدان و کۆششکردنێکی زۆر بەدیدێ. بۆ نموونە: هەموو « هۆنەر، نووسەر، هونەرمەند، ڕۆژنامەنووس و

زانا ەکان، ئەو کارانەی دەیکەن، لە ڕاژەی مرۆ دایە و گەر سەرکەوتووبن، ئەوا، ناویان بە پیتی زێڕ، لە لاپەڕە هەرە گەشەکانی مێژووی نەتەوەکەی خۆیان و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیيشدا تۆماردەکرێ، ناو و ناوبانگیان، پەردەی گوێی نەیارانیان دەدڕێ و وەک کریستاڵ، لە هەموو شوێنێ دەزرینگێتەوە، با دوژمن و نەیارەکانیشیان، دژایەتییانبکەن و پێیان ناخۆشبێ!
جا، گەر دەسەڵات و بەهرە، دیمۆکراسیی و ئازادیی، لە پرۆسێسێکی گەورەی پێشکەوتندا یەکگرن، ئەوا، چانسی کەشتیی ئاسمانیی ناودەرکردن، زۆرتر و باشتر دەبێ. تا کۆمەڵگەی مرۆش بمێنێ، ناوی ئەو نەمرانە هەر دەمێنن، ئاخر، چەن ناوێکی ناسراوی وەک: « ئەرستۆ، ئیفلاتون، سوقرات، نیوتن، ئەدیسۆن، ئەنیشتاین، پوشکین، موتەنەبیی، عومەر عەبدولعەزیز... »، هەموو پەیامبەران « زەردەشت، موسا، عیسا، محەمەد ... »، هەموو نیشتمانپەروەرە شۆڕشگێرە ڕاستەقینەکانی وەک: « ماوتسی تۆنگ، هۆشیمنە، نیلسۆن ماندێلا ... » کە شەویان بە دەم ڕۆژەوە گرێداوە، بە تیشکی چرای هەوڵ و خەباتی خۆیان، ڕێی تاریکونووتەکی زانیاریی و زانستیان، بۆ کۆمەڵگەی مرۆ ڕووناککردۆتەوە، جەرگی تاریکایی شەوی دواکەوتوویی و نەزانییان شەقکردووە، چۆن لە بیر نەوە لە دوای نەوەی کۆمەڵگەی مرۆ دەچنەوە؟!!
لە نێو ڕیزەکانی نەتەوەی کوردیشدا، ناوی چەندین نووسەری گەورەی وەک: « شەرەفخانی بەدلیسیی، محەمەد ئەمین زەکیی، مەسعوود محەمەد ... »، هۆنەری ناوداری بلیمەتی وەک: « خانیی، حاجی قادری کۆیی، نالیی ... »، هونەرمەندی دەسرەنگینی بەهەرداری وەک: « سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانیی، حەسەن زیرەک، حەمەی ماملێ ... »، ڕامیار و سەرکردەی شۆڕشگێڕی وەک: « شێخ عوبێدوڵڵای نەهریی، سمایل ئاغای شکاک، قازی محەمەد ... » تامەتایە، وەک ئەستێرەیەکی هەرە گەش و پرشنگدار، بە ئاسمانی کۆمەڵگەی کوردەوە دەدرەوشێنەوە و مێژووەکەی دەڕازێننەوە!
بەڵام، ئەوانەی لە ڕێی ڕاژەکردنی نەتەوە و نیشتمانەکانیانەوە، دەسەڵات وەردەگرن، ناو و ناوبانگ پەیدادەکەن، سەردەکەون، پێدەگەن و پێشدەکەون، پاشان، ئەو دەسەڵاتە، بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان، بنەماڵە و پارتەکانیان، بە شێوەیەکی خراپ بەکاردێنن، لەبری ئەوەی، ڕۆڵەکانی گەل، ڕێزیان لێ بگرن و بە چاکە ناویانبەرن، ئەو ڕاژەیە هەشیانە، بە کردەوەی چەپەڵی خۆیان دەیسڕنەوە. ئاخر، چەن پیاوێکی کەللەڕەقی خوێنڕێژی دیکتاتۆری وەک « ستالین، هیتلەر، مۆسۆلۆنیی، فرانکۆ، چاوشیسکۆ،

هۆنیکەر، حەمەڕەزا پەهلەویی، سەددام حوسێن ... »، بۆچی دەبێ، ڕۆڵەکانی گەل و کۆمەڵگەی مرۆ، بە چاکە باسیانکەن و یادیانکەنەوە؟!! ئاخر، ئەو کۆمەڵە سەرکردە دیکتاتۆرانە، کەمیان بە ڕۆڵەکانی نەتەوەکانی خۆیان و ڕۆڵەی نەتەوەکانی دیکەی جیهان نەکردووە؟!! کەمیان خوێن نەڕشتووە؟!!
سەیر ئەوەیە، لە وولاتە دیمۆکراسیی و ئازادەکانی جیهانیشدا، چەن پیاوێکی ناودار هەڵدەکەون، لە ڕێیەکی دیکەوە، خراپەکاریی دەکەن، ناو و دەسەلاتی خۆیان بەکاردێنن، تا، ئارەزووە چڵێس و چەپەڵەکانی خۆیان تێرکەن و بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان دابینکەن. لەبەرئەوە، زۆربەی دەسەلاتداران، بە دەسی خۆیان، بە کرداری چەوت و خراپی خۆیان، زۆر شت لە دەس خۆیان دەدەن. ڕەنگە، دزیی و داوێنپیسیی، دوو خەسڵەتی هەرە ترسناک و ڕەوشتی خراپ بن، لە ناو و ناوبانگی سەرکردە و دەسەلاتدارانی جیهان کەمکەنەوە.
هەر بە ڕاستیی، کەم مرۆ هەیە، بە تەواویی بتوانێ، لە بەردەم هێزی ئەفسووناوی ئەو دوو پەتا گەورەیەدا، خۆی بۆ ڕاگیرێ!
لێرەدا، هەر بۆ نموونە دەڵێم: یەکێ لەو هۆ هەرە گرنگانەی، شا « فارووق » لە « میسر »، دەسەلاتی لەدەسدا و لابرا، داوێنپیسیی بوو!
« بیل کلینتن »، سەرۆکی پێشووی « ئەمێریکا »، بە هۆی پێوەندیی سێکسەوە لەگەڵ « مۆنیکا » داوێکدا، بە تەواویی، ناوی زڕا و لاپەڕەی ژیانی پیسبوو.
« فرانسۆ میتران »ی سەرۆک کۆماری « فرەنسە »، لە داوێنپیسییدا، شتێ لە « ڕۆفایل »ی داوێنپیس گەڕابۆوە!
هەروەها، هێندێ لە سەرکردەی پارتەکانی « باشووری کوردستان »یش، کاتێ لە شاخەوە بەرەو شار گەڕانەوە، لە زەلکاوی داوێنپیسییدا نقوومبوون!
لەبەرئەوە، دەسەلات وەک چەکێکی دوو دەم وایە، گەر دەسەلاتداران، بە باشیی بەکاریبێنن، ڕازەی ڕۆڵەکانی نەتەوە و خاکی نیشتمانەکەی خۆیانی پێ بکەن، ئەوا، بەرزیاندەکاتەوە و ڕێزیان بۆ پەیدادەکا. بەڵام، گەر بە خراپ بەکاریانهێنا، جگە لەوەی، ناو و ناوبانگیان دەزڕێنێ، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەیان، نەفرەتیان لێ دەکەن، دەیانشکێنێ و بە ناخی زەویشیاندا دەبا!

* * *

# شۆڕش
# و
# سەرکردە

«1»

زۆربەی هەرە زۆری، بزووتنەوە چەکدارییی و شۆڕشە خوێناوییەکانی کورد هەرەسیهێناوە. لەبەرئەوە، هێندێ لە سەرکردەکانی کورد، وەک « کامەران بەدرخان، شێخ عوبیدوڵڵای نەهریی ... »، گیراون و دوورخراونەتەوە. ئیدی، راپەڕین و شۆڕشەکە تەواوبووە و کۆتاییپێهاتووە.

هێندێکی دیکەیان، گیراون و دادگاییکراون. پاشان، لە داواکاریی خۆیان و ئامانجە سەرەکییەکانی شۆڕشەکە پەشیمانبوونەتەوە، تا، داگیرکەرەکە لێیانخۆشبێ و بە سزای مەرگیان نەگەیەنێ. بۆ نموونە: « شێخ سەعیدی پیران »، توورکە « کەمالیی »یەکان ئەو کارەیان پێ کرد و لە سێدارەشیاندا!

هێندێکی دیکەیان، بە پیر لەشکری داگیرکەرەکەوە چوون، پەلیان گرتوون، هێناویان و کلیلی شاریان داونەتێ. بۆ نموونە: « قازی محەمەد » پێی وابووە، تەنیا هەر خۆی، لە هەموو کارێ بەرپرسیارە. لەبەرئەوە نەیویستووە، چی دیکە لەوە پتر، خوێنی کورد بڕێژرێ، لەبری ئەوەی هەڵێ و ملی خۆی، لە پەتی سێدارە قووتارکا، ئەو کارەی کردووە، بەڵام، هەر لە سێدارەشیانداوە!

هێندێکی دیکەیان، وەک « ئیحسان نووریی پاشا، مستەفا بارزانیی ... »، لە رووی رامیارییەوە تێکشکاون و هەڵاتوون، پەنایان بۆ داگیرکەرێکی دیکە بردووە، تەنانەت، ماڵاواییشیان لە رۆڵەکانی کەلەکەی خۆیان نەکردووە! پێیان وابووە، بەرگرییکردن هیچ کەڵکێکی نابێ، پتر خوێنی رۆڵەکانی کورد دەڕژێ و بە فیڕۆدەڕوا!

هێندێکی دیکەشیان، بە پیلانێکی نێو دەوڵەتیی فڕێنراون و گیراون. پاشان، لە قوژبنی زیندان توندکراون. بۆ نموونە: « عەبدوڵڵا ئۆجەلان »، لە زۆر شتی

خۆی پەشیمانبۆوە و تەنانەت، ناو و ستراتیژی سەرەکیی پارتەکەشی گۆڕی!
لێرەدا، پرسیارێ خۆی قووتدەکاتەوە، ئاخۆ، گەر چانس یاری « مەسعوود بارزانیی »، یا « جـــەلال تاڵەبانیی » نەبووایە، ڕۆژێ لە ڕۆژان، لە لایەن هێزەکانی دوژمنی داگیرکەرەوە دەسگیرکرانایە، ئایا، چارەنووسی ئەوان چۆن دەبوو؟ تۆ بڵێی، وەک « شێخ سەعیدی پیران »، قسەکانی خۆیان بگۆڕیایە و پەشیمانبوونایەتەوە؟!! یا، گەر وەک « ئۆجەلان »، هەر دووکیان بفڕاندنایە، ئایا لەو باشتر دەبوون، وا ئێستە گاڵتەی پێ دەکەن؟!!

**-2-**

هەڵبەتە، هەر کوردێ، کەمێ هۆش و گۆشی هەبێ، زۆر باش دەزانێ و تێدەگا، بۆچی دەسەلاتدارانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستـان »، هەمیشە هەوڵیانداوە، سەرکردەکانی کورد لەنێوبەرن. ئاخر، هەر ئەوان نەبوون، چەندین سەرکردەی کوردپەروەری وەک: « شێخ عەبدولسەلامی بارزانیی، شێخ سەعیدی حەفید، شێخ سەعیدی پیران، سەیید ڕەزای دەرسیمیی، سمایل ئاغای سمکۆ، قازی محەمەد، دوکتۆر عەبدولڕەحمانی قاسملۆ، دوکتۆر شەرەفکەندیی »یان تیرۆرکرد و دەسیان بە خوێنیان سوورکرد!
با زۆر دوور نەڕۆین، سەرکردەیەکی وەک « مستەفا بارزانیی »، لەبەرئەوەی، ئەزموونێکی تەواوی، لە خەباتی ڕامیاریی و چەکدارییدا هەبوو، بە هیچ شێوەیە، باوەڕی بە دوژمنەکانی خۆی نەبوو. لەبەرئەوە، هەرگیز لێیان نزیک نەدەکەوتەوە، هەر ئەوان سەردانیاندەکرد و داوەتیاندەکرد، تا سەردانی پێتەخت بکا. بەڵام، ڕۆژێ لە ڕۆژان، ئەو بانگهێشتنانەی پەسەند نەکردووە! لەبەرئەوە، هەر لە سەرەتای شۆڕشی « **11**/سێپتێمبەری**1961** »وە، سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » تێگەیشتبوون، لەگەڵ کێدا دەجەنگن؟!!
بەڵێ، ئەو پیاوە کوردەیان، باش دەناسیی و دەیانزانی، چۆن سەرکردەیەکە. بە تەواویی تێگەیشتبوون، ڕاوکردنی هەروا کارێکی ئاسان نییە و بە ئەوان ناخورێ. چونکە، پشتی بە چیا ئەستووربوو و لێی دا نەدەبەزی. بۆیە، بە خـوێنی سەری تینووبوون و بۆ هەلێ دەگەڕان، لەنێویبەرن. لەبەرئەوە ناچاربوون، چەندین جار، هەوڵی کوشتنی بدەن.
کەچیی دەبینین: لە هیچ سەردەمێکدا، داگیرکەرانی « کوردستان » هەوڵیان نەداوە، « مەسعوود بارزانیی »، یا « جەلال تاڵەبانیی » لەنێوبەرن! بەڵکوو، هێندێ جاریش، لە بەر دەسی خۆیاندا بوون، زیانیان پێ نەگەیاندوون! ئەمە بۆ وایە؟!! لە کاتێکدا دەزانین، کەم سەرکردەی کورد هەیە، بە دەسی ئەو داگیرکەرانە تێدا نەچووبێ، گەر نەشیانکوشتبێ، ئەوا، وەک « عەبدوڵڵا

ئۆجەلان » فڕاندوویانە و لە قوژبنی گرتووخانە توونديانكردووە! بەڵام، لە هەمان كاتدا، نەک هەر دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، بەڵکوو، هەر سێ دەوڵەتە داگیرکەرەکەی دیکەش، هیچیان لە « بارزانیی » و « تاڵەبانیی » نەکردووە، بەڵکوو، ڕێزێکی تایبەتییان لێ گرتوون و هێندێ جاریش، یارمەتییشیانداون!
هەڵبەتە، هۆکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، مەترسیی ئەو سەرکردە مەزنانەی پێشوو، بۆ سەر دەوڵەتە داگیرکەرەکانیان، لە مەترسیی هەر دوو سەرکردە: « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، گەلێ زیاتربووە. چونکە، ئەوان دڵسۆزی نەتەوە و نیشتیمانی خۆیان بوون، بە ڕاستیی، بۆ ئامانجە بنەڕەتیی و سەرەکییەکانی کورد تێکۆشاون، پیاوی هیچ داگیرکەرێ نەبوون، چۆڵەکەی شۆڕشگێڕانی سەردای کوردیان، بۆ داگیرکەرانی « کوردستان » ڕاو نەکردووە. بە پێچەوانەوە، ئەمان، ڕاژەی بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان، ئامانجی تەسکی پارتایەتیی و ئەوان دەکەن، وەک پەشتەماڵی گەرماو وان، هەر ڕۆژەی، لە گەڵ و گیپاڵی داگیرکەرێکەوە دەئاڵێن. جا ئیدی، کە بۆ ئەوان، لە مێروو بێ زیانترین، چ پێویستدەکا، ئازاری دڵە ناسکەکانیان بدەن!

**-3-**

« یاسر عەرەفات »، وەک هەموو مرۆڤێ، وەک سەرکردەی هەموو گەلێکی بندەس، خەسڵەتی چاکە و خراپەی خۆی هەبوو. تا لە ژیاندابوو، گەلێ نەیار و دوژمنی نێوخۆ و دەرەکیی هەبوو. بەڵام، کاتێ مرد، دوژمنەکانی پێش دۆستەکانی، ڕێزیان لە قووربانیی و خەباتی نیو سەدەی گرت، بە ڕێزێکی زۆرەوە، بەڕێیانکرد و ناشتیان. جگە لە سەرانی دەوڵەتی « ئیسرایل »، سەرانی زۆربەی دەوڵەتە کچکە و گەورەکانی جیهان، لەم پەڕی خۆرهەڵاتەوە بۆ ئەو پەڕی خۆراوا، بەشدارییان لە ناشتن و پرسەکەیدا کرد. کەچیی، بە داخێکی گەورە و گرانەوە، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، نەک هەر بەو شێوەیە بیر ناکەنەوە، ڕێز لە پیاوە گەورەکانی خۆیان ناگرن، بەڵکوو، دوای مردنیشیان، زۆر ڕێز لە خۆیان و خەباتیان ناگرن، هێندێ جاریش، سووکایەتییان پێ دەکەن. ئاخر ئەوڕۆ، جگە لە یادی « بارزانیی مستەفا »، کێ ساڵانە، یادی چەن کەڵەپیاوێکی وەک « شێخ عەبدولسەلامی بارزانیی، شێخ سەعیدی حەفید، شێخ سەعیدی پیران، دوکتۆر فوواد، سەیید ڕەزای دەرسیمیی، سمایل ئاغای سمکۆ، ئیحسان نووریی پاشا، شێخ مەحموودی حەفید ... » دەکاتەوە؟!! ئاخر، گەر « بارزانیی مستەفا »، خاوەنی ئەو هۆزە گەورەیە نەبووایە، ئەو دەسەڵات و هێزە زۆرەیان نەبووایە، کێ یادی دەکردەوە؟!! یا،

گەر « حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران » نەبووایە، ئێستە، کێ یادی هەر سێ سەرکردەی ناسراوی کورد: « قازی محەمەد، دوکتۆر عەبدولرەحمانی قاسملۆ و دوکتۆر شەرەفکەندیی » دەکردەوە؟!! سەیر ئەوەیە، نەک هەر دوژمنەکانیان، بەڵکوو، هێندێ کوردیش هەن، دوای مردنیشیان، وازیان لێ ناهێنن و بە خراپە باسیاندەکەن. ئەوە لەبری ئەوەی، وەک قورئان دەفەرموێ: باسی چاکەی مردووەکانتان بکەن!*

«4»

کاتی خۆی، « ئەنوەر سادات »، زۆر بە ڕاشکاویی، بە « ئینگلیز »ەکانی گوتبوو: « چەرچل »، پیاوێکی گەورەبوو، بەڵام، بە لای منەوە دزبوو. چونکە، نیشتمانەکەی داگیرکردبووم و بەرووبوومەکەی دەدزی. ئاخر، ڕۆژێ نەمبینی، سەرکردەی یەکێ لە پارتەکانی « کوردستان »، زۆر بە ڕاشکاویی، هەمان قسە، بە سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان » بڵێ! هەر بۆ نموونە: بە توورکەکان بڵێ: « ئەتاتوورک »، پیاوێکی زۆر ئازا و گەورەبوو، ڕاژەیەکی زۆری نەتەوەی توورکی کرد. بەڵام، لای ئێمە، لە سەرکردەی دەوڵەتێکی داگیرکەر زیاتر، هیچی دیکە نییە!

بە داخەوە، ڕۆژێ نەمبینی، سەرانی ئەو دوو پارتە، قسەیەکی ڕاست بکەن. هەمیشە، دڵی داگیرکەرانیان ڕاگرتووە و مەراییان بۆ کردوون. بەڵام، دڵی ڕۆڵەکانی کوردیان شکاندووە و ڕێزیان لێ نەگرتوون!

«5»

کاتێ، هەر دوو سەرکردەی توورک و فارس: « ئەتاتوورک » و « ڕەزاشا » ویستیان، دەوڵەتێکی نەتەوەیی، بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆیان دامەزرێنن، پێش هەموو شتێ، تەماشایەکی وردی، باری نێوخۆی وڵات، نێوچەکە و نێودەوڵەتانیان کرد. ئەو سەردەمە، تازە یەکەمین جەنگی جیهان تەواوبووبوو. بەرەی خۆراوا بە گشتیی، هەر دوو دەوڵەتی « بریتانیا » و « فەرەنسە » بە تایبەتیی، لە جیهاندا، دەسەڵاتێکی زۆریان هەبوو. بۆیە، خۆیان لەوان نزیککردەوە، ئامانجەکانی خۆیانیان پێ جێبەجێکردن و دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان دامەزراند!

کەچیی، « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، لەبری ئەوەی ئەوڕۆ، وەک سەرکردەی گەلێکی بندەس و چەوساوە بیربکەنەوە، ڕەفتاربکەن و هەوڵبدەن، لە ژێردەسیی و داگیرکردن، گەلەکەی خۆیان ڕزگارکەن، دەوڵەتێکی نەتەوەیی بۆ دامەزرێنن، هەوڵدەدەن، سەرۆکیی و سەربەخۆیی، بۆ دەوڵەتی داگیرکەری چەکی کیمیاویی و « ئەنفال » بگێڕنەوە. ئاخر دەبووایە، وەک « ئەتاتوورک » و

« رەزاشا » بیریانبکردایەتەوە و هەنگاویانبنایە، تا، گەلی کورد، لە ڕەوتی ڕووداوەکانی کاروانی ڕامیاریی نێوچەکە و جیهان بەجێ نەمێنێ! دەبووایە، زۆر بە وردیی و وریایی، ئاگاداری ڕەوشی ڕامیاریی و پێوەندیی دیپلۆماسیی نێــو دەوڵەتان بوونایە، بایەخــێکی زۆریان، بە هەر دوو دەوڵەتی گــەورەی بڕیاریەدەســی وەک: « ئەمێریکا » و « بریتانیا » بە تایبەتیی، دەوڵەتەکانـــی « یەکێتی ئەوروپا » بە گشتیی بدایە و ئامانجەکانی کوردیان بەدیبێنایە!

6

ئەم سەرکردانەی کورد، زۆر سەیرن، لە سەرکردەی هیچ گەلێکی دیکە ناچن. چونکە، گــەر نووســەرانی هەر گــەلێکی دیارییکراو، ڕەخنەیان لە کــار و کــردەوەکــانی ســەرکــردە و پارتەکــانیــان گــرتبێ، ئەوا، زۆر بە وردیی، ڕەخنەکانیان، دید و بۆچوونەکانیان خوێندوونەتەوە، گەر ڕەخنەکانیان ڕاست بووبێ، کەڵکیـان لێ وەرگرتوون، گەر هەڵەشبووبێ، وەڵامیانداونەتەوە، لە هەر دوو بارەکەشدا، ڕێزێکی زۆریان لێ گرتوون، نەک هەڕەشەیان لێ کردبن!

کەچیی، سەرانی کورد و پارتەکانی، جگە لەوەی گوێ بۆ ڕەخنەی نووسەرانی کــورد ڕا ناگــرن، لە هەمــان کــاتیــشدا، تووڕەدەبن، هەڕەشــەیان لێ دەکــەن، ڕەخنەکانیـان بە جنێو، فیتنە، ژار و ئاژاوەنـانەوە دادەنێن. لە کاتێکدا، لەبری ئەوەی بزانن، ئەو نووســەر و ڕەخنەگرانە، بۆچی دەنووسن و ڕەخنەیان لێ دەگرن! هەڵبـەتە، خـراپەکاریی، کەموکووڕیی، هەڵە، تاوان و ناپاکیی هەیە، بۆیە، نووســەران ڕەخنەدەگــرن. ســەرەڕای ئەوەش، بۆ ئەوەی تــووڕەبوون و نارەزایی کۆمەڵانی خــەڵک هەڵمژن و بێ دەنگیانکەن، گوتاردەدەن، تاوێ بە نەرمیی، گوایە: ڕەخنەیان پێ خۆشە و ڕەخنەگرتن کارێکی باشە. تاوێکیش، بە توندیی، گــوایە: ئەوانە ڕەخنەگــر و ڕەخنە نین، بەڵکوو، ئاژاوەچێن و ناکۆکیی لە نێوان ڕیزەکانی گەلدا دروستدەکەن، وەک « مەسعوود بارزانیی » گوتوویەتی: (ئێمە تێبینی دەکەین، وەختێ کە کێشەی گەلەکەمان بەرەو پێش دەچێ، مــاڵی کــورد بەرەو تەبایی و هاوکــاریی دەچێ، زۆر کــەس هــەن، هــەوڵدەدەن، زەهر بڕێژن. هــەوڵدەدەن، بوخــتــان هەڵبــەســتن. نەوەکــوو ڕەخنەبگرن. بەڵکوو، بوختان هـەڵبەستن و ڕەش و سپی بکەن بە ڕەش. ئەوانە بیانەوێ و نەیانەوێ، خزمەتی دوژمنانی کورد و کوردستان دەکەن ...)

* * *

---

* و اذکروا محاسن موتاکم.

# شۆڕش و بەرگریی

«1»

هێندێ جار، گەر شۆڕشێکی نەتەوەیی و چەکداریی، زۆری خایاند، شۆڕشەکە لە نێوەوە، وردەوردە، گەرای لەنێوبردنی خۆی دەخا، وەک دارێکی گەندەڵ و کرمۆڵ، بە پێوە دەمرێ. بۆ نموونە: شۆڕشی « 11 .09 .1961 »، ماوەی چواردەساڵی خایاند، گەر بڵێم، لەو ماوە درێژەدا، تەنیا هەر سێ چوار ساڵی یەکەمی شۆڕشەکە، کوردایەتیی ڕاستەقینە کراوە، لە ڕاستیی لام نەداوە. چونکە، کاتێ ناکۆکیی، دووبەرەکیی و جەنگی نێوخۆ، لە نێوان سەرکردەی شۆڕش « بارزانیی مستەفا » و ئەندامانی پەلیبیرۆی « پارتیی »دا درووستبوو، کەلێنێکی گەلێ گەورە، لە ڕیزی شۆڕش و پارتەکە کەوت، مەگەر هەر خواش بۆ خۆی بزانێ، هەر لە سەرەتای ساڵی « 1964 »وە، لە نێو ڕیزەکانی ئەو شۆڕشەدا، چی ڕوویداوە؟!! چەن کەموکووڕیی هەبووە؟!! چ جۆرە هەڵە و تاوانێ، دەربارەی ڕۆڵەکانی گەلی کورد بەئەنجامگەیەنراوە؟!! چەن ناپاکیی، خۆی بە سەر هەموو لایەنەکاندا سەپاندووە؟!! بە تایبەتیی، لە دوا ساڵی شۆڕشەکەدا « 1974 - 1975 »، بە هەموو شێوەیە، هالاوی خراپەکاریی، بۆگەنیی، دەسپیسیی، داوێنپیسیی، دزیی و نۆکەریی لێ هەڵدەسا. ئاخر بۆیە، ئەنجامەکەی بەو شێوەیە کۆتاییهات، کە هەموومان بە چاوی خۆمان بینیمان و لەو ڕۆژەڕەشەشدا، کەسێ نەبوو و نەیتوانی، درێژە بە خەبات بدا و بەرگرییبکا!

«2»

کاتێ، ساڵی « 2004 »، جەنگی نێوان بەرەی هاوپەیمانان بە سەرکردایەتی « ئەمێریکا » و « عێراق » ڕوویدا، هێزەکانی هاوپەیمانان توانیان، سوپای دەوڵەتی « بەعس » تێکبشکێنن. ئەوەبوو، لەشکری « عێراق »، توانای بەرگرییکردنی نەما، پارتی « بەعس »، هێزەکانی سوپا و دەزگەکانی دەوڵەتی « عێراق »، لە بنوبێخەوە هەڵوەشانەوە.

بەلام، گەر وەک « سەددام حوسێن »، هەڕەشەی لە « ئەمێریکا » دەکرد و بەڵێنیدابوو، « مەغۆلەکانی سەردەم لە بەردەم شوراکانی بەغدادا سەربڕێ »، بڕیاری بەرگرییکردنی بدایە، هەڵبەتە، خاکی « عێراق »یان، لە هێزەکانی سوپای هاوپەیمانان دەکرد بە دۆزەخ و بارەکەش، بە جۆرێکی دیکە دەشکایەوە.
بۆ نموونە: چەن چەکدارێکی کۆنە « بەعسیی » و گرووپە ئیسلامییە توندڕەوەکان، ئەوا پتر لە ساڵێ دەبێ، یەخەی سوپای داگیرکەریان گرتووە، لە نێو شارەکاندا، جەنگی سەرجادەیان لەگەڵ دەکەن. هەمووشمان دەزانین، تا ئێستە، چ بەزمێکیان پێ کردوون، چ جۆرە زیانێکی گیانیی و مەتیریالیییان پێ گەیاندوون. تەنانەت، ئەو چەکدارە کەمانەی نێو شارۆچکەی « فەللووجە »، ماوەی دە ڕۆژی تەواو، بەرگرییانکرد، ئینجا، هێزەکانی « ئەمێریکا » و هاوپەیمانەکانی، بەو هەموو هێز و توانایەوە توانیان، دەس بە سەر شارەکەدا بگرن! یا، لە شارێکی وەک « مووسڵ »، تا ئێستەش، بەو هەموو هێزە زۆرەی هاوپەیمانان و « عێراق »یشەوە، بە تەواویی نەیانتوانیوە، کۆنترۆڵی شارەکە بکەن!
کەچیی، کاتێ « مستەفا بارزانیی »، وەک « سەددام حوسێن »، بڕیاری چەک دانانی دا و گۆڕەپانەکەی، بۆ سوپای داگیرکەری « عێراق » چۆڵکرد، کەسێ نەبوو، بڵێ: نەء و لە سەر بەرگرییکردن بەردەوامبێ! ئەوە جیاوازیی سەرەکیی، نێوان بزووتنەوەی چەکداریی و ڕامیاریی، هەر دوو گەلی عەرەب و کوردە!

## «3»

ڕۆڵەکانی گەلی عەرەبی « عێراق »، مافێکی سروشتیی و ڕەوای خۆیانە، گەر دژی داگیرکردنی خاکی « عێراق » بوەستن، خەباتی ڕامیاریی، دیپلۆماسیی و چەکداریی، دژی هێزەکانی سوپای داگیرکەری هاوپەیمانان بکەن، یا، لە کۆڵ دیکتاتۆرێکی وەک: « سەددام حوسێن » و پارتێکی دڕندەی فاشیی وەک: « بەعس »یشیان کردبنەوە. چونکە، ئەوان عەرەبن و دەوڵەتەکەش، هەر بە دەوڵەتێکی عەرەبیی دەزانن. بەلام، بۆ منێکی کوردی چەندین جار چەوساوە، خاک داگیرکراو و بێ ماف، « عێراق »، دەوڵەتێکی سەرکوتکەری داگیرکەر نەبێ، هیچی دیکە نەبووە و نییە! بۆیە، دەسخۆشانە لە هێزەکانی هاوپەیمانان دەکەم، پیرۆزبایی لە سەرکردەکانیان دەکەم، کە لەو جەنگە پیرۆزەدا، بە سەر هێزەکانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » دا سەرکەوتن.

چونکە، بەرژەوەندیی بەشێ لە گەلەکەم « کــورد » و پارچەیە لە نیشتمانەکەم « باشووری کوردستــان »، لە ســەروو هەموو چەمکێکی « مـێژوویی، مرۆیی، ئایینیی و عێـراقـچـێتـیی »یەکـەوە داناوە و دادەنێم. وا بزانم، ڕۆڵەی هەمـوو نەتەوە بندەسە خـاک داگیـرکراوەکـانی جیـهانیش، لە هەرە کـۆنەپەرست و ڕاستـەوە بیگرە، تا بـە هەرە پێشکـەوتووخـواز و چەپەکـانیـان دەگـا، هەر بەو جۆرە بیـریانکردۆتەوە و هەر ئەوەش هەڵوێستـیـانبـووە، کەسیش گلەیی لێ نەکردوون و ڕەخنەی لێ نەگرتوون، بۆیە سـەرکەوتوون! ئیدی، بۆ دەبێ، دید و بۆچوونـی خـۆم، دژی دوژمنە سـەرەکـیی و دڕندەکـەم، زۆر بە ڕاشکاویی دەر نەبڕم؟!!

«4»

دوژمنانی بەرەی گەل، لە هەر شوێنێکی ئەم جیـهانە بن، هەر دوژمنن و هیچ جیاوازییـەکیـان نییە، هـەرچەندە، چەن پێناسـەیەکی نەتەوەیی و چینایەتیی جیاوازیش هەبێ. لەبەرئەوە، هەر کەسێ، گەر کوردیش بێ، زیان بە ڕۆڵەکانی گـەل و خاکی نیشتمـانەکەی خـۆی بگەیەنێ، با بە زمـانی کوردییش قسـەبکا، با، جلوبەرگی کوردییش بپۆشێ و لە سـەر خاکی پیرۆزی « کوردستـان »یش بژی، هـەر بە دوژمن دادەنرێ. چونکە، دۆست و دوژمن، تـەنیـا هـەر، بە زمـانی نەتەوەیی و پۆشاک، لە یەکدی جیا ناکرێنەوە!

کـەواتە: مـەرج نییە، تەنیا هـەر، دەوڵەتە داگیرکـەرەکانی « کوردستـان »، بە دوژمن بزانین. ڕاستە، ئەوان ڕاستەوخۆ، نیشتمانەکەیان داگیرکردووین و بە دوژمنی سـەرەکیی دەناسرێن. بەڵام، لە هەمـان کـاتیـشدا، هێندێ کـورد هەن، هێندێ جار، لە دوژمنە سەرەکییەکە خراپترن، ڕەفتاری وا دەکەن، دوژمنەکە نایکا!

ئایا، ئەوانەی لە جـەنگی چەپەڵی نێـوخـۆی کـوردکـوژییـدا، ڕۆڵەی کـوردیان بەکوشداوە، چ جۆرە جیـاوازییـەکیان، لەگەڵ دوژمنی داگیرکەری بیانییدا هەیە؟!! ئایا، ئەوانەی سامانی سـەر زەویی و ژێر زەویی « کوردستان » دەدزن و تاڵانیدەکەن، بە چەپ و ڕاستدا لێیدەدەن و بە دیاریی دەیبـەخشنەوە، لەگەڵ داگـیرکـەرانی « کـوردستـان »دا، چ جـۆرە جـیـاوازییـەکـیـان هـەیە؟!! ئایا، ئەوانەی دەس بۆ ئابڕووی ژنان و کـیژانی کورد درێژدەکەن، لەگەڵ سـەربازە پۆستاڵڕەش و سیخوڕە ملباریکە عەرەبەکاندا، چ جۆرە جیاوازییەکیان هـەیە، کە بە هەزاران کیژی نازدار و ژنی ئابڕوومەندی کوردیان خراپکرد؟!!

* * *

# چارەنووسی دیکتاتۆر

هەڵبەتە، هەموو دیکتاتۆرێ، کاتێ دەسەڵاتی هەبوو، بە تەواویی، لە خۆی دەگۆڕێ، گوێ لە کەس ناگرێ، هەموو جۆرە یاسایەکی سەر زەویی و ئاسمانیی پێشێلدەکا، بە خراپترین شێوە، دژی نەیارەکانی خۆی دەوەستێ، سزایاندەدا، دەیانگرێ، ئازاریاندەدا و دەیانکوژێ. بەڵام، کاتێ لێی قەوما، ترسنۆکترین مرۆ دەردەچێ. لەبەرئەوە ئامادەیە، هەموو شتێ پەسەندکا، تەنیا هەر بۆ ئەوەی، گیانی خۆی لە مردن بپارێزێ، تەنانەت، قوربانیی بە هەموو شتێکی پڕ بایەخیش دەدا!
لە مێژوودا، کەم دیکتاتۆر هەبووە، بە مردنی خوا مردبێ، مەگەر دیکتاتۆرێکی ناوداری وەک « ستالین » لە « یەکێتی سۆڤێت » و « فرانکۆ » لە « سپان »، لە دەس تۆڵەی ڕۆڵەکانی گەل قووتاریانبووبێ و مردبن. ئەگینا، زۆربەی هەرە زۆری دیکتاتۆرە خوێنرێژەکان، بە سزای خۆیان گەیشتوون، گیراون و لە گرتووخانەکاندا توندکراون، یا کوژراون. بۆ نموونە: هەموو سەرکردە دیکتاتۆرەکانی وەک: « هیتلەر، مۆسۆلینیی، پینۆچێت، چاوشیسکۆ، هۆنیکەر، میلۆسۆڤیچ ... »، لە دەس دادگە و سزای ڕەوای گەل دەر نەچوون، هێندێکیان گیراون، دادگاییکراون و سزادراون، هێندێکی دیکەشیان، فریای دادگاییکردن نەکەوت و یەکسەر کوژراون!
ئەوڕۆش، سەرۆکی دیکتاتۆر « سەددام حوسێن » دەبینین، زۆر بە کەساسیی و سەرشۆڕیی، لە قوژبنی یەکێ لە گرتووخانە تایبەتییەکانی سوپای « ئەمێریکا »دا، چۆکی داداوە و چاوەڕوانی فرمانی دادگە دەکا، تا، بڕیار لە سەر تاوانەکانی بدەن و سزاییدەن!
ئاخر، ئەو « سەددام حوسێن »ەی، هیچ کەسێکی لە جیهاندا، لە خۆی بە گەورەتر و بە پیاوتر نەدەزانی، ئەو پیاوە زۆردارە دیکتاتۆرەی، هەموو گرووپە ئێتنیکەکانی « عێراق »ی تۆقاندبوو، سێ جەنگی گەورەی ماڵوێرانکەرانەی، دژی گەلانی « کوردستان، ئێران و کوێت » هەڵگیرساند و نزیکەی دوو میلیۆن مرۆڤی قڕکرد. بەڵێ، ئەو سوپەرمانەی دەیگوت: جاران « یەکێتی

سۆڤێت » دژایەتیی « ئەمێریکا »ی دەکرد، ئێستە، دەوڵەتی « سۆڤێت » هەڵوەشاوەتەوە و نەماوە. ئەورۆ، « ئەمێریکا » لەو پەڕی جیهان و ئێمەش، لەم پەڕی جیهانین، بەرانبەری دەوەستین و چی لەدەسدێ، با دریغیی نەکا! کەچیی، کاتێ پەلاماریاندا، نەک هەر « مەغۆڵەکانی سەردەم، لە بەردەرم شوراکانی بەغدا سەر نەبڕران »، بەڵکوو، یەک فیشەکیشی نەتەقاند و هەڵات. کاتێ دۆزیشیانەوە، وەک مشکێکی گەورەی تۆپیو، بە پەڕۆیەکی پیس، کلکیان گرت و لە چاڵێکی پچووکی ژێر زەیدا دەریانهێنا!
ئەوەتە، ئەو پیاوە مەزنە پاڵەوانە ئازایە، ئەو قارەمانە نەتەوەییەی عەرەب، ئەو شۆڕەسوارەی جەنگی « قادسییە »، ئێستە لێی قەوماوە، ملی لە پەتی سێدارە نزیکبۆتەوە، بۆیە، هاواری لێ هەستاوە، پەنای بۆ دەزگەی « دادگەی ئەورووپای مافی مرۆ » بردووە و داوای لێ کردوون، داوا لە « ئەمێریکا » بکەن، نەیدەنەوە دەس میریی کاتیی « عێراق ». بەڵام، ئەو دەزگەیە، داواکەیان ڕەتکردەوە. با بزانین، ئەم دواکارییەی سەرۆک کۆماری « عێراق »، ڕاستگری نەتەوەیی و هەرێمایەتی « پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست » چی دەگەیەنێ:
1. هەرچەندە، « سەددام حوسێن » بە کردەوە، ماوەی « 35 » ساڵ، فرمانڕەوایی گەلانی « عێراق »ی کردووە. کەچیی لەگەڵ ئەوەشدا، باوەڕی بە ڕۆڵەی وولاتەکەی خۆی نییە، دادگاییبکەن! چونکە، هێندەی تاوان، بەرانبەر ڕۆڵەکانی گەلانی « عێراق » کردووە، هێندەی لێ کوشتوون، هەر لە ژماردن نایە! ئاخر، گەر سەرکردەی پارتێکی ڕامیاریی و سەرۆک کۆماری دەوڵەتێکی گرنگی وەک « عێراق »، چەکی کیمیاویی، دژی دانیشتووانی چەن نێوچەیەکی وەک « کوردستان » و نێوچە « شیعەنشین »ەکان بەکاربێنێ، گەر بە هەزاران ڕۆڵەیان، بێ دادگاییکردن لە سێدارەبدا، ئیدی، چۆن لە ڕقی پیرۆز و تۆڵەی پێویستی ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆی ناترسێ؟!! چۆن بە سزای مەرگی ناگەیەنن؟!! باوەڕ ناکەم، زۆربەی هەرە زۆری دانیشتووانی « عێراق »، بە هیچ شێوەیە، سۆزیان بەرانبەری بجوڵێ، مەگەر تەنیا هەر ئەوانەی، بە ڕەوشت و خوو، وەک خۆی وان و لە خوێن تێر نابن!
2. « سەددام »، دان بە دادپەروەریی دەوڵەتەکانی بەرەی خۆراوادا دەنێ، باوەڕی بە هەڵسوکەوتی کاربەدەسانی دادگە و گرتووخانەکانیان هەیە، چۆن بە شێوەیەکی مرۆپەروەرانە و هاوچەرخانە، دادگایی دیل و گیراوەکان دەکەن، ڕێزیان لێ دەگرن، هەموو جۆرە مافێکی یاسایی و داکۆکییکردنیشیان بۆ دابیندەکەن!

دەبێ، لەم ڕووداوە گرنگە، پەندێکی زۆر گرنگی مێژوویی هەڵهێنجین، ئەویش ئەوەیە: هیچ دیکتاتۆرێ نییە، لە دەس سزای گەل ڕزگاریبێ. کاتێکیش لێی قەوما، هیچ کەسێ دۆستی نییە و ناتوانێ، یارمەتییدا، هیچ جۆرە یاسا و دادگەرێ ناتوانێ، فریایکەوێ و گیانی لە مردن ڕزگارکا.

لەبەرئەوە دەبێ، هەموو دیکتاتۆرە پچووکەکان، چ ئەوانەی « عێراق » و چ ئەوانەی « کوردستان »یش، پەندێ لە کردەوە چەپەڵەکانی « سەددام » وەرگرن، ئاییندەی ئەو خوێنڕێژە سادیستەیان لەبەرچاوبێ، هەرگیز بیریان نەچێ و وەک ئەڵقەیە لە گوێی کەن، تا، تووشی ئەو ڕۆژەڕەشە نەبن!

هەرچەندە، سەرانی دەوڵەتێکی دیمۆکراسیی وەک « فرەنسە »، دژی ئەوە بوون، کاربەدەسانی میریی « عێراق »، دادگایی « سەددام حوسێن » بکا، بەڵکوو داوایاندەکرد، لە دادگەیەکی نێو دەوڵەتییدا دادگەییبکرێ و لە سێدارە نەدرێ. هەروەها، زۆربەی دەوڵەتە « ئەورووپایی »یەکانیش، هەر دژی لە سێدارەدانی « سەددام » بوون. کەچیی لەگەڵ ئەوەشدا، بۆ یەکەمین جار، بۆ بەر دادگەی « عێراق » ڕاپێچکرا و ڕۆژی « **2004 .06 .30** »، کەناڵەکانی تێلێفیزیۆنی جیهان ڕایانگەیاند، هێزەکانی « ئەمێریکا »، « سەددام »یان دا بە میریی کاتیی « عێراق ».

گومانی تێدا نییە، کاتی خۆی، « سەددام حوسێن »، هەواڵی فڕاندن و دەسگیرکردنی « عەبدوڵڵا ئۆجەلان »ی بیستووە و ئاگای لێ بووە. کاتێکیش، لە بەردەم دادگەی دەوڵەتی داگیرکەری « توورکیا »دا ڕایانگرت و پرسیاریان لێ دەکرد، دوور نییە، تەماشای دادگاییکردنەکەشی کردبێ! بەڵام، ئەوەی نایزانین، دەبێ، کۆمێنتاری « سەددام » چی بووبێ؟!! ئایا دەیزانی، ڕۆژێ لە ڕۆژان، خۆشی تووشی ئەو گرتن و دادگاییکردنە دەبێ؟!! ئایا، بیری لەوە دەکردەوە، خۆشی دەبێ، بە کەساسیی و بێ دەسەڵاتیی، ئەو ڕۆڵە، لە سەر شانۆی دادگەی گەل ببینێ؟!! ئایا نەیدەزانی، جامی تووڕەیی ڕۆڵەکانی کۆمەڵگەی « عێراق » پڕبووە، ئیدی، هیچ شتێ فریای ناکەوێ و کورسیی دەسەڵاتە دیکتاتۆرییەکەی، لە تێکشکان قووتار ناکا، وەک چەن جارێ، بەرەی خۆراوا خۆیان، ڕژێمەکەیان لە ڕووخاندن و خۆشیان لە مردن ڕزگار کردووە؟!! تۆ بڵێی، ڕۆژێ لە ڕۆژان، بیری لەو ڕۆژەڕەشە کردبێتەوە، کە ئەوڕۆ تێیکەوتووە؟!!

سەیرەکە لەوە دایە، کاتێ، ڕۆژی « **2004 .07 .01** »، دیکتاتۆر « سەددام »، لە لایەن چەن پۆلیسێکی « عێراق » و هێزەکانی « مارینز »ی « ئەمێریکا »وە، چواردەوری گیرابوو، دەس و قاچیان بە زنجیر بەستبۆوە، بەرەو هۆڵی دادگە

دەیانبرد، تەماشای خۆی دەکرد، سەرنجی لە دەوروبەرەکەی خۆی دەدا، لە پۆلیسەکان و زنجیرەکانی دەس و قاچی وردەبۆوە، زەردەخەنەدەیگرت. دیارە، جگە لەو پۆلیس و سەربازانەی دەبینران، هێزێکی گەورەی دیکەشی لەگەڵدا بووە، بە چەندین تانک و ترۆمبێلیش گواستراوەتەوە! بەڵام، ئەو بیری چووبۆوە، یا، ڕاستتر وایە، بڵێم: لە بیر خۆی بردبۆوە، کاتێ سەرۆک کۆماریش بوو، هەر وەک دیل وابوو! چونکە نەیدەوێرا، بە تەنیا و بە ئازادیی، بە هیچ لایەکدا بڕوا، بەڵکوو، هەمیشە بە دەیان ترۆمبێل و فڕۆکەی هێلیکۆپتەر، پارێزگارییاندەکرد. ئەوە جگە لەوەی، لەو ڕۆژەوە، دەسی بە سەر دەسەڵاتی « عێراق »دا گرتبوو، هەموو نەیارەکانی خۆی پاکتاوکردبوو، تەنانەت، بۆ یەک چرکەش بووبێ، دەرەوەی « عێراق »ی نەدیبوو!
لە ڕاستییدا، کاتێ ئەو دیمەنە کاڵتەجارییەم بینی، لە دڵی خۆمدا لێکمدایەوە و گوتم: ڕەنگە ئێستە، کاڵتەی بەوە بێ، چەن ترۆمبێل و تانکێکیان، بۆ گواستنەوەی تەرخانکردووە. لەوە دەچێ، ئەو پیاوە بۆی نووسرابێ، لە کاتی دەسەڵات و دیلێتییشدا، بە دەیان ترۆمێبلی لەگەڵدا بێ! بەڵام، یەک جیاوازیی، لە نێوان ئەو دوو سەردەمەدا هەیە، ئەویش ئەوەیە: جاران، هەموو ترۆمبێلەکان خۆی دیارییدەکرد، بە ئارەزووی خۆی، بۆ کوێی بویستایە، دەڕۆی. بەڵام، ئێستە خۆشی نازانێ، چەن « ترۆمبێل، تانک، هێلیکۆپتەر، سەرباز و پۆلیس »ی لەگەڵ دایە و دەیپارێزن! نازانێ، لە کوێوە بۆ کوێی دەبەن! ئای ئەم ژیانە چەن سەیرە، کەس نازانێ، سبەی چی لە هەناوی خۆیدا حەشارداوە! کەس نازانێ، بەیانیی چی بەسەردێ! هەڵبەتە، ئەوەش بە کۆتایی، دەسەڵاتی گەورەترین دیکتاتۆری نێوان هەر دوو سەدەی بیست و بیستویەک دادەنرێ! عەرەب ڕاستی گوتووە: ئەوەی خوا بیەوێ، لە نێوان نوێژی ئێوارە و خەوتناندا دەیکا! «1»
ئەو سەرۆک کۆمارە ئازایەی « عێراق »، ئەو سەرکردە نەتەوەییەی عەرەب، ئەو دەمڕاستە بلیمەتەی « بەعس »، ئەو زانا و دانایە، ئەو نووسەر و چیرۆکنووسە، ئەو پیاوە دیکتاتۆر و فاشیستە، ئەو دڕندە کێویی و خوێنڕێژە نەخۆشە، هەڕەشەی لە هێزەکانی « ئەمێریکا » و هاوپەیمانەکانی دەکرد، زۆر بە ڕاشکاویی دەیگوت: « مەغۆڵەکانی سەردەم، لە سەر شوراکانی شاری بەغدا دەمرن. » «2»
کەچیی، سەیر ئەوەبوو، لە چاوترکاندنێکدا گوێی خۆی ونکرد، بە هیچ جۆرێ، بەرگریی نەکرد، شاری « بەغدا »ی پێتەخت، لە لایەن « مەغۆڵەکانی ئەمێریکا »وە گیرا و « سەددام »یش دیار نەما! بە مەرجێ، ئەو جەنگە

گەورەیەی جیهانی هەژاند، هەموو لایە دژی بوون و پشتگیریی « عێراق »یان دەکرد، لە ماوەی « 20 .03 - 09 .04 .2003 » تەواوبوو، هەموو زیانەکانی سوپای هاوپەیمانان، تەنیا هەر « 132 » سەربازی « ئەمەریکایی » و « 31 » سەربازی « بریتانیی » بوو!
ئاخر، کار هەر بەوەشەوە نەوەستا، تەنیا هەر ڕژێمی « بەعس » بروخێ و سەرۆکی فرماندە هەڵێ، پاشان، خۆشی بگیرێ. بەڵکوو، ڕۆژی سێشەممەی « 22 .07 .2003 »، هەر دوو جگەرگۆشـــە بێچوە فاشستە تاوانبارەکەی: « عودەی و قوصەی »، بە خراپترین شێوە و بە دەسی هێزەکانی هاوپەیمان کوژران. ئەوە ڕووداوێکی زۆر گرنگبوو، چونکە، « سەددام » جەرگی هەزران دایک و باوکی ڕۆڵەکانی گەلانی « عێراق »ی بڕیبوو، جلی ڕەشی، بە خوشک و براکانیان لەبەرکردبوو. پێش ئەوەی بمرێ، یەزدانی گەورە، ئەو فیلمە تراژیدیا پڕ لە ژانەی پیشاندا، مەرگی ئەو جووتە بەچکەگورگەی خۆی بینیی و پێش مەرگی باوکیان کەوتن! تا پێش ئەوەی، بە سزای مەرگ شاد بێ، هەم تاڵاوی ژانی کوڕە کوژراوەکانی بچێژێ، هەم بزانێ، دایکان و باوکانی ڕۆڵەکانی گەلانی « عێراق »، چ دەردێکیان، بە دەس لەدەسدانی جگەرگۆشەکانیانەوە چەشتووە. ئەوە دادپەروەریی یەزدانی مەزنە، چونکە، خوا مۆڵەتدەدا و شت پشتگوێ ناخا! «3»
هەڵبەتە، ئەم ڕووداوە گرنگە ئەوەی سەلماند، دیکتاتۆرێکی وەک « سەددام »، هەرچییەکی بۆ پارتەکەی خۆی « بەعس » و گەلەکەی « عەرەب » کردبێ، هەرچییەکی بەسەرهاتبێ، نە بۆ پارت و نە بۆ گەلەکەی خۆی نەکردووە، بەڵکوو، تەنیا هەر بۆ خودی خۆی کردووە. چونکە، ئەوەی لێمان بینی، ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ! ئاخر کاتێ گیرا، جگە لەوەی، هیچ جۆرە بەرگرییەکی نەکرد، بە چ شێوەیەکی ترسنۆکانەش، داوای لە سەربازە بووکەشووشەکانی « ئەمێریکا » کرد، وەک سەرۆک کۆماری « عێراق »، هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەن. بە ڕاستیی، هەموو دیکتاتۆرێ، تا بڵێی ترسنۆکن. چونکە، دوژمنی سەرەکیی ڕۆڵەکانی گەلەکانی خۆیانن و سووریش دەزانن، ڕۆژێ لە ڕۆژان، هەر دەبێ، بە سزای مەرگ بگەیەنرێن و کەسیش نییە، داکۆکییان لێ بکا!
بە ڕاستیی، زۆر سەیرم لێدێ، سەرانی کورد، گلەیی لە « سەددام » دەکەن و ڕەخنەی لێ دەگرن، گوایە: دژی گەلەکەی خۆی وەستاوە و چەکی کیمیاویی بەکارهێناوە! ئاخر، جگە لەوەی، کورد گەلی ئەو نەبووە و نییە، گەر سەرکردەیەک، نزیکترین کەسەکانی دەورووبەری خۆی کوشتبێ، بە دەیانی

وەک: « عەدنان خەیروڵڵا تولفاح »ی کوڕەخاڵ و ژنبرای، بە پیلان لەنێوبردبێ، جووتە برا و زاوای کچەکانی « حوسێن کامیل » و « سەددام کامیل »ی گوللەبارانکردبێ، ئەمەکی بۆ « ئەحمەد حەسەن بەکر » و هەڤاڵەکانی دیکەی، ڕێی خەباتی ڕۆژی نهێنیی و تەنگانە نەبووبێ، کە ئەوان نەک هەر عەرەب بوون، بەڵکوو، خزمی خۆی و ئەندامی پارتەکەشی « بەعس » بوون، ئیدی دەبێ، گللەیی چی لەو پیاوە نەخۆشە فاشیستە بکەن؟!!

جا با بزانین، « سەددام » لە نێوان دوێنێ و ئەوڕۆدا، چۆن بووە؟ کۆمەڵانی خەڵک، سەرکردەکانی عەرەب و کورد، بە چ چاوێ تەماشایانکردووە؟

ئەز، لێرەدا هەر هێندە دەڵێم: یا خوا، کەس لێی نەقەومێ! چونکە، وەک عەرەب گوتوویەتی: کاتێ مانگا کەوت، چەقۆ زۆر دەبێ! ئاخر، تا دوێنێ بوو، « سەددام »، لای ئەندامانی « بەعس »، ڕابەربوو. لە « عێراق »دا، هەموو دەسەڵاتێکی بەدەسەوەبوو. لە نێو دەزگە نێودەوڵەتییەکانی جیهانیشدا، بە فەرمیی، سەرۆک کۆماری دەوڵەتێکی بەهێزی دەوڵەمەندی وەک « عێراق » بوو. هیچ میر، شا و سەرکردەیەکی عەرەبیش نەیدەوێرا، پێی بڵێ: پشتی چاوت برۆیە! کەچیی ئەوڕۆ، لە قوژبنی گرتووخانەیەکی نهێنیی و لە ژوورێکی چەن مەترییدا لێی کەوتووە، جگە لە دوژمنەکانی، هیچ کەس و لایەنێکی دیکە نابینێ و لێی ناپرسنەوە! هەموو ئەوانەشی دوێنێ لێی دەترسان، ئەوڕۆ، قسەی سارد و سووکی پێ دەڵێن!

ئاخر، تا دوێنێ بوو، سەرکردەی پارتەکانی « کوردستان »یش، هەر یەکەیان، بە جۆرێ ناویاندەبرد و پێیاندا هەڵدەدا! خۆ ناشــــێ، بیرمان چووبێتەوە، « جەلال تاڵەبانیی » دەیگوت: « سەددام حوسێن » دوژمن نییە، بەڵکوو ناوبژیوانە! کەچیی، لە « ئیتالیا » گوتی: یەکێ لە هەرە تاوانبارە ڕەشەکانی جیهانە، لە « هیتلەر » و « مۆسۆلۆنیی » خراپتربووە!

هەروەها « مەسعوود بارزانیی »، جگە لەوەی کاتی خۆی بە « سەیید ڕەئیس » ناویدەبرد و ڕۆژی « **31 .08 .1996** »، نامەی بۆ نارد، تا، لە مەترسیی هێزەکانی « یەکێتیی » و « ئێران » بیپارێزێ، بە ئەندازیاری ڕێککەوتننامەی « **11/مارس/1970** »ش باسیکردووە و ئێستەش، بە دیکتاتۆر ناویدەبا!

لە ڕاستییدا، « سەددام » ڕۆژێ لە ڕۆژان، « ناوبژیوان » و « ئەندازیار » نەبووە، بەڵکوو، تەنیا هەر، یەکێ لە دوژمنە هەرە گەورە و سەرسەختەکانی نەتەوەی کورد و گشت کۆمەڵگەی مرۆ بووە. بەڵام، بە داخێکی گرانەوە، ئەو سەرکردانەی کورد، کاتێ « سەددام » دەسەڵاتی هەبوو، بە سەریاندا هەڵداوە و ئێستەش، وای پێ دەڵێن!

ئاشکرایە، ئەم ڕۆژە ڕەش و چارەنووسە خراپە، دووچاری هەموو دیکتاتۆرێ دەبێ. لەبەرئەوە، چارەنووسی هیچ زۆردار و تاوانبارێ، لە چارەنووسی « سەددام حوسێن » باشتر نابێ، گەر خراپتریش نەبێ! هەموو سەرکردە زۆردار و بێ ویژدانەکانیش، لێیاندەقەومێ و بە سزای دادپەروەرانەی گەل دەگەن. چونکە، هەموو مرۆڤێ، سەراپای ژیانی، لە کەوتن و هەڵسانەوە، سەرکەوتن و ژێرکەوتن پێکهاتووە، هەر وەک ئیمامی « عەلی »ش فەرموویەتی: ڕۆژێ لە تۆیە و ڕۆژێکیش دژی تۆیە! «4»

جا، سەرکردەی هەر پارت و گەلێکی دیاریکراو، گەر کەمێ ژیربێ، دەبێ، کاتێ دەسەڵاتی هەبوو، لە خووڕەوشتی دیکتاتۆرانە دوورکەوێتەوە، سەرانسەری وڵاتەکە کۆنترۆڵ نەکا و دۆزەخێکی سوور، بۆ ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆی داخا! بەڵکوو دەبێ، بە هەموو توانایەوە، ڕاژەی ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆی بکا و وڵاتەکەی پێشخا، هەوڵبدا، ئازادیی و دیمۆکراسیی، لە نێو ڕیزەکانی گەلدا بچەسپێنێ، خۆشیی و کامەرانیی ببارێنێ، تا، چارەنووسی وەک چارەنووسی هیچ دیکتاتۆرێ نەبێ!

* * *

---

**تێبینی:**

1. یفعل الله ما یشاء، بین المغرب و العشاء.
2. سوف یوتون مغول العصر علی اسوار مدینه بغداد.
3. ربک یهل و لا یهمل.
4. الدهر یومان: یوم لک و یوم علیک، فاذا کان لک، فلا تبطر. و اذا کان علیک، فاصبر!

# یاسای جەنگەڵ

ئەوەتەی ئەم جیهانە درووستبووە، ململانێیەکی گەورە و نابەرابەر، لە نێوان گیاندارە بەهێز و بێ هێزەکان، دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵاتەکاندا هەبووە. بۆ نموونە: لە نێو دارستانەکاندا، « شێر » لە هەموو ئاژەڵەکانی دیکە، بەهێزتر و بە تواناتر بووە. بۆیە، هەمیشە ڕۆڵی پاشای دارستانی بینیوە و ئاژەڵەکانی دیکەش، لە ڕاژەی ئەودا بوون. لە نێــو زەریاکــاندا، نەک هەر « نەهەنگ »، بەڵکوو، « ماسی »یە گەورەکانیش، « ماسی »یە پچووکەکانیان قووتداوە. لە نێو مەلەکاندا، « هەڵۆ » لە هەموو مەلەکانی دیکە، ئازاتر و بە هەڵمەتتر بووە. لەبەرئەوە، هەمیشە بە سەربەرزیی ژیاوە، بە چنگ و نینۆکە درێژە تیژەکانی خۆی، جەرگ و دڵی مەلە لاوازەکانی دیکەی دەرهێناوە.

لە نێو کۆمەڵگەی مرۆشدا، ئەوەتەی ئەم گەردوونە درووستبووە و مرۆ لە سەر ڕووی زەوی پەیدابووە، هەر مرۆڤە زەبەلاحە گەورە بەهێزە تەندروستەکان، بە سەر مـرۆڤـە گـچکە لاوازە بێ تواناکـانـدا زاڵبـوون، هەمـیـشـە، لە پێناوی بەرژەوەندیی تایبـەتیی خـۆیاندا، بـە هەمـوو شێـوەیە، هەڵیـانـسـووڕاندوون و چەوساندوویاننەتەوە!

جا، کە ئەمە یاسای نێو دارستـان، زەریـا، ئاسـمـان و سـەر زەوی بێ، ئیدی چۆن دەبێ، لەم جـەنگەڵسـتـانـەی ژیـانـی سـەر زەویدا، مـرۆ بێ پشت و دەسـەڵاتەکـان، لە دەس دەسـەڵاتدارەکـان، هەروا بـە ئاسـانیی قـوتـاربن و بە خۆشیی بژین؟!! چۆن دەبێ، هێزدارەکان، بێ لایەن بوەستن و دەسدرێژیی، بۆ سەر ژیانی خەڵکی دیکە نەکەن؟!!

گەر ئـەم چەن نموونانە، گەورەترکەین، سەرنجێ لە باری گرووپە ئیتنیکەکان: « کەمەنەتەوە، گەل و نەتەوە » بدەین، ئەوا زۆر بە ئاشکرا، بۆمـان دەردەکەوێ، هەمان یاسای دارستـان، زەریا و ئاسمانی بە سەردا دەچەسپێ و لەگەڵیدا

دەگونجێ. چونکە، ئەوەتەی مرۆ فێربووە، بە شێوەی کۆمەڵکۆمەڵ بژی، لە یەکدی نزیکبنەوە و لە دەوری ئاگردانێ کۆبنەوە، هەر دەستە و گرووپێ دروستبووبێ، لە بەر هەر هۆیە بووبێ، پەلاماری دەستە و گرووپێکی دیکەی داوە، ئاگردانی کوژاندۆتەوە، کوشتوویەتی و بریویەتی. یا ڕاویناوە، ماڵی تالانکردووە، ژنی لێ زەوتکردووە، لە زێد و نیشتمانی خۆی هەڵیکەندووە و دەستی بە سەر خاکەکەیدا گرتووە. ئەم ڕەوشتە دزێوەش، مرۆ لە ئاژەڵی کێویی و گیانداری دڕندەی دارستانەکان نزیکدەکاتەوە. بۆیە، تا ئەورۆ، وازی لێ نەهێناوە و تا ئەم سەر زەوییەش بە تەواویی، ژێر و ژوور نەبێ، ناتوانێ، وازی لێ بێنێ. چونکە، هەڵپەی ژیان، بەرژەوەندیی ئابووریی، بیرکردنەوەی خراپ و ئیرەیی، کارێکی گەلێ خراپی، لە بیر و هۆشی کۆمەڵگەی مرۆ کردووە و بە شێوەیەکی بەردەوامیش، کاریتێدەکا!

لە بەر ڕۆشنایی ئەم یاسایەدا، ئەوەتەی نەتەوەی کورد، دەسەلاتی ڕامیاریی و فرمانڕەوایی ئیمپراتۆریای « میدیا »ی لەدەسداوە، لەو ڕۆژەوە تا ئەورۆ، لە ژێر باری داگیرکردن، دابەشکردن، ژێردەسیی و چەوساندنەوەدا دەناڵێنێ.
هەر داگیرکەرێ هاتبێ، چ دراوسێی بووبێ، چ لە دوورەوە هاتبێ، بە خراپترین شێوە، پەلاماری نیشتمانەکەی داوە، پیاوەکانی کوشتووە، کیژ، ژن و منداڵەکانیشی، لەگەڵ سامانەکەیدا، بە تالانبردووە، واتە: « ئەنفال »ی سەر و ماڵی کوردیان کردووە! لەبەرئەوە، داگیرکەران، لە سەردەمە جیاجیاکانی مێژوودا، هەمیشە هەوڵیانداوە، بەشێ یا گشت خاکی « کوردستان » داگیرکەن. بۆ نموونە: هەموو جەنگ و پێکدادانەکانی نێوان ماد و ئاشووریی « 612 پ.ز. »، ماد و هەخامەنشیی « 550 پ.ز. »، گەڕانەوەی دە هەزار سوارەی یۆنانیی بە سەرکردایەتی گزێنۆفۆن « 401 - 401 پ.ز. »، کورد و ئەرمەنیی، کورد و ڕۆمانیی، کورد و یۆنانیی « 330 پ.ز. »، کورد و پارس « 247 - 226 پ.ز. »، کورد و ساسانیی « 226 ز. »، یەکەمین جەنگی نێوان کورد و عەرەب لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا « 640 ز. » هەروەها، هەموو پەلاماردان و جەنگە خوێناوییەکانی « مەغۆل، تەتەر، سەفەویی، قاجاریی، عوسمانیی ... » هەر هەموویان، لە سەر خاکی « کوردستان » بوون. بە شێوەیە لە شێوەکان، نیشتمانەکەمانیان کاول و وێرانکردووە. کێ هێزی زۆربووبێ و کەرەسەی جەنگیی باشی هەبووبێ، ئەو لایەنە سەرکەوتوو بووە و لایەنەکەی دیکەش، لە ژێر دەس و پێدا فلیقاوەتەوە. ئاشکرایە، هەموو جارەکان، هەر داگیرکەران سەرکەوتووبوون و دەسێکی کوشندەشیان، لە ڕۆڵەکانی کورد وەشاندووە!

لەم هاوکێشە پڕ لە گرێوگۆڵاویی و جەنگە سەختانەدا، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، بە تەنیا بوون، هێزیان کەمبووە، کەرەسەی جەنگییان نەبووە، لە نێوخۆدا زۆر ڕێک و تەبا نەبوون، لە نێوچەکە و جیهانیشدا، دۆستی ستراتیژیی و ڕاستەقینەیان نەبووە. تەنانەت ئەوڕۆش، لەم جیهانە سەرقاڵەی بەرژەوەندیی « پیترۆ ـ دۆلار »ی نێو دەوڵەتانیشدا، کورد وەک ڕووەکی بەر سێبەر وایە، تیشکی ڕۆژی ناگاتێ و بەری ناکەوێ، دەستی یارمەتیی بۆ درێژ ناکرێ. لەبەرئەوە، هەوڵێکی زۆر دەدا، بە هەر شێوەیە بێ، ئەو کەموکوڕییە پڕکاتەوە، لە دەس داگیرکردن و چەوساندنەوەی نەتەوەیی ڕزگاربیێ، وەک هەموو نەتەوە سەربەخۆکانی دیکەی سەر ڕووی ئەم زەوییە، دوور لە یاسای جەنگەڵەوە، بە هێمنیی و سەربەستیی بژی.

# مرۆڤی کورد،
# بێ بایەخترین سەرمایەیە!

تیرۆریستە عەرەبەکانی « عێراق »، چەن هاووڵاتییەکی دەوڵەتە بیانییەکانیان فڕاند، تا، لەگەڵ لێپرسراوانی دەوڵەتەکانیاندا، دانوستانیان پێ بکەن. بەڵام، ئەوان بە دەم داواکانیانەوە نەچوون. لەبەرئەوە، لە ملیان دان و سەریان لە جەستەیان جیاکردنەوە. یەکێ لەوانەی فڕێندرابوو، ناوی « کیم سێن ئێل » بوو، خەڵکی « کۆریای باشوور » بوو. لە کۆمپانیایەکی « ئەمێریکایی » کاریدەکرد. ماوەی سێ ڕۆژیان بۆ دانا، هیچ کەس و لایەنێ، وەلامی تیرۆریستانی نەدایەوە. لەبەرئەوە، کوشتیان و لە ماڵپەڕێکی ئینتەرنێتدا، بە سەربڕاویی پیشانیاندا.

کاتێ، تەرمەکەیان بۆ وولاتەکەی خۆی بردەوە، هاوزمانەکانی، ژن و پیاو، بە جلی ڕەشەوە، بە دڵی پڕ لە خەمەوە، بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە، پێشوازییان لە تەرمەکەی کرد، وەک ئەوەی، برا، باوک یا مێردی خۆیان سەربڕابێ!

کەچیی، ڕۆڵەکانی کورد بە گشتیی و سەرانی کورد بە تایبەتیی، ژیان و گیانی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆیان، هێندە لا هەرزانە، جگە لەوەی، بە هەزاران کوردیان، لە جەنگی نێوخۆی هەموو لایەنەکانی « کوردستان »ی مەزندا بەکوشتدا، جگە لەوەی، پارتەکانی « کوردستان »، چەندین کەسیان تیرۆرکرد، پەلیان بۆ پارچەکانی دیکەی « کوردستان »یش هاویشت، لە گیانی برا کوردەکانی ئەوێش بەربوون و زرمەیان لێ هەستاندن! بەڵکوو، هەر بەوەشەوە نەوەستاون، ڕاژەیەکی زۆر و بێ تامی، دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان »یشیان کردووە، هەر زووزوو، لەشکری داگیرکەرانی ئەم

دەوڵەتیان، بۆ سەر ئەو پارتی بەشەکەی دیکە، یا، سوپای داگیرکەری ئەو دەوڵەتیان، بۆ سەر ئەم پارتی پارچەیەکی دیکەی « کوردستان » بردووە. پێش لەشکرەکانیان کەوتوون، وەک تولە و تانجی، ڕاوە کوردی پارچەکانی دیکەیان بۆ کردوون، تەنیا هەر بۆ ئەوەی، دڵی سەرانی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەیان لێ ڕازیبێ!

سەرەڕای ئەوەی، خۆمان لە نێوخۆماندا ڕێک نین و وەک کەوی خۆخۆر، لە گیانی یەکدی بەربووین، هێزی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان »یش، بە هیچ شێوەیە، وازیان لێ نەهێناوین و وازیشمان لێ ناهێنن. بۆیە ڕۆژانە، چەندین ڕۆڵەی کورد دەکوژن. هەر بۆ نموونە: دوازدە لاوی کوردی خەڵکی « خانەقین »، لە مەشقی سەربازیی گەڕابوونەوە، لە شاری « باقووبە »، بە دەسی عەرەبە داگیرکەرەکان گوللەباران کران! ڕۆژی « 19 .09 .2004 »، ماسمیدیاکانی کوردیی و جیهان، هەواڵی جەرگبڕی سەربڕینی سێ کوردیان ڕاگەیاند. بەڵێ، ئەم جارەش سێ لاوی کوردی خەڵکی شارۆچکەی « زاخۆ »، هەر لەبەرئەوەی کورد و ئەندامی « پارتی دیمۆکراتی کوردستان » بوون، ئیسلامە تیرۆریستەکانی عەرەب، کەللەی سەریان بە شمشێری ئیسلامیی عەرەبیی پەڕاندن! ڕۆژی « 09 .10 .2004 »، لە گەڕەکی « کەرامە » لە شاری « مووسڵ »، هەشت کورد بە دەسی تیرۆریستە عەرەبەکان کوژران. هەروەها، ڕۆژی « 11 .02 .2005 »، تەرمی شەش کوردی دیکە، بە شێوێندراویی، لە گەڕەکی « سەلامییە »، لە « مووسڵ » دۆزرایەوە.

بە کورتیی: کەم ڕۆژ هەیە، چ لە « کوردستان » و چ لە « عێراق »، کوردێ بە سزای مەرگ نەگەیەنرێ! تەقە لە ترۆمبێلی خەڵکی شارەکانی « باشووری کوردستان » نەکرێ و کورد نەکوژرێ. زۆربەی ڕێکخراوە ئیسلامییە تیرۆریست و کۆنە « بەعسیی »یەکان، هەر بە شێوەیەکی فەرمیی، خوێنی ڕۆڵەکانی کوردیان حەلاڵکردووە، ئەمەشیان نەشاردۆتەوە و بە ئاشکرا، لە بڵاڤۆک و گوتەکانیاندا بڵاویانکردۆتەوە. ئیدی با « عێراقچیی »یەکانی کورد، هەر چەپڵە بۆ برایەتی درۆزنانەی کورد و عەرەب بکوتن، بەڵکوو، لەو چڵکاوخۆریی و نۆکەرییەی بۆ ئاغاکانی عەرەبی دەکەن، چەن میلیۆنێ دۆلار و دیناریان چنگکەوێ!

ئەم دەردی کوردقڕانە، دوو لایەنی گرنگی هەیە: هەم عەرەبەکان بە هەموو باڵەکانیانەوە، دژی کوردن و بڕیاری جینۆسایدی گەلی کوردیان داوە. هەم ڕۆڵەکانی کوردیش، کەسیان نییە، تا داکۆکییان لێ بکا. چونکە، سەرکردایەتی ڕامیاریی « پارتیی » و « یەکێتیی »، وەک بەنگکێش وان،

ئەندێشەی برایەتی درۆزنانەی کوردی داگیرکراو و عەرەبی داگیرکەر، لە کەللەی سەری داون و دوای تراویلکەی بێ کۆتایی « عێراقچێتیی » کەوتوون، تۆ بڵێی، لەم سەدەی بیستویەکی « ئینتەرنێت » و « جیهانگیریی »یەدا بیگەنێ؟!!
ئاخر، گەر مرۆڤی کورد، بێ بایەخترین سەرمایە نەبێ، هەڵبەتە، لەم جیهانەدا یەکێ دەبێ لە سەری هەڵباتێ. ئەوەتە، توورکەکان لە « توورکیا »، خۆپیشاندانێکیان دژی « ئەمێریکا » سازکردووە، گوایە: پاکتاوی ڕەگەزیی لە « فەللووجە » دەکەن. هەروەها، کاتێ تیرۆریستە عەرەبەکان، لە « تەلەعفەر » خۆیان حەشاردابوو، هێزەکانی هاوپەیمان بە توندیی لێیاندان، توورکەکان ناڕەزایی خۆیان دەربڕی، گوایە: ئەو دەڤەرە، دەڤەرێکی توورکمانە و قەبووڵ ناکەن، توورکمان بکوژرێ! بەڵێ، تەنانەت توورکمانیش، کەسێ هەیە، لە سەری هەڵباتێ! لە کاتێکدا، نزیکەی یەک سەدە دەبێ، هەر ئەو توورکە زۆر موسوڵمانانە خۆیان، پاکتاوی ڕەگەزییان، دژی هەموو گەلانی نێو چوارچێوەی « توورکیا » کردووە، کەچیی، دەنگ لە بەردەوە هاتبێ، دەنگ لە یەک توورکی موسوڵمانی شۆڤێنیی داگیرکەرەوە نەهاتووە!
بۆیە، باشتر وایە، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، لە وڵاتە کاولبووەکەی خۆیاندا بژین، هێندە هەڵپەی پارە و پلەوپایەی دەرەوەی وڵاتی خۆیان نەکەن و مانیان نەدا، لە پێناوی چەن هیوایەکی بێ بنچینەدا، سەری خۆیان بە برین بدەن! چونکە، لە لایەکەوە، کەسیان نییە، داکۆکییان لێ بکا و بیانپارێزێ. لە لایەکی دیکەشەوە، تا ئەوان، باوەڕ بە برایەتی درۆزنانەی نێوان کورد و عەرەب بکەن، لە سەرپەڕاندنی پتر، هیچی دیکەیان دەس ناکەوێ، هەر کوردێکیش، ئەم ڕاستییە ساکارە نەزانێ، گوناح و تاوانەکەی، لە ملی خۆی دایە!
ئاشکرایە، لە مێژوودا، هیچ داگیرکەرێ نەبووە، هەروا بە خۆڕایی، لە ڕایی خوا و برایەتی نێوان گەلاندا، دان بە مافە ڕەواکانی گەلەکەی بندەسیدا بنێ. هیچ گەل و نەتەوەیەکی ژێردەس، بە چەپڵەکوتان و هەلهەلەلێدان، بۆ برایەتی نێوان هەر دوو گەلە سەردەسەکە و بندەسەکە ڕزگاری نەبووە. بەڵکوو، تەنیا هەر، لە ڕێی خەباتی ڕامیاریی و چەکداریی درێژخایەنەوە، گەلە بندەسەکان ڕزگاریانبووە، دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان دامەزراندووە، لە کۆڵ داگیرکردن و چەوساندنەوەی نەتەوەیی بوونەتەوە! هەر بۆ نموونە دەڵێم: گەلی عەرەبی « جەزایر »، دوای یەک میلیۆن شەهید، لە دەس ئیمپریالیزمی دێمۆکراسییخوازی « فرەنسە » ڕزگاریبوو. ڕۆڵەکانی گەلی « ڤێتنام »ی

قارەمان، نزیکەی چوار میلیۆن قوربانییاندا، ئینجا، لە کۆڵ ئیمپریالیزمی « ئەمێریکا » بوونەوە. هەروەها، گەلانی دیکەی وەک: « هیندستان، ئەریتریا، کەمبۆدیا، لاوس، ڤێتنام، بۆسنە و هەرسک، کەرواتیا، بەنگەلادیش ... » هەر بە هۆی خەباتێکی سەختی بێ وچانەوە بوو، بە ئامانجە نەتەوەییەکانی خۆیان گەیشتن!

ئەوڕۆش، سەرانی پارتەکانی « کوردستان »، ڕۆڵەکانی کورد چەواشەدەکەن، هەڵیاندەخەڵەتێنن، لە پێناوی ئامانجە تەسکەکانی پارتە تایبەتەکانی خۆیاندا دەکۆشن، کوردایەتی ناکەن و باوەڕیان بەو برایەتییە درۆزنانەیە هەیە، کە هەشتا ساڵە، گەلی عەرەبی داگیرکەر لە « عێراق »دا، « ڕوباره »مان بۆ لێدەدەن، بێ ئەوەی، هیچ ئەنجامێکی چاک و هەستپێکراوی هەبێ.

سەیر ئەوەیە، چەندین ساڵ دەبێ، سەرانی کورد نەیانوێراوە، لە ڕۆڵەکانی گەلی کوردی « باشووری کوردستان » بپرسن، ئایا، ئێوە چیتان دەوێ؟ ئایا دەتانەوێ، وەک مرۆڤ بە ئازادیی و لە ژێر ئاڵای دەوڵەتێکی سەربەخۆی دیموکراسیی « کوردستانیی »دا بژین، یا، تا ماون، لە گرتووخانەی دەوڵەتە داگیرکەرەکەی « عێراق »دا، بە سەرشۆڕیی بژین و بناڵێنن؟!! ئاخر، هەر ئەوان بوون، دروشمی نارەسەنیان بۆ داتاشیون، جۆری بیرکردنەوە، شێوازی خەبات، چۆنێتی ژیانیان بۆ دەستنیشانکردوون و بە سەریاندا سەپاندوون!

بەڵام ئەوڕۆ، سەردەمەکە گۆڕاوە، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، چاویانکراوەتەوە و زۆر شت فێربوون. بۆ نموونە: لەو « ڕێفراندۆم »ە نافەرمییەی ڕۆژی « 2005. 01. 30 »، لە زۆربەی هەرە زۆری، نێوچەکانی « باشووری کوردستان » کرا، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، بۆ سەرکردایەتی ئەو پارتانە و گەلانی جیهانیان سەلماند، « 98٪ »ی کورد، سەربەخۆیی دەوێ و چی دیکەی ناوێ، بە هیچ شێوەیە نایەوێ، لەگەڵ گەلی عەرەبی داگیرکەردا، لە چوارچێوەی یەک دەوڵەتدا بژی!

بۆیە، لە کاتێکدا، داوا لە ڕۆڵەکانی گەلی کورد دەکەم، چی دیکە، بە قسەی سەرانی پارتەکانی « کوردستان » هەڵ نەخەڵەتێن، ڕێکخراوی تایبەتیی و نهێنیی خۆیان دامەزرێنن، لە هەر شوێنێکی « کوردستان »، بە دەسی عەرەبە داگیرکەرەکان، خوێن لە لووتی منداڵێکی کورد هات، خوێن لە جەستەیان بێنن. ئەمەش، لەگەڵ هەموو باوەڕ و فەلسەفەیەکی زەمینیی و ئاسمانییدا دەگونجێ. چونکە، خوا فەرموویەتی: چاو بە چاو و دان بە دان.* دەبا ئێمەش، هەر بە ئایەتی قورئانەکەی خۆیانیان لەگەڵ بکەین، هەر بەو دەرمانەی خۆیان، دەردەکانمان تیمارکەین.

شتێکی زۆر دڵخۆشکەر بوو، کاتێ، لە سەر لاپەرەکانی تۆڕی ئینتەرنێت، هەواڵی دامەزراندنی ڕێکخراوی « تۆڵە »م خوێندەوە. ئەم ڕێکخراوە، کۆمەڵە گەنجێکی کورد دایانمەزراند، بەو نیازەی، گەر سەرکردایەتی هەر دوو هێزی گەورەی کورد: « پارتیی » و « یەکێتیی »، تۆڵەی ئەو کوردە سەربڕاو و کوژراوانە نەکەنەوە، سنووری بۆ ئەو ڕووبارە خوێنە دا نەنێن، ئەوا، ئەوان تۆڵەی بەردوای شەهیدەکانمان دەکەنەوە. بەڵام، هەر لە سەرەتاوە دیاربوو، تەنیا هەڕەشە نەبێ، هیچی دیکە نییە. چونکە، پێش ئەوەی، ڕێکخراوەکە ڕاگەیەنن، دەبووایە، دەستێکی باشیان بوەشاندایە، ئینجا، خۆیان ڕاگەیاندایە. بە داخەوە، هەر واش دەرچوو، وەک چاوەڕێم دەکرد، نە هیچیان کرد و نە هیچی دیکەشی بە دوادا هات!

هیوادارم، لە ئاییندەدا، هەر ڕێکخراوێکی کوردیی دروستبێ، پێش ئەوەی، خۆیان ڕاگەیەنن، دەستێکی باش، لە دوژمنە سەرەکییەکانی کورد بوەشێنن، تۆڵەسەندنەوە، تەنیا هەر، بە قسە و بلاڤۆک دەرکردن نەبێ، بەڵکوو، بە کردەوە بێ و تۆڵەی ئەو هەموو کوردە کوژراوانە بکەنەوە. یا، تۆڵەی بەچکەشێرانی ئەم جارەی کورد، چی دیکە ئارام نەگرێ و زەبری خۆی بوەشێنێ، عەرەبە داگیرکەرەکان، لە نێوچە بەعەرەبکراوەکانی « باشووری کوردستان » بەدەرنێن و بەهێزی چەک ڕاویانێن. چونکە، لەم ڕۆژە باشتر، هەلی لە بارترمان دەس ناکەوێ. بەڵام، داواکاریم لە هەموو لایەک ئەوەیە، دەسی خۆیان بوەشێنن، بێ ئەوەی، هیچ ڕاگەیاندنێ بڵاوکەنەوە و ناوی بێنن، چونکە، داگیرکەر خۆی دەزانێ، کێ خاوەن مافە، کێ ڕاوی دەنێ و دەیکوژێ، پێویست بەوە ناکا، تێیانگەیەنین، کورد ئەو کارەی کردووە!

* * *

---

* العين بالعين و السن و بالسن.

# شێوازی په‌روه‌رده‌کردن

« 1 »

له هه‌موو شار و شارۆچه‌که‌کانی ووڵاته دیمۆکراسیی و پێشکه‌وتووه‌کانی کیشوه‌ره‌کانی « ئه‌وروپا، ئه‌مێریکا و ئوستڕالیا »، به سه‌دان مه‌لی ئێسکسووک، باڵداری جوان و ئاژه‌ڵی ماڵیی خنجیلانه، له سه‌ر جاده و نێو باخه‌کان بڵاوبوونه‌ته‌وه. له لایه‌که‌وه، دیمه‌نی ئه‌و شوێنانه‌یان جوانترکردووه.
له لایه‌کی دیکه‌شه‌وه، هێنده هۆگری مرۆ بوون، لێی دوور ناکه‌ونه‌وه.
کاتێ مرۆ، به نێو پۆله کۆترێکی شینکه‌ی تێکسمڕاوی فریشته‌ئاسادا تێپه‌ڕده‌بێ، نه‌ک هه‌ر هه‌ڵ نافڕن و له شه‌ققه‌ی باڵ نه‌ده‌ن، به‌ڵکوو، هه‌ر ئه‌وه‌ش نییه، دڵدارییی له‌گه‌ڵ هاتوچۆکاراندا ناکه‌ن! سه‌یر ئه‌وه‌یه، به نێویاندا ده‌ڕۆی، نه‌ک هه‌ر ناترسن، به‌ڵکوو، لێت نزیکده‌که‌ونه‌وه و شه‌ڕیشت پێ ده‌فرۆشن، گه‌ر که‌مێ خواردنیشان بده‌یتێ، له سه‌ر ده‌س و شانت ده‌نیشنه‌وه، خۆیان به ناز ده‌فرۆشن! جاری واش هه‌یه، باڵنده‌یه‌ک، به سه‌ر سه‌ری مرۆدا، هێنده نزم ده‌فڕێ، هه‌ر ئه‌وه‌یه، خۆی پێدا ناکێشێ، مرۆ بێ ئه‌وه‌ی هه‌ستیپێبکا، ناچار ده‌بێ، خۆی دانه‌وێنێ!
که‌چیی، له « کوردستان »، نه‌ک هه‌ر کۆتری گوێسه‌بانه و چۆله‌که‌ی سه‌ر چڵی سه‌وزی دره‌خت، به‌ڵکوو، سه‌گ و پشیله‌ی کۆڵانه‌کانیش ناوێرن، له مرۆ نزیککه‌ونه‌وه! ئه‌مه بۆ چی وایه؟ خۆ هه‌موویان هه‌ر مه‌ل و ئاژه‌ڵیان ناوه!!
ئاخر، مه‌ل و ئاژه‌ڵه‌کانی ئه‌و ووڵاتانه، باش ده‌زانن و تێگه‌یشتوون، کۆمه‌ڵانی خه‌ڵک، به‌زه‌یییان پێیاندا دێته‌وه، برسیی نین، تا په‌لاماریانبده‌ن، بیانگرن، سه‌ریانبڕن و بیانخۆن. به‌ڵکوو خواردنیشیان بۆ ده‌کڕن و پێشکه‌شیشیان ده‌که‌ن! به‌ڵام، مرۆڤی کورد، نه‌ک هه‌ر به‌زه‌یی به مه‌ل و ئاژه‌ڵدا نایه‌ته‌وه، به‌ڵکوو، به‌زه‌یی به هاوزمان و هاوخوێنه‌کانی خۆشیدا نایه‌ته‌وه!

شتێکی سەیر نییە، گەر ڕۆژی « 06 .08 .2004 »، پتر لە سی « دۆلفین »، لە یەکێ لە کەنارەکانی زەریای « ئەمێریکا » ڕیزکرابوون، هەرچەندە نازانم، خۆیان هاتبوون، یا هێنرابوون. بەڵام، گرنگ ئەوەیە: ئەو خەڵکە بە کۆمەڵ، هێندە بە پەرۆشەوە خەریکیانبوون، ڕاژەیاندەکردن، خواردنیاندەدانێ، بە دەوریاندا دەهاتن، بە پەڕۆی تەڕ، دایاندەپۆشین، تا، لەو گەرما زۆرە بیانپارێزن و نەمرن! ئەوانیش، بێ دەنگ لێی کەوتبوون، جووڵەیان لە خۆیان بڕیبوو، وەک ئەوەی، زۆر لەو هەڵسوکەوتەی ئەو خەڵکە ڕازیبن و سووریش بزانن، لە مردن ڕزگاریاندەکەن!

کەچیی، عەرەبە داگیرکەر و موسوڵمانە تیرۆریستەکان، تازە، دەستووری سەردەمی نەزانین پێڕەودەکەن، ملی خەڵکانی بێ تاوان، بە شمشێر دەپەڕێنن و بە چەقۆی تیژ سەریاندەبڕن! بە ڕاستیی، گەر ئەمە خۆی لە خۆیدا، تراژیدیایەکی گەورەی کۆمەڵگەی « خۆرهەڵاتی نێوەڕاست » نەبێ، هیچی دیکە نییە! لەوە دەچێ، زۆرمان مابێ، لە ژیان بگەین و وەک مرۆ بژین!

« 2 »

ئاخر، گەر ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، پەروەردەیەکی نەتەوەیی و نیشتمانیی ڕاستیان هەبووایە، بیریان لە بیانییپەرستیی دەکردەوە؟!! خۆیان بە نۆکەر دەزانی؟!! هەستی خۆ بە کەمزانینیان لا بەهێز دەبوو؟!! سووکایەتییان بە خۆیان و هاوزمانەکانیان دەکرد؟!! سەیر ئەوەیە، دوای ئەم هەموو داگیرکردن، چەوساندنەوە، کوشتن و بڕینەی کورد، تازە، بۆ نەگبەتی گەلی بندەسی چەوساوەی کورد، کۆمەڵێ خوێندەوار و خوێندکار، پشتیان لە گرفت و چەڵەمەکانی گەلەکەی خۆیان کردووە، « عێراقچێتیی » خۆیان ڕاگەیاندووە، ڕێکخراوێکی « عێراقیی »یان، بۆ لاوانی کورد، عەرەب و کەمەنەتەوەکانی « عێراق » دامەزراندووە!

بەڵێ، ڕۆژی « 09 .07 .2004 »، کۆمەڵێکی نادیار، « ڕێکخراوی لاوانی پێشکەوتنخوازی سەربەخۆی عێراق »یان ڕاگەیاند، بێ ئەوەی، بە یەک وشەش، باسی باری بندەسیی کورد و مافە ڕەواکانی بکەن! هەڵبەتە، ئەو کۆمەڵە کوردەی لەو ڕێکخراوەدا کۆبوونەتەوە، پێش هەموو شتێ، نیشتمانەکەی خۆیان بیرچۆتەوە، بۆیە « کۆمەڵەی لاوانی سەربەخۆی کوردستان »یان دا نەمەزراندووە!

جگە لەوەی، پێشکەوتنخواز چی دەگەیەنێ؟!! ئایا، ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان « 16 - 40 » ساڵان دایە، گەر پێشکەوتووخواز نەبن، لە ڕیزەکانی ئەو

ڕێکخراوەدا جێیان نابێتەوە و وەر ناگیرێن؟!! پاشان، بۆچی ئەو ڕێکخراوە، لەم کاتە ناسک و لە شاری « کەرکووک » بە تایبەتیی دامەزراوە، گەر دەستێکی تێکدەری لە پشتەوە نەبێ؟!! ئەوە لەبری ئەوەی، ئەو هەموو کوردە « پێشکەوتنخواز » و « سەربەخۆ »یانە، هەموو پێکەوە کۆببنەوە و هەوڵبدەن، هەموو کۆمەڵەکانی لاوانی « کوردستان »، لە یەک ڕێکخراوی یەکگرتووی « کوردستانیی » بەهێزدا کۆکەنەوە، کەچیی، تازە دوای پتر لە هەشتا ساڵ « عێراقچێتیی »، بیانییپەرستیی بێ بەر و بێ کەڵک، کۆمەڵێ کوردی سەرلێشێواوی نەناسراو، باسی « پێشکەوتنخواز »، « سەربەخۆ » و دەوڵەتی داگیرکەری عێراق »مان بۆ دەکەن؟!! دەبێ، ئەم تێکۆشەرە دەسرەنگینانە، تا ئێستە، لە چ سەرەنوێلکێکی مێژووی چەوساندنەوەی کورددا، خەوی بێداریی و نەزانینیان لێ کەوتبێ، وا خەبەریانبۆتەوە و هیچ ڕێکخراوێکی کوردیی و « کوردستانیی »یان بە دڵ نییە، بە چاکیان نازانن و ڕێکخراێکی نامۆی نوێی « عێراقچێتیی »یان بۆ ڕۆڵەکانی کورد قووتکردۆتەوە، تۆ بڵێی، ئەمانیش وەک هێندێ خەڵکی دیکە، لە « هاوڕێیانی ئەشکەوت » بەجێمابن؟! ئاخر، گەر ئەمە ماڵوێرانیی، پاشاگەردانیی، سەرلێشێواویی، کزیی و لاوازیی هەستی نەتەوەیی نەبێ، چی دیکە دەگەیەنێ؟!!

هەر بۆ زانیاریی پتر، لێرەدا، دەقی بڵاڤۆکەکەشیان بڵاودەکەمەوە، تا خوێنەری کورد بزانێ، لە لایەکەوە، چییان دەوێ. لە لایەکی دیکەشەوە، بە چ زمانێکی پڕ لە هەڵە و بیانییپەرستانە نووسیویانە، بێ ئەوەی، دەسکاریی شێوازی نووسین و هەڵەی زمانەوانیی بکەم!

## ڕاگەیاندنی ڕێکخراوی لاوانی پێشکەوتنخوازی سەربەخۆی عیراق

لە دوای زیاتر لە ساڵ و نیوێک لە ڕووخانی ڕژێمی بەعس لە کۆمەڵگای عێراقدا گەورەترین گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵاتی ڕوویداوە. زۆربەی ئەو ئاڵوگۆڕ و گۆڕانکاریانەی بەدەر لەویست و ئیرادەی خەڵکی عیراق یان بەدوور لە دەور و ڕۆڵی ئەوان بووە لەوانەش لاوان کە توێژێکی گرنگی ئەم کۆمەڵگایەن لەدیاریکردنی چارەنوسی ئەم کۆمەڵگایە دوورخراونەتەوەو بواریان بۆ نەکراوەتەوە تاکو دەوروڕۆڵی پێشکەتنخوازانەی خۆیان بگێرن.

وانەیەک کە دەبێت لاوان لەم باردۆخە وەریبگرن ئەوەیە کە لاوان دەبێت ماف و داخوازی یەکانی خۆیان بە خەبات و تێکۆشان خۆیان بەدەست بهێنن و دیارە باشترین تێکۆشانی کاریگەر خەباتی ڕێکخراوو بەبەرنامەی ئەوانە بۆ بەدەست هێنانی ئازادی و ماف و داخوازیەکانیان.

لەم روانگەیەوە ئێمە کۆمەڵێک لاو لەشارەجۆربەجۆرەکانی عیراقەوە لەشاری کەرکوک کۆبوینەوە لە بەرواری 2004/7/9 بە مەبەستی دامەزراندنی ڕێکخراوەیەکی لاوان کە بەرگری لە ماف و داخوازیەکانی لاوان بکات و ببێت بەسەکۆیێک بۆ بەرەو پێش بردنی خەبات و تێکۆشانیان.

لەو کۆبونەوەی سەرەوەدا بریاردرا کە ڕێکخراوێکی جەماوەری سەربەخۆی لاوان خۆیان بێت وەکو ڕێکخراوێکی جەماوەری سروشتی کار بکات و خۆی لەو ریکخراوانە جیابکاتەوە کە بەناوی لاوانەوە کاردەکەن و بەڵام هیچ سەربەخۆییەکیان نیەو پاشکۆی ئەو حیزب و لایەنە سیاسیانەن کە دروستیان کردوون.

هەروەها لەو کۆبونەوەیەدا بریاردرا کە هەموو ئەو کەسانەی کە تەمەنیان لە نێوان 16 تا 40 ساڵیدایە بۆیان هەیە ببن بە ئەندامی ئەم ڕێکخراوەیە بەبێ جیاوازی لە سەر بنەمای رەگەزو نەتەوەو مەزهەب و باوەڕو هەموو جۆرە جیاوازیەکی تر.

ئامادەبووانی ئەو کۆبوونەوەیە بە تێکرا لەسەر کۆمەڵێک داخوازی و ئامانجی ئەم ڕێکخراوەیە پێ یان داگرت کە ئەمانی خوارەوە بەشێک لەو داخوازی و ئامانجانەبوون.

1 ـ هۆشیارکردنەوەی بەداخوازی و داواکاریەکانیان و بەرگری لە پێشکەوتنخوازی کۆمەڵگا.

2 ـ پەرەپێدانی ئازادی لاوان و لابردنی ئەو کۆسپ و تەگەرانەی کە ڕێگری لە ئازادی ئەوان دەگرن.

3 ـ دەوربینین لە گۆرینی پرۆگرامەکانی خوێندن بە قازانجی لاوان و خوێندکاران تاکو خوێندگاکان و زانکۆکان ببن بە کەڵبەندی هۆشیاری و دامێنانی نوێخوازی.

4 ـ خەبات بۆ گەشەپێدانی توانای بەدەنی و جسمی لاوان لە ڕێگەی سەپاندنی کردنەوەو دامەزراندنی یانە جۆراوجۆرەکانی تر بەسەر دەوڵەت و دەسەلاتداراندا.

5 ـ خەبات بۆ زەمینە سازکردن و بۆ لێکتێگەیشتنی نێوان هەردوو رەگەزی نێرو مێ لە ناو لاواندا.

6 ـ ..........................................

لاوانی پێشکەوتنخواز

ڕێکخراوی لاوانی پێشکەوتنخوازی عیراق ڕێکخراوی ئێوەیەو بۆ ئەوە دروست بووە کە بەرگری لەداخوازی و داواکاریەکانی ئێوە بکات. ئەم

ڕێکخـــراوەیە بەبێ هێـزو ئیـرادەو هۆشــیــاری و توانای ئێــوە ناتوانێت ئامانجەکانی خۆی بپێکێ و سەرکەوتوویێت. بانگهێشتان دەکەین کە خۆتان لەم ڕێکخراوەیەدا ڕێکخراو بکەن و ڕیزەکانتان یەک بخەن و هیواکانتان یەک دەنگ و یەک ئیرادە بێنە مەیدان.

ڕاگەیاندنی ڕێکخراوی لاوانی پێشکەوتنخوازی سەربەخۆی عیراق
ژمارەی مۆبایل
& 0770151773407701411769
e - mail
lawany - sarbaxoayahoo.com

باشە، با بڵێین، هێندێ ڕاستیی، لە ڕاگەیاندنەکەیاندا هەیە، ئەویش ئەوەیە: هیچ یەکێ، لەو ڕێکخـــراوانەی لاوان و خــوێندکــاران ســەربەخــۆ نین و هەر یەکـەیان، سەر بە لایەنێکی ڕامیـاریی «کــوردســتــانیی »ن، ئەدی نەدەبوو، ڕێکخراوێکی سەربەخۆی « کوردستانیی » بۆ ڕۆڵەکانی گەلی کورد و کەمە نەتەوەییەکانی « کوردستان » دامەزرێنن؟!! هەر دەبێ، ڕێکخراوێ بێ، لە بەر ڕۆشنایی دید و بۆچوونی، بیانییپەرستیی و « عێراقچێتیی »دا بێ؟!!
پاشان، بە چ ویژدان و یاسایەک ڕەوایە، خۆیان بە « پێشکەوتنخواز »، ئەو ڕێکخراوە « کوردستانیی »یانەی دیکەی هەن و چەندین ساڵە خەباتدەکەن، بە دواکەوتوو دانێن؟!! ئەمە، تەنیا هەر ئەوە دەگەیەنێ، ڕەگی پیســـــی گوولیی « عێراقچێتیی »، تا سەر مۆخ و ئێسکی ئەو کۆمەڵە نادیارە ڕۆچووبێ!
یا خوا، دەوڵەتی داگیرکـەری بێ سـەروبەری بێ مـاف و تیرۆرتان پیرۆزبێ!
هەڵبەتە، ئەم کۆمەڵە بیریانچۆتەوە: هەر کەسێ بکا بێگانەپەرستیی، ئاخری هەر دەمێنێ، نووشووستیی!

* * *

* دیارە، ئەم خاڵەی دواییـیـان، زۆر نهێنیی و گرنگ بووە، بۆیە، هێندێ خـاڵیـان داناوە و هیچیان نەنووسیوە!

# نە چەپ و نە ڕاست، بەڵکوو نێوەڕاست

ئەوەی لە زانستی فیزیکەوە فێربووین، ئەوەیە: هەموو تەنێ، چەن نێوچەیەکی جیاوازی دیارییکراوی خۆی هەیە و ژمارەی ئەو نێوچانەش، بەگوێرەی شێوەی تەنەکە دەگۆڕێن. بۆ نموونە: گەر دارێکی درێژ بگرین، لە سێ نێوچەی سەرەکیی جیاجیا، « هەر دوو سەری ڕاست و چەپ و نێوەڕاست » پێکهاتووە. جگە لە نێوەڕاستەکەی، هەر لایەکی دیکەی دارەکە بگرین، « سەربەرەوخوار، سەربەرەوژوور، بۆ لای چەپ، بۆ لای ڕاست ... » بە هەر لایەکدا شۆڕیکەینەوە، بەڵەنسی دارەکە تێکدەچێ. چونکە، گەر لای ڕاستی بگرین، دەبێ، بە لای چەپدا شۆڕیکەینەوە. هەروەها، گەر لای چەپی بگرین، لای ڕاستی، سەربەرەوخوار دەبێتەوە. واتە: هەمیشە، لایەک لە سەرەوە و لاکەی دیکەش، لە خوارەوە دەبێ! بەڵام، گەر چەقی قورسایی دارەکە بدۆزینەوە و نێوەڕاستەکەی بگرین، ئەوا دەتوانین، بەڵەنسێکی باش، لە نێوان ئەم سەر و ئەو سەری « چەپ و ڕاست » دارەکەدا ڕاگرین.

ئەز، لە ژیانی ڕامیاریی خۆمدا، ماوەیەکی زۆر، سەرەداری پارتێکی خاوەن ئایدۆلۆژیای پەرگیرم گرتبوو، بە هەموو شێوەیە، سەرەداری پارت و ئایدۆلۆژیاکانی دیکەم، نەک هەر ڕەتدەکردەوە، بەڵکوو، گەر دەسەڵاتیشم هەبووایە، هەموو سەرەکانی دیکە و نێوەڕاستەکانی داری ئەو پارتانەشم، تێکوپێکدەدا و لە سەرەداری پارتەکەی خۆمدا کۆمدەکردنەوە!

ئاخر، هاوئاهەنگیی نەتەوەیی، کەی بەو شێوەیە پێکدێ؟!! بەڵەنسی ڕامیاریی و پارتایەتیی، چۆن وا درووستدەبێ؟!! بە تایبەتیی، لە نێو ڕیزەکانی نەتەوەیەکی خاک داگیر و دابەشکراوی وەک کورددا، هێندەی دیکە، ڕیزەکانی کۆمەڵەکە، لەتوپەت و پچڕپچڕ دەکا!

بەڵێ، جگە لە سەرەدارەکەی خۆم، ئەو سەری دیکە و نێوەڕاستی ئەو دارانەی دیکەم، بە دوژمنی سەرەکیی خۆم دەزانی. لەگەڵ ئەوەشدا، دژایەتییەکی زۆری نێوەڕاستیشم دەکرد. چونکە، هەمیشە پێم وابوو، گەر هەر دوو سەرەکەی دیکە، ڕاستەوخۆ و بە ئاشکرا دژم بن، ئەوا نێوەڕاست، دووڕوو، درۆزن، هەلپەرست، ئاژاوەچیی و بەرژەوەندپەرست نەبێ، لە فەرهەنگی ڕامیارییدا، هیچ پێناسەیەکی دیکەی بۆ نادۆزرێتەوە! چونکە، نێوەڕاست هەمیشە، بە ئاشکرا و لە سەرەوە، لەگەڵ سەرێک دایە و دەیگوزەرێنێ. بە نهێنیی و لە ژێریشەوە، لەگەڵ سەرەکەی دیکە دایە و دەیگونجێنێ!

بۆیە، من وەک پەڕگیرێ وابووم، چونکە، تەنیا هەر، سەرەداری خۆم دەویست. دژی نێوەڕاست و سەرەکەی دیکەی هەموو دارەکان بووم. کەچیی، نەمدەزانی، نە ئەم سەر بێ ئەو سەر، نە ئەو سەر بێ ئەم سەر، نە هەر دوو سەر بێ نێوەڕاست، نە نێوەڕاستیش، بێ هیچ سەرێکیان دەتوانن، وێنەیەکی ڕاستەقینەی دارەکە بکێشن، قورسایی خۆیان هەبێ و پارسەنگی تایبەتیی خۆیان ڕاگرن. چونکە دارەکە، تەنیا لە یەک بەش پێک نەهاتووە، بەڵکوو، لەو سێ بەشە سەرەکییە پێکهاتووە. لەبەرئەوە، هیچ بەشێکیان ناتوانن، بە تەنیا دارین، هیچ بەشێکیشیان ناتوانن، بەشەکەی دیکەیان بسڕنەوە! کەواتە: پەیامبەری موسڵمانان، پتر لە هەزاروچوارسەد ساڵ لەمەوبەر، بە خۆڕایی نەیفەرمووە: باشترین کارێ نێوەڕاستەکەیەتی!*

بەڵێ، بمانەوێ و نەمانەوێ، لە سەردەمێکی مێژوویی دیارییکراودا، چ لە « کوردستان » و چ لە هەموو وڵاتەکانی دیکەی جیهاندا بوویێ، بیروباوەڕی توندوتیژ، فەلسەفەی پەڕگیر و ئایدۆلۆژیای خوێناویی، کارێکی گەلێ گەورەیان، لە دید و بۆچوونی، کۆمەڵانی خەڵک بە گشتیی و پارتە ڕامیارییەکان بە تایبەتیی کردبوو. هیچ بیر و ئایدۆلۆژیایەک نەبوو، هیچ ڕێکخراو و پارتێ نەبوو، بیر و ئایدۆلۆژیای ڕکەبەرەکەی خۆی بە دڵ بێ، هیچ ڕێکخراو و پارتێ نەبوو، دان بە ڕێکخراو و پارتەکەی بەرانبەری خۆیدا بنێ. چونکە، بەرژەوەندیی نەتەوەیی و نیشتمانیی لە بیرکرابوو، تەنیا هەر، بەرژەوەندیی تەسکی ئایدۆلۆژیا و پارتایەتیی ڕەچاودەکرا. لەبەرئەوە، تەنیا هەر خۆیان بە ڕاست و بەرانبەرەکانیشیان بە هەڵە دادەنا.

بۆیە، نزیکەی نیو سەدە، جەنگێکی سارد، لە نێوان هەموو لایەن و دەوڵەتەکاندا سازبووبوو، ئەو جەنگەش، کۆتایی نەدەهات، گەر، گۆڕانکاریی و ڕووداوە گەورە و گرنگەکانی جیهان نەبووایە، ئاوێکی ساردی، بە پشکۆی گەرمی ئەو ململانێ ئایدۆلۆژیایەدا نەکردایە و بە تەواویی نەیکوژاندایەتەوە.
بەڵام، پاش چی؟!! دوای ئەوەی، بە هەزاران و بگرە، بە میلیۆنان، مرۆڤی تێدا چوو، ئینجا تێگەیشتین، دەبێ، شەقێ لە ململانێی چەپەڵی ئایدۆلۆژیا هەڵدەین، لە پێناوی ئامانج و ستراتیژێکی هاوبەشدا بکۆشین، بۆ ئەوەی، هەموو پێکەوە، بە ئازادیی و ئارامیی بژین، ڕێز لە بید و بۆچوونەکانی یەکدی بگرین، پرینسیپەکانی دیمۆکراسیی پیادەکەین و بیانچەسپێنین!

* * *

---

* خیر الامور اوسطها.

# خۆشەویستیی خاک

پێم وایە، ئەو کەسەی خاکی خۆی خۆشبوێ، خاکیش خۆشیدەوێ. بەڵام، ئەو کەسەی ڕقی لێی بێ و بیفرۆشێ، خاکیش ڕقی لێی دەبێ و سووکیدەکا!
باوەڕ ناکەم، هیچ مرۆڤێکی نیشتمانپەروەر هەبێ، لە زێد و نیشتمانی خۆی دوورکەوێتەوە، ئارامی لێ هەڵ نەگیرێ، تووشی دڵەڕاوکە نەبێ، دڵی خۆشبێ، زۆر سەرکەوتوو و بەختەوەربێ. ئاخر، گەر تاوێ، گوێ بۆ گۆرانیبێژە دەربەدەرەکان ڕادێرین، ئینجا دەزانین، بە چ شێوەیە، گۆرانیی دەچڕن و دەردی دووریی دڵی خۆیان، تێکەڵ بە هونەرە ڕەسەنە بە سۆزەکەیان دەکەن! گەر دەمێ، ئاوڕ لە هۆنراوەی هۆنەرە کۆچکردووەکان بدەینەوە و بیان خوێنینەوە، ئینجا دەزانین، بە چ شێوەیە، هەموو ووشە جوانەکان، بۆ دووریی نیشتمان دەگرین! گەر کەمێ، سەرنج لە چیرۆکی چیرۆکنووسان بدەین، ئینجا دەزانین، چۆن هەموو دید و بۆچوونەکانی خۆیان، سەبارەت بە خۆشەویستیی نیشتمان، لە نێوەڕۆکی دێڕی چیرۆکەکەنیاندا چڕکردۆتەوە! گەر ساتێ، تەماشایەکی تابلۆی هونەرمەندان بکەین، ئینجا دەزانین، ئەندێشەی دووریی نیشتمان، چ کارێکی تێ کردوون و ئەو تابلۆیانەیان چۆن کێشاوە، لە دیمەنە دڵفرێنەکانی نیشتمان بتر، چی دیکە، لە تابلۆکانیاندا ڕەنگدەداتەوە! گەر تۆزێ، لە ڕوخساری زەردهەڵگەڕاوی نیشتمانپەروەرانی دوورە ووڵات بڕوانین، ئینجا دەزانین، تا چەن ڕووناکایی، لە نێو قووڵایی چاوەکانیاندا ماوە!!!

ئاخر، زۆربەی ئەوانەی، لە دەرەوەی وولات دەژین، ڕەنگە، لە هیچ شتێکیان کەم نەبێ و زۆر شتیشیان هەبێ، ژیانیان دابینکرابێ و گیانیشیان پارێزراوبێ. کەچیی لەگەڵ ئەوەشدا، هەر دڵشاد و بەختەوەر نین. بۆ؟ چونکە هەمیشە، بیر لە شتێکی دیکە دەکەنەوە، کە لەم وولاتانەدا نییانە. بەڵێ، بیر لە گەوهەری دار و بەردی نیشتمانەکەیان دەکەنەوە، خەو بە دیمەنی جوان و دڵفرێنی « کوردستان »ەکەیانەوە دەبینن، لەگەڵ یادگار و بیرەوەرییەکانی سەردەمی منداڵیی و گەنجێتییاندا دەژین، لە خۆشیی و شادیی نێو دۆستان و خۆشەویستان بێ بەشن، شەیدای خەندەی سەر لێو، قاقای پێکەنین، نوکتەی خۆش و ڕوویەکی گەشن!
هەڵبەتە، هەر کوردێ، تا دەردی دووریی و نامۆیی نەچێژێ، تیا، تاڵاوی دووریی نیشتمان، بە گەروویدا نەچێ، نازانێ، نیشتمان چەن خۆشەویستە!
ڕەنگە، هاوزمانەکانم باوەڕ نەکەن، گەر بڵێم: لای کوردێکی نیشتمانپەروەر، هەموو ساتێکی دووریی نیشتمان، بە مردنێکی هێواش دەژمێررێ! ئاخر، کوردێ نیشتمانی خۆی خۆشبوێ، چۆن بیر لە هەموو سات و کاتێکی ژیانی ڕابردوو ناکاتەوە؟ چۆن دەتوانێ، سەراپای فیلمی ژیانی ڕابردوو و بیرەوەرییەکانی خۆی، لە سەر پەردەی بیر و هۆشی بسڕێتەوە؟ چۆن دەتوانێ، هەموو گۆرانیی و یادگارەکانی منداڵیی خۆی بیرچێتەوە؟!!
لەبەرئەوە، هێندێ جار دادەنیشم، ماتیی و بێ دەنگییەکی سەیر دەمگرێ، ئینجا، بە چاوی ئەندێشە، هێندێ لەو یادگار و وێنە جوانانەی سەردەمی منداڵیی دەبینم، لە پڕ لە خۆم دەپرسم و دەڵێم: تۆ بڵێی، ئێستەش کۆڵانە تەنگەکانی گەڕەکی « کانیسکان »، هەر وەک خۆی مابێ؟ تۆ بڵێی، مەزارگەکەی « شێخ موستەفا » تێک نەچووبێ؟ تۆ بڵێی، ئێستەش وەک جاران، منداڵان لە بەر « شەخسەکە » کۆبنەوە، بە خۆشیی و پێکەنین، پێکەوە یارییبکەن؟ تۆ بڵێی، ئێستەش پیرێژنە خواپەرستە ئایینداره‌کان، لە پشت کێلی گۆڕەکەی « شێخ مستەفا »وە هەڵترووشکابن و بەرد بە کێلەکەیەوە بنێن، ڕاز و نیازی دڵی خۆیان بگرنەوە، دەم بە نزا و دەس بە یارانەوە، ...
لە دەروازەی پڕ لە میهرەبانیی یەزدان بکەن، داوای ژیانێکی بێ وەی، خۆش، لەشساغ و نانی لێ بکەن؟!! تۆ بڵێی، ئێستەش وەک جاران، لە بەردەم مەزارگە چکۆلانەکەی « شێخ ئەوڵڵا »دا، تۆپی بەربانگی مانگی « ڕەمەزان » بتەقێنن؟ تۆ بڵێی، ئێستەش ئاوی سەرچاوە ڕوونە گەشە سازگارەکەی « کانیسکان »، هەر وا سارد و خاوێن بێ؟ تۆ بڵێی، ئێستەش لە بەردەم دەروازە گەورەکەی سەربازگەی « سولەیمانیی »دا، سەربازێ بە تفەنگێکی

قەمەداری نووکتیژەوە وەستابێ؟ تۆ بڵێی، ئێستەش سـەربازگە گەورەکەی « سولەیمانیی »، وەک ساڵی « 1963 »، خەڵکی بێ تاوانی شار، لە تەویلە پیسەکانیدا لە خۆی بگرێ و سەربازە عەرەبەکان، هەر لەبەرئەوەی کوردن، بیانکوژن؟ تۆ بڵێی، ئێستەش ...، تۆ بڵێی، ...
هێندێ جاریش، هەناسەیەکی سارد هەڵدەکێشم و لە دڵی خۆمدا دەڵێم: تۆ بڵێی، ڕۆژێ بێ، جارێکی دیکە، بە نیشتمانەکەی خۆم شادبمەوە، بە یەکجاریی، کۆتایی بە ژیانی ئاوارەیی و نامۆیی بێنم، بۆ زێد و نیشتمانی خۆم بگەڕێمەوە؟ ئای چەن خۆشدەبوو، کاتێ، شڕوشیتاڵم دەپێچایەوە، بۆ دوا جار، ماڵاواییم، لە ژیانی پڕ لە ساردوسڕی ئەم « ئەورووپا »یە دەکرد و سەرلەنوێ، دابنیشتمایە و بیرەوەریی نوێم، لە سەر لاپەڕە خاوێن و سپییەکانی مێشکم تۆمارکردایە! یا، کۆڵان بە کۆڵان و جادە بە جادەی شارەکەم بگەڕامایە، لە نزیکەوە، یادی ئەو ڕۆژە خۆشانەی منداڵییم بکردایەتەوە! ئاخر، « خودا کەی بێ، خودا کەی بێ، خودا کەی بێ! »*

* * *

---

* لە هۆنراوەیەکی « نالیی »یەوە وەرگیراوە، کاتێ، بە دێڕە هۆنراوەیە گوتوویەتی:
گوتت: « نالیی »، ئەتۆ بڕە، ئەمن دێم
خودا کەی بێ، خودا کەی بێ، خودا کەی بێ! « دیوانی نالیی،710»
هەرچەندە، « نالیی » بۆ یارە شیرینە نازدارەکەی خۆی گوتووە و پرسیاریکردووە، کەی دێ.
بەڵام، ئەز بە واتایەکی دیکە بەکارمهێناوە و مەبەستم ئەوەیە: ئەو ڕۆژە کەی دێ، بگەڕێمەوە؟!!

# جوگرافیا و مێژوو

فاکتەری جوگرافیا و مێژوو، جگە لەوەی، پێوەندییەکی توندوتۆڵی دیالێکتیکییان لە نێواندا هەیە و زۆر بە توندیی، پێکەوە بەسراون، لە هەمان کاتیشدا، لە ژیانی نەتەوەیی و ڕامیاریی هەموو گەل و نەتەوەکانی سەر ڕووی زەویشدا، بە دوو فاکتەری زۆر گرنگ دادەنرێن. هەروەها، ڕۆڵێکی گەلێ گەورە، لە بواری ڕامیاریی و پێوەندیی نێوان، نەتەوەکانی نێوچەیەکی دیاریکراویشدا وازیدەکەن. لەبەرئەوە ناتوانین، باسی جوگرافیا بکەین، گەر لە فاکتەری مێژووی دابڕین، یا بە تەواویی، لە مێژوو تێ نەگەین! چونکە، گەر فاکتەری جوگرافیا، وەک جەستەی مرۆڤێ وابێ، ئەوا فاکتەری مێژوو، وەک سەری وایە!

ڕاستە، فاکتەری جوگرافیا، پتر پێوەندیی بە خاکەوە هەیە و فاکتەری مێژووش، فرەلایەن و بەربڵاوترە. چونکە، هەرچی فاکتەری مێژووە، پێوەندیی بە هەموو جۆرە جوڵەیەکی « نەتەوەیی، ڕامیاریی، کۆمەڵایەتیی، ئایینیی، کەلتووریی، هونەریی، وێژەیی ... »، کۆمەڵێکی ئێتنیکی دیاریکراوەوە هەیە. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ مێژوویەک، لە بۆشایی و هەوادا لەدایک نابێ، بێ فاکتەری جوگرافیا، نانووسرێتەوە و ناناسرێ، بەڵکوو، لە پارچەیەکی جوگرافیایی تایبەتییدا، دروستدەبێ و دەردەکەوێ.

کەواتە: گەر سەرنجێ لە خاکی « کوردستان » بدەین، دەبینین: وەک زاراوەیەکی جوگرافیایی، پێش ئەوەی، مێژووی نەتەوەی کورد هەبێ و بنووسرێتەوە، ئەم خاکە هەر هەبووە. بەڵام، کاتێ کورد، لە سەر ئەم پارچە زەوییە نیشتەجێبووە، وردەوردە، هەموو مەرجەکانی دروستبوونی نەتەوەی، لە خۆیدا کۆکردۆتەوە، هەستی بەوە کردووە، « کوردستان » لانە و جێی ژیانی تایبەتیی خۆیەتی. دواتریش، ناوی خۆی، بە سەر ئەم پارچە زەوییەدا بڕیوە، کە لە مێژە لە سەری ژیاوە، وەک « کورد + ستان »، بە ناوی خۆیەوە تۆماریکردووە و داکۆکیی لێ کردووە. بەڵام، پێش ئەوەی، ئەو ناوەی بە سەردا دابڕێ، مێژووە نەتەوەییەکەی دەسپێکردووە و لاپەڕەکانیشی، بە خوێنی خۆی تۆمارکردووە!

بەڵێ، مرۆ دەتوانێ، لە نێو پێکهاتە و ڕەگەزەکانی جوگرافیادا، چیرۆکی مێژووی نەتەوەیەکی دیارییکراو بخوێنێتەوە. هەروەها دەتوانێ، لە نێو لاپەڕە ڕەش و گەشەکانی مێژووی هەموو نەتەوەیەکیشدا، وێنەی جۆراوجۆر و ڕەنگینی جوگرافیای نیشتمانەکەی خۆی ببینێ. چونکە، سەرچاوەی خۆشەویستیی ڕاستەقینەی نیشتمان، لە جوگرافیای « کانیی، کارێز، چەم، ڕووبار، زەریا، ئۆقیانووس، تولەڕێ، دەشت، شیو، دۆڵ، پێدەشت، هەرد، کێو، چیا و ئەشکەوت ... »کانییەوە هەڵدەقوڵێ. هەروەها، لە نێو لاپەڕەکانی مێژووشدا، بیرەوەریی و خۆشەویستیی، نەتەوەکەی تێدا حەشاردراوە. بۆیە، جوگرافیا و مێژوو، هەر هێندەی یەک گرنگ و خۆشەویستن، وەک ئەوە وایە، وەچەی دایک و باوکێ بن، هەر دووکیان بە سکێ لەدایکبووبن! ئاخر بۆیە، چەن بایەخ بە جوگرافیای خاکەکەم دەدەم، هەر هێندەش، بایەخ بە مێژووی نەتەوەکەم دەدەم! چونکە، چەن نیشتمانەکەم « کوردستان » خۆشدەوێ، هەر هێندەش، نەتەوەکەم « کورد » خۆشدەوێ!

ئیدی چۆن دەبێ، شارێکی گرنگی وەک « کەرکووک »، لە لایەن عەرەب و توورکە داگیرکەرەکانەوە، لە ڕووی جوگرافیاوە لە « کوردستان » داببڕێ، کوردیش خۆی بڵێ: شارێکی « کوردستان »ە بەڵام، لە ڕووی « مێژوویی و نەتەوەیی »یەوە، کوردیی نەبێ. چونکە، مێژوو هەمیشە، بە فاکتەرێکی نەتەوەیی دەژمێررێ، نەک فاکتەرێکی جوگرافیایی بێ!

جگە لەوەی، سنووری « باشووری کوردستان » دەبێ، لە بەر ڕۆشنایی هەر دوو فاکتەرەکەدا دەستنیشانکرێ. واتە: سنوورەکە دەبێ، هەر لە « زاخۆ »وە دەسپێبکا و بە « خانەقین » کۆتاییبێ. زنجیرە چیاکانی « حەمرین »یش، وەک دیوارێکی سروشتیی نێوان، هەر دوو گەلی سەرەکیی عەرەب و کورد وابێ. بۆیە، ئەو ڕووبەرەش، بە موڵکی کورد دادەنرێ، چونکە، لە ڕووی جوگرافیاوە، بەشێ لە « کوردستان »ی گەورە پێکدێنێ. لە ڕووی مێژوویشەوە، ئەوەتەی ئەو نێوچەیە هەیە و ئاوەدانبۆتەوە، کوردی تێدا ژیاوە و زۆربەی هەرە زۆری کورد بوون!

* * *

# دروشم و ئازادیی

«1»

هەر لەو ڕۆژەوە، « پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست » دامەزراوە، سێکوچکەی دروشمی « یەکێتیی، ئازادیی و سۆسیالیستیی » بەرزکردۆتەوە. گوایە: تا ڕۆڵەکانی نەتەوەی عەرەب یەک نەگرن، ئازادیی مەحاڵە و ناچەسپێ. کاتێ یەکگرتن و ئازادییش بەدیهێنرا، ئەوا دەتوانرێ، کۆمەڵگەیەکی سۆسیالیستیی دامەزرێنرێ!

لە ڕاستییدا، ئەم دروشمەی لە سێ زاراوەی ڕامیاریی پێکهاتووە، پارتی « بەعس » بە کردەوە، بە جۆرێکی دیکە چەسپاندوویانە. چونکە، لە ژێر ناوی « یەکێتیی »دا، نەک هەر ڕیزەکانی گەلانی « عێراق »یان لەتوپەتکرد، بەڵکوو، ڕیزەکانی دەوڵەتە « عەرەبیی »یەکانیشیان، پارچەپارچەکرد و تێکدا.

بە ناوی « ئازادیی »یەوە، قزمیان لە هەموو ڕۆڵەکانی گەلانی « عێراق » بڕی، بە دەیان گرتووخانەی ئاشکرا و نهێنییان درووستکرد، بە هەزاران ڕۆڵەی گەلە جیاجیاکانی « عێراق »یان تێدا کۆکردەوە، ئازارێکی زۆریان دان و گەلێکیشیان لێ کوشتن!

بە هۆی دروشمی « سۆسیالیستیی »شەوە، نەک هەر نەیانتوانی، کۆمەڵگەیەکی یەکسان دامەزرێنن، بەڵکوو، کۆمەڵانی خەڵکیان، بە تەواویی لانکرد، ماڵیان تالان و وێرانکردن. خێزان و بنەماڵەی لێپرسراوانیش، لە سەر حسێبی ڕۆڵەکانی گەل، بە تەواویی دەوڵەمەندبوون، لە هەموو خێزان و بنەماڵەیەکی دیکەی « عێراق »یش، باشتر دەژیان!

ئاخر، لە دەوڵەتە سۆسیالیستەکاندا بە گشتیی و دەوڵەتەکانی « خۆرهەڵاتی ئەورووپا » بە تایبەتیی، بە ناوی بەرژەوەندیی چینی پرۆلیتارياوە، چییان بە سەر ڕۆڵەکانی گەلە جیاوازەکانی خۆیان نەهێنا؟!! لە ژێر دروشمی یەکێتی ڕیزەکانی گەلدا، بە چ شێوەیە، کۆمەڵانی خەڵکیان، بە چەندین جۆر تاوانی درۆ، تاوانبارکرد و قڕیاندەکردن؟!! بە هۆی ئازادیی ڕاستەقینەی کۆمۆنیستیی و گاڵتەقینەی بۆرژواوە، چۆن هەناسەیان لە ڕۆڵەکانی گەلەکانی خۆیان بڕیبوو؟!! بە ناوی بیری سۆسیالیزم و یەکسانیی نێوان ڕۆڵەکانی گەلەوە، چییان بە سەر دانیشتووانی ئەو وڵاتانە هێنابوو؟!!

هەروەها، لە « کوردستان »ی لە مەر خۆشماندا و هەر لە سەرەتای شۆڕشی « 11/ سێپتێمبەری1961 »یشەوە، « پارتیی »، چەندین دروشمی بریقەدار و زەقی نەتەوەیی وەک: « کوردستان یا نەمان »ی هەڵگرتبوو. کەچیی، ڕۆڵەی کوردی، لە پێناوی ماقی « ئاناوەندێتیی » و « ئۆتۆنۆمیی »دا بە کوشتدەدا!
لە شـــۆڕشی نوێشماندا، هەموو هێز و پارتە ڕامیارییەکانی « باشووری کوردستان »، داوای « دێمۆکراسیی »یان بۆ « عێراق » دەکرد. کەچیی، لە گوندێکی نیشتمانە کاولبووەکەی خۆیاندا، هیچیان پێکەوە هەڵیان نەدەکرد!
سەیر ئەوەیە، هەموو باڵەکانی بزووتنەوەی کوردایەتیی، دروشمی برایەتیی، تەبایی و یەکێتیی ڕیزەکانی گەلیان بەرزکردبۆوە. کەچیی، لە سێ سەردەمی مێژوویی جیاوازدا، ماوەی « 18 » ساڵی ڕێک، جەنگی کوردکوژیی و کاولکردنی « کوردستان »یان هەڵگیرساند!
ئای « یەکێتیی »، بە ناوی تۆوە، چەن تاوانی گەورە کرا!
ئای « ئازادیی »، بە ناوی تۆوە، چیان بە سەر کۆمەڵانی خەڵک هێنا!
ئای « سۆسیالیزم »، بە ناوی تۆوە، چەن کەسیان برسییکرد و بێ شێو سەریاننایەوە!
ئای « کوردایەتیی »، بە ناوی تۆوە، چییان بە سەر خەڵکی ڕەشوڕووتی کورد هێنا!
ئای « دێمۆکراسیی »، بە ناوی تۆوە، چۆن جوڵەیان لە کۆمەڵانی خەڵک بڕی!
ئای « برایەتیی »، بە ناوی تۆوە، خوێنی چەن ڕۆڵەی کوردیان ڕشت!

## «2»

لە مێژە، بڕوام بەم گوتە پڕ بایەخە هەبووە و چەن جارێکیش نووسیمە: مرۆ بە ئازدیی لەدایکدەبێ، دەبێ، هەر بە ئازادیی بژی و هەر بە ئازادییش بمرێ!
گەر سەربەخۆیی و سەربەستیی ڕژێمێکی دیارییکراو، تەنیا هەر ئەوەبێ، نووزە لە مرۆ ببڕێ، ئەوا، ئەز وەک کوردێ، ئەو دوو « ئۆکسجین »ە گرنگەی ژیانم ناوێ! وەنەبێ، ئەم دید و بۆچوونەم تازە پەیداکردبێ، بەڵکوو، ئەوەتەی لە وڵاتە ئازاد و دێمۆکراسییەکانی جیهان، سەربەستیی و خۆشیی تاکەکانی کۆمەڵم دیوە، ئەوەتەی بۆ ڕوونبۆتەوە، خەڵکی ئەم وڵاتانە، چەن ژیانێکی پڕ لە ئابڕوومەندانە، سەربەرزانە، ئازادانە و بەختەوەرانە دەژین، باوەڕی کۆنی کوردەوارییم لەقبووە و ماوەی پتر لە بیست ساڵ دەبێ، پێم وایە، ئابڕووی هەموو مرۆڤێ، بە ئازادییەوە بەسراوەتەوە! بۆیە، پازدە ساڵ لەمەوبەر، زۆر بە ڕاشکاویی نووسیوومە:(گەر لە دواڕۆژدا، لە هەر پارچەیەکی

« کوردستان »، دەوڵەتێ بۆ کورد سازبوو، دەوڵەتێکی دیکتاتۆریی بوو، ئازادیی و دیمۆکراسیی تێدا نەبوو، هەڵگرانی ئایدۆلۆژیای جیاواز، کەوتنە شەرەتیلای ئایدۆلۆژیا و یەکدیان قڕکرد، « کوردستان »یان لێ کردینە گرتووخانەیەکی گەورە، دەسەڵات و فرمانڕەواییەکی تۆتالیتێرانەیان تێدا دامەزراند، پلورالیزم قەدەغەکرا، ئەوا، گەلێ چاکترە، ئەو دەوڵەتە کوردییە دا نەمەزرێ و چی دیکە، خوێنی خەڵکی بێ تاوان، بە خۆڕایی نەڕێژرێ و نەتەوەی کوردیش، لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی دیمۆکراسیی، دادپەروەر، لە نێو کۆمەڵگەیەکی ئازاد و یەکساندا بژی.)*

ئاخر، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، شۆڕشیان بۆچی بەرپاکرد؟ ئایا، هەر بۆ ئەوەبوو، زۆرداریی نەتەوەیی لەنێوبەرن؟ ئایا، ئامانجەکانی شۆڕش بە گشتیی و شۆڕشەکانی کورد بە تایبەتیی، تەنیا هەر ئەوەبوون، زۆردارێکی بیانیی لەنێوبەرن و زۆردارێکی دیکەی نێوخۆ لە جێی دانێن؟!! دەسەڵاتی دیکتاتۆرێکی بیانیی دەرەکیی، بە یەکێکی خۆماڵیی و ناوەکیی بگۆڕن!

بە ڕاستیی، گەلێکم پێ خۆشە، لە دەوڵەتێکی یاسایی و دیمۆکراسیی، لە وڵاتێکی ئازاد و سەربەخۆ، لە نێو چەن گەلێکی پێشکەوتوو و تێگەیشتووی وەک: « سویسرا »دا بژیم، وەک لەوەی، لە دەوڵەتێکی نەتەوەیی کوردیی بێ یاسا، دیکتاتۆریی، توندڕەو و پەرگیردا بژیم!

ئاخر، مرۆ بۆ خەباتدەکا؟!! لە پێناوی چیدا، خۆی تووشی چەندین چەڵەمە و چەرمەسەریی جۆراوجۆر دەکا؟!! گەر لە بەر خۆشەویستیی خاکی نیشتمان و سەربەستیی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆی نەبێ، سەری خۆی بۆ دێشێنێ، دوژمنێکی زۆر بۆ خۆی بۆ پەیدادەکا، بۆ دەس بە کڵاوی خۆیەوە ناگرێ، تا، ڕەشەبای بەهێزی دوژمنان و داگیرکەران نەیبا؟!!

ئاخر، گەر « بەعس » پارتێکی عەرەبیی و فرمانڕەوای دەوڵەتێکی داگیرکەری « کوردستان » بووبێ، بە هەموو شێوەیە، دوژمنایەتیی کوردی کردبێ، ئەدی پارتە « کوردستانیی »یەکان چین؟!! بۆ دژایەتیی ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆیان دەکەن و لەنێویاندەبەن؟!!

ڕۆڵە دڵسۆز و نیشتمانپەروەرەکانی کورد، هەموو جۆرە دەسدرێژیی و چەوساندنەوەیەکی عەرەبیان قەبوڵکردووە، هەر لەبەرئەوەی، ناپاکیی لە نیشتمانەکەی خۆیان نەکەن، ئابڕووی نەتەوەیی خۆیان بپارێزن. بەڵام، گەر « پارتیی » و « یەکێتیی »، لە پێناوی بەرژەوەندیی تەسکی پارتایەتیی خۆیاندا، ئابڕووی مرۆیی ڕۆڵەکانی کورد بەرن، ئیدی دەبێ، لەگەڵ داگیرکەرانی « کوردستان »دا، چ جۆرە جیاوازییەکیان هەبێ!

ئەز، خەون بە « کوردستان »ێکی سەربەخۆ، ئازاد و دیموکراسییەوە دەبینم، خەون بە پەرلەمانێکی ڕاستەقینە و دەسەڵاتێکی کوردیی بەهێزەوە دەبینم. ئەو خەونانەش، هەرگیز بەدی نایەن، تا، دیموکراسیی ڕاستەقینە پیادە نەکرێ. تا، هەڵبژاردنی ئازاد و خاوێن نەکرێ. تا، دەزگەکانی پەرلەمان و پۆستەکانی میریی هەرێم، بە کەسانی بەهرەدار و شایستە پڕ نەکرێنەوە. تا، ڕێز لە مافی مرۆڤی کورد نەگیرێ. تا، ململانێی چەپەڵی ئایدۆلۆژیا و بەرژەوەندیی تەسکی پارتایەتیی گۆڕ نەکرێ. تا، برایەتی نێوان کورد ـ کورد، یەکێتیی ڕیزەکانی گەل، تەبایی نێوان هێزە ڕامیارییەکان و یەکسانیی کۆمەڵایەتیی، جێیان نەگرێتەوە و نەچەسپێ!

ئاخ! نیشتمانم، دەترسم بمرم، بە چاوی خۆم، « دیموکراسیی » ڕاستەقینە، لە « کوردستان »دا نەبینم! دەترسم، سەرکردەی ئەو دوو پارتە، جارێکی دیکە، خاکی پیرۆزی نیشتمانەکەم، لە خوێن هەڵکێشن! لە پێناوی بەرژەوەندیی تایبەتیی تاکەکەسیی، بنەماڵە و پارتەکانیاندا، ڕیسی گەلەکەمان بکەنەوە بە خوریی!

* * *

---

* حوسێن محەممەد عەزیز، ململانێی ئایدۆلۆژیی لە کوردستاندا، چاپی 1، چاپخانەی ئەزمر، سولەیمانی، 1993.

# هەژار و دەوڵەمەند

گومانی تێدا نییە، ئەوەتەی ئەم سەر زەوییە ئاوەدانبۆتەوە، ئەوەتەی توێژ و چینی کۆمەڵایەتیی جیاواز دروستبووە، هەژار و دەوڵەمەند هەر هەبووە، هەر هەیە و هەر دەشمێنێ. لەبەرئەوە، ئەندامانی هەموو گەل و نەتەوەیەک، لە ڕووی ئابووریی و باری ژیانەوە، وەک یەک ناژین، یەک ئاستی دیارییکراوی ئابووریی و ژیانیان نییە. واتە: هەموو کۆمەڵگەی مرۆ، لە دوو بەشی جیاواز، یا، لە دوو پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی جیاواز پێکهاتووە. بە کوردیی و بە کورتیی: بە هەژار و دەوڵەمەند ناسراون. دیارە، لە نێوان ئەم دوو پێکهاتە کۆمەڵایەتییەشدا، چەن جۆرە دەستە و توێژێکی دیکەی کۆمەڵایەتیی هەیە، لە ڕووی باری ئابووریی و ئاستی ژیانەوە، لە یەکدی جیاوازن.

هەڵبەتە، هەر فەلسەفەیەکی « ئایینیی، چینایەتیی، ڕامیاریی ... »، جۆرە لێکدانەوەیەکی تایبەتیی، بۆ ئەو دەرکەوتە گرنگە کۆمەڵایەتییە دەکەن.

شتێکی ئاشکرایە، لە هەموو کۆمەڵگەکانیشدا، هەمیشە، زۆرینە لە هەژار و کەمینەش لە دەوڵەمەند پێکهاتوون. کەچیی بە پێچەوانەوە، هەمیشە، کەمینە فرمانڕەوایی زۆرینەی کردووە و زۆرینەش، ملکەچی کەمینە بووە!

بۆ نموونە: ئایین پێی وایە: هەژار و دەوڵەمەند، هەر خوا دروستیکردوون، هەر دوو لایان دەبێ، بەو بەشەی خوا پێی داون، قایلبن و سوپاسیبکەن!

« ئەرستۆ » گوتوویەتی: ئەو جیاوازییەی لە نێوان هەژار و دەوڵەمەندا هەیە، لە ڕێککەوتەوە هاتووە.

« جان جاک ڕووسوو »، لە نێوەڕاستی چەرخی ڕاپەڕینی « ئەورووپا »دا، هۆی دەرکەوتەی جیاوازیی و نایەکسانیی کۆمەڵایەتیی، بۆ خراپیی دابەشکردنی سامان و دەسکەوت گێڕاوەتەوە!

دوای یەک سەدە، هەر دوو بیریار « مارکس » و « ئەنگێلز »، لە « مانفێستی کۆمۆنیست » و لە زنجیرەیە لە کارەکانیاندا، لێکدانەوەیەکی چوونیەکیان لەوەی « ڕۆسۆ » پێشکەشکردووە! «1»

بەڵام، لە ڕاستییدا، کێشەی نێوان هەژار و دەوڵەمەند، بە یەکێ لە کێشە هەرە گرنگ و گرانەکانی کۆمەڵگەی مرۆ دەژمێررێ. لەبەرئەوە، چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە، هەروا کارێکی ئاسان نەبووە و نییە.
ئەز پێم وایە: نە بە بەکارهێنانی توندوتیژیی و نە بە دەسبەسەراگرتنی دەسەلات چارەسەردەکرێ. بەڵکوو دەبێ، هەلی چوونیەک، لە بەردەم هەموو ئەندامەکانی کۆمەڵگەدا برەخسێنرێ، کۆمەڵگەیەکی ئازاد و سەربەخۆ دامەزرێنرێ. ئەوەش پتر بەوە دەبێ، بایەخێکی زۆر، بە پرۆسەی خوێندن و خوێندەواریی بدرێ، هەوڵبدرێ، گرفتی نەخوێندەواریی قەلاچۆکرێ، ڕۆشنبیرییەکی ڕاست و پێشکەوتوو، لە نێو ڕۆڵەکانی گەلدا بڵاوکرێتەوە، شۆڕشێکی ڕووناکبیریی، دژی زۆرداریی، خۆسەپاندن، دادۆشینی کۆمەڵایەتیی و ململانێی چینایەتیی بەرپاکرێ، وولاتەکە، لە رووە گرنگەکانی « کشتوکاڵ، بازرگانیی و پیشەسازیی »ەوە پێشخرێ، بە هیچ شێوەیە، جیاوازیی لە نێوان ڕۆڵەکانی گەلدا نەکرێ، هەموو کارێ، تەنیا هەر لە بەر ڕۆشنایی، بەهرە، لێهاتوویی، دەسرەنگینیی، پلەی خوێندن، بڕوانامە و تەرخانی تایبەتییدا، بە سەر ڕۆڵەکانی گەلدا دابەشکرێ، واتە: پرینسیپەکانی دیمۆکراسیی، لە شێوەی کارکردن و دابەشکردنی کاردا پیادەکرێ.
هەروەها، پرۆژە تایبەتیی و کەرتەکانی گشتیی هاندرێن، پتر ڕاژەی ئابووریی نیشتمانەکەیان بکەن، کاربەدەسانی میریی پێویستە، بەرنامەیەکی تایبەتیی دیارییکراویان هەبێ، جیاوازیی چینایەتیی، لە نێوان هەژار و دەوڵەمەندەکاندا، لە بیر و هۆشی ڕۆڵەکانی گەلدا بسڕنەوە. لە دەستووری هەمیشەیی دەوڵەتدا، بە ڕاشکاویی، دژایەتیی ئەو جیاوازییە بکەن.
بەڵام، گەر سەرنجێ لە کۆمەڵی کوردەواریی بدەین، ئەوا، زۆر بە ئاشکرا دەبینین: سەرانی کورد و ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتەکان، توێژاڵێکی دەوڵەمەند پێکدێنن، لەگەڵ ئەوەشدا، زۆربەی زۆری کۆمەڵانی خەڵک، لە چینی هەژار پێکهاتوون. ئەمە بۆ وابێ؟!! ئەو توێژاڵە مشەخۆرە، لە سەر حسێبی کێ، وا دەوڵەمەندبوون و هەڵاوساون؟!!
ئەز پێم وایە، زۆرداریی، چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتیی و چینایەتیی، گەلێ لە چەوساندنەوەی نەتەوایەتیی خراپتر، ناخۆشتر، پڕ لە ژان و ئازارترە. چونکە، لە لایەکەوە، دوژمنێکی بیانیی داگیرکەر، ڕۆڵەکانی نەتەوەکە دەچەوسێنێتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، جگە لە خۆفرۆشان، هەموو نیشتمانپەروەران دەگرێتەوە. لەبەرئەوە، دەرد و گرفتەکەی هەرچی چۆنێبێ، گرنگ نییە و ڕۆڵەکانی گەل، زۆر بایەخی پێ نادەن و مەراقی پێ ناخۆن. چونکە، وەک

عەرەب گوتوویەتی: لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵکیدا، جێژنە. «2» بـــەلام، چەوساندنەوەی کۆمەلایەتیی و چینایەتیی، گرفتێکی نێوخۆیی نەتەوەکەیە و زۆربەی کات، کۆمەڵێ هاوزمان و هاوخوێن ئەنجامیدەدەن، توێژاڵێ یا چینێکی هەژار دەچەوسێننەوە. لەبەرئەوە، ژان و ئازارەکانی، گەلێ زیاترە. هەڵبەتە، یەکێکی وەک « ئیمامی عەلی »ش، هەروا بە خۆڕایی نەیگوتووە: گەر هەژاریی پیاوێ بووایە، دەمکوشت! «3»

* * *

---

1. د. عبدالوهاب حميد رشيد، العراق المعاصر، السويد، 2001، ص 14-15.
2. الحشر مع الناس عيد.
3. لو كان الفقر رجلا، لقتلته.

# ناميلكه و پەرتووكە چاپكراوەكانی نووسەر

01. دەربارەی پرۆژەكەی يەكێتی نيشتمانيی كوردستان، چاپی1، سويد، 1994.
02. دوا پرۆژە، چ.1، سويد، 1994.
03. پێنج وتاری غەمگين، چ.1، سويد، 1994.
04. ديموكراسی، ئايدۆلۆژی و جەنگی نێوخۆ، چ.1، سويد، 1994.
05. ململانێی ئايدۆلۆژی لە كوردستاندا، چ.1، سولەيمانی 1993.
چ.2 ، سويد، 1995.
06. پێنج كاتژمێر لەگەڵ برايم ئەحمەددا، چ.1، سويد، 1995.
چ.2، سولەيمانيی 1996.
چ. 3، سولەيمانيی، 2002.
07. نامەيەكی درێژ بۆ نەوشيروان مستەفا، چ.1، سويد، 1995.
08. كورد و شۆڕش و هەلی مێژوويی، چ.1، سويد، 1996.
چ. 2، كوردستان، 2000.
09. فيدراليزم و دەوڵەتی فيدراڵ، چ.1، سويد، 1996.
چ.2، سولەيمانی، 1996.
چ.3، سولەيمانی، 2004.
10. بەڵێ لێكۆڵينەوە و رەخنە نەک شێواندنی راستيی، چ.1، سويد، 1996.
11. خولانەوە لە بازنەيەكی بۆشدا، چ1، سويد، 1997.
چ.2، سولەيمانيی، 2002.
12. رۆڵی سيستێمی بنەماڵە لە بزاڤی رزگاريخوازی نيشتمانيی كوردستاندا،
چ.1، سويد، 1997.
چ. 2، سولەيمانيی، 2001.
13. گيروگرفتە سەرەكييەكانی كورد، چ.1، سويد، 1998.
چ. 2، سولەيمانيی، 2000.
14. ئۆجەلان ئەزموونێكی نوێ و پەندی مێژوويی، چ.1، سويد، 1999.
چ.2، سولەيمانيی، 1999.
15. سەليقەی زمانەوانيی و گرفتەكانی زمانی كورديی، چ.1، سولەيمانيی، 1999.
چ.2، سولەيمانيی، 2005.
16. خلتەی بيرێكی ژاراويی، چ.1، سولەيمانيی، 2000.
17. مەسعوود محەمەد و دوو ديداری دۆستانە، چ.1، سولەيمانيی، 2002.
18. ديدی نەتەوەيی و نانەتەوەيی، چ.1، سولەيمانيی، 2002.
19. پەيمانێكی رەش و رۆژێكی سوور، چ.1، سولەيمانيی، 2003.